# دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی

نوسینی / لیژنەیەکی پسپۆڕ

وەرگێڕانی / جلال خلف ژاڵەیی

چاپی یەکەم

سلێمانی

٢٠٠٤ زاینی      ٢٧٠٤ کوردی

لەسەر ئەرکی ( یادگار محمد چروستانی ) چاپکراوە

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : دەرونزانی کۆمەلاّ یەتی

نوسینی : لیژ نەیەکی پسپۆڕ

وەرگێڕانی : جەلال خەڵەف ژاڵەیی

چاپ : چاپی یەکەم ( ٢٠٠٤ )

چاپخانەی : گەنج

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

**نرخی (٤٠٠٠) دینارە**

ژمارەی سپاردن: ( ٥٢٤ ) ی ساڵی ٢٠٠٤ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پیّ دراوە

بەناوی خواوەندی گەورەو میهرەبان

## پێشەکی وەرگێڕ

* خوێنەری هێژا...

ئەو دەقەی کە وەرمگێڕاوەتە سەر ئەم کتێبە، بریتییە لە پەرتوکێك، بە ناونیشانی (دەروونزانیی **کۆمەڵایەتیی**)، بە زمانی عەرەبی لەلایەن لیژنەیەك پسپۆڕەوە لە دەروونزانییدا لە زانکۆی سەلاحەدین، لە کۆتایی ساڵەکانی ١٩٨٠ دا بە گوێرەی پەیڕەوی دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی، بەشی کۆمەڵناسی دانراوە، لەسەر بوجەی کۆلیژی ئاداب بەشی کۆمەڵناسی زانکۆی ناوبراو لە نوسینگەی (الرواد للطباعة) لە بەغداد، بە جیهازی (رۆنیۆ) چاپکراوە.

زانکۆی سلێمانی، بەشی کۆمەڵناسی، ئەو کتێبەو چەند کتێبێکی دیکەی ساڵی ١٩٩٨، وەکو (سەرچاوە) بە دیاریی لە زانکۆی ناوبراوەوە بەدەست گەیشت.

**ئەو هۆیانەی کە هانیاندام ئەم کتێبە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، ئەمانەبوون:**

١) وانەی دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی وەکو بابەتێکی خوێندن لە بەشی کۆمەڵناسی، کۆلیژی زانستە مرۆییەکان، لە زانکۆی سلێمانی، لە ساڵی ١٩٩٩ وە، تا ئێستاش کە ساڵی خوێندنی(٢٠٠٣-٢٠٠٤)ە ، بە شانازییەوە من دەیڵێمەوە.

٢) لەکاتی وانەوتنەوەکاندا، خوێندکارەکان زۆرجار داوای روونکردنەوەو راڤەکردنی زاراوە قورسەکانیان بە زمانی کوردی لێدەکردم، منیش بۆم رووندەکردنەوە.

٣) لەلایەکی دیکەوە، بە رای من هەرچەند ئەم کتێبە بە زمانی عەرەبی بەناو جەماوەردا بلاونەکراوەتەوە" بەلام باشترین کتێبە لەم بابەتەدا، چونکە بابەتەکانی تێرو تەسەلن، گشتگیرو کۆگرو رێیزگرن. بەتایبەتی ئەو

نموونانەی کە نووسەرەکان لەسەر رووداوەکان و بابەتە زانستییەکان هێناویانەتەوە، زۆرینەیان لە ژینگەی خۆماندا، یان لە سنورەکانی ژینگەی خۆماندا روویانداوە.

## گیروگرفتەکان

بە رای من و زۆر لە کەسانی دیکەش، لە هێندێك زانستدا وەرگێران بگرە لە دانان قورسترە، لەبەرئەوەی پێویستدەکات لەسەر وەرگێر، هێندێکجار وابەستە بێت بە دەقەکانەوە، هەروەها بە جۆرو شێوازی دەربڕینەکانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا من هەوڵمداوە لەکاتی وەرگێڕانەکەدا، بابەتەکان لە قاڵبێکدا داڕێژم، بە گویرەی ئاستو تێگەیشتنی خوێنەر بێت.

سەرەڕای ئەوەی کە پەرتوکەکە لە عەرەبییەکەیدا، بە گوێرەی دەروازە دابەشنەکراوە، بەڵام من زانیارییەکانم رێکخستووە لە (٦) شەش دەروازەدا، دەروازەکانم دابەشکردووە بۆ چەند بەشێك، بۆ نموونە هەر یەك لە دەروازەی یەکەم و پێنجەم و شەشەمم کردۆتە دوو بەشەوە، بەڵام هەر یەك لە دەروازەی دووەم و سێیەم و چوارەمم کردۆتە سێ بەشەوە. پاشان، فەرهەنگۆکەیەکم بە لێکدانەوەی وشەو زاراوە کوردییە نوێ قورسەکان بە زمانی عەرەبی نووسیوە.

لە کۆتاییدا سوپاسی گەرمی ئەم بەڕێزانە دەکەم: کاکی کۆمپیوتەرزان عەبدولکەریم رەئوف، چونکە بە وردیی و دڵسۆزانە کاری کۆمپیوتەری ئەم کتێبەی راپەڕاند، خوا نموونەی زۆرکات.
هەروەها سوپاسی هەردوو خوێندکاری دێرینمان توانا خەسرەو ، توانا فەرەیدون دەکەم، کە نوسینەوەی چەند دەروازەیەکیان لەم کتێبە خستە سەر ئەستۆی خۆیان.

**جلال خلف ژاڵەیی**
کۆلیجی زانستە مرۆییەکان
زانکۆی سلێمانی

# پێشەکییەك

بە پێنوسی پسپۆڕانی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی

مرۆڤ بونەوەرێکە بەوە جیادەکرێتەوە، کە لە یەك کاتدا کۆمەڵایەتییەو رۆڵەی کۆمەڵیشە.

واتا هەوڵدەدات کە لەگەڵ خەڵکیدا بژیو لە هەمان کاتیشدا، سەر بە کۆمەڵێکیشەو دەشی گونجێنێتو چاودێری رەفتارەکانیشی دەکات، ئیدی پێیخۆشبێت، یان پێیناخۆشبێت.

مەبەستی دەروونزانیی کۆمەڵایەتییش ئەوەیە، لە بونەوەر بگاتو لە چۆنێتی کارتێکردنو کارلێکردنیشی لە کۆمەڵگەدا بگات.

کەواتە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی، لە لایەکەوە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی کارە دەرونییەکانی خەڵکی دەدات، لە لایەکیشەوە بە کارکەرو تینکەرە کۆمەڵایەتییەکان دەدات. واتای وایە دەروونزانیی کۆمەڵایەتی لەو مەودا هاوبەشەی کە دەکەوێتە نێوان دەروونزانییو کۆمەڵناسییەوە، کاردەکات، لەبەرئەوە پسپۆڕی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، هەوڵی شیتەڵو تێگەیشتنی پێکهاتە دەروونییەکانو روکارەکانو ئارەزووەکانی تاك دەدات. بۆئەوەی رادەی کارتێکردنی لە ژێری تاكو کەسێتیدا بزانێت.

ئەوکاتە لێکۆڵینەوەی بارەکانی کۆمەڵایەتییو شارستانیی بکات، بۆئەوەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیو سروشتیو بیروباوەڕیو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان بزانێت، ئەمیش بۆئەوەی رادەی دیاریکردنی وەرگرتنی تاکەکان دیاریبکات لە کارتێکردنو تینوەرگرتن لە رەفتاری کەسانی دیکەی ئەندامەکانی کۆمەڵو کۆمەڵگە.

بایەخدانی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی لەوەدا دەبێت کە ئەو رێگەیە بزانێت تاك دەیگرێت بۆ گونجاندن لەگەڵ رێسای کۆمەڵایەتیدا،

هەروەها چۆن لەگەڵ دەوروبەرە کۆمەڵایەتییەکەیدا دەگونجێت. واتای وایە مەودای پسپۆڕی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، لە دەروونزانیی ژێریدا کۆتایی نایەت، وەکو (تارد) دەڵێت. هەروەها جیاوازیشی هەیە لە کۆمەڵزانی، هەرچەندە ئەمەش لەگەڵ رای دۆرکایمدا[1] لە یەك هەڵدەبەزنەوە، چونکە دەروونزانیی کاری شیکردنەوەی دەروونی تاکە، بۆئەوەی ئەو کەلەبەرو ئارەزووانەی کە دەستەڵاتی بەسەر تاك و رەفتارەکانیدا گرتووە، بخاتەروو.

بەڵام بارە کۆمەڵایەتییەکان، یان ریزە کۆمەڵایەتییەکان، کەسی دەروونزان، بە مەرج و کارتێکەرە کۆمەڵایەتییەکانی دادەنێت، تەنها چاوێکی پێدادەخشێنێتو ئاگادارییەکی لێپەیدادەکات، بێ لەوەی بە بابەتێکی تایبەتی دابنێت بۆ لێکۆڵینەوەو شیتەڵکردن. بەڵام کۆمەڵزانی گرنگی بە تیرە یان بارەکۆمەڵایەتییەکان دەدات، بۆ ئەوەی لە رێگەیانەوە دروستگا کۆمەڵایەتییەکان بناسێتەوەو بزانێت گوزەرانی تاکەکان تێیاندا چۆنە.

هەروەها کۆمەڵناسی جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە، سیستمی ئابووریی و سیاسی، کاردانەوەی لەسەر ژینگەی پیشەیی و خێزانی تەواودەبێت، دوابەدوای ئەویش لەسەر گوزەرانی کۆمەڵایەتی تاکەکانیش دەبێت، هەرچەندە ئەم کارە لێرەدا دووبارە پەیوەندی هەیە بە چەند هاندەرێکی گشتییەوە، کە بەس نییە بۆ روونکردنەوەی هەڵوێستەکان و روکارەکان، رەفتارە جۆربەجۆرەکان. لەراستییدا ناتوانین بڵێین! ئەو ململانێیەی لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە لە نێوان دەروونزانەکان و کۆمەڵزانەکاندا بەرپابوو رۆیشتو نەما، لەگەڵ هەستکردنی هەردوولا،

---

[1] Jean Maisonneuve, Lapsychologie Social P.UFF. Pasis, 1964. P.6

بەوەی کە کەلێنێك لەنێوان هەردوو زانستەکەدا هەیە، ئەویش بە دیبەرێکی تایبەتی دادەنرێت، لە لێکۆڵینەوە دەروونیو کۆمەڵایەتییەکاندا.

تا ئێستا بە وردی مەودایەکی سنووردار بۆ دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، دانەرێژراوە، لەبەرئەوەی جاری وا هەیە دەڵێین! ئەو مەودایە پەیوەندی نێوان تاكو کۆمەڵە، دەمێك دەڵێن! لێکۆڵینەوەی پەیوەندی تاکەکانە لە چوارچێوەی کۆمەڵداو زانینی کارتێکردنی کۆمەڵ لە روکارەکانی تاکداو رەفتارەکانیدا، دەمێکی دیکە ئەو مەودایە بە لێکۆڵینەوەی رەفتاری کۆمەڵو بارەکانی کۆمەڵایەتی رەفتار دیاریدەکەن.

ئالێرەدا دەبینین پێناسەیەك نییە بۆ ئەم زانستە بایەخپێدانی لێکۆڵینەوەی دەرونیو کۆمەڵایەتی لەسەری رێکەوتبێتن. جاری وا هەیە چاودەبڕێتە تاك، جاری واش هەیە چاودەبڕێتە کۆمەڵ، هەرچەندە کارلەیەککردن هەیە لەنێوان ئەم مەودایانەدا. بەراستی بیروبۆچوونی جیاوازو ئەم دژوارییەی کە هێندێك جار لەنێوانیاندا هەیە، بوونەتە هۆی دەرکەوتنی چەند پێناسەیەکی جیاواز بۆ زانستەکە، بە دەروونزانیی تاکی دەستپێدەکاتو بە دەروونزانیی کۆمەڵ کۆتاییدێتو بە پێچەوانەشەوە، بە دەروونزانیی کۆمەڵ دەستپێدەکاتو بە تاکی کۆتایدێت، چونکە تاك بە رەفتارەکانییەوە ملشۆڕدەکات، بۆ ئەو کۆمەڵەی کە تێیدایەتی.

لێرەدا چەند تۆژیارێك هەن، وەکو (شەریف)و نیوکەمپ) کە پێکەوە پاساوی ئەم گیروگرفتەیان لە پەرتوکێکدا بەناوی (دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی لە فرەرێیاندا) کە لە ساڵی (١٩٥٠) دا بلاویانکردەوە (Social Psychology at the Cress road). ئەم دوو تۆژیارە، وای بۆ دەچن کە / پێویستە لەسەر ململانێی بیروباوەڕانە، جیاوازی

لەنێوان ئەم دوو رادەیەدا بکات، رادەی یەکەم پەیوەندی هەیە بە ئەنجامەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، رادەی دووەم لە تاکەوە، واتا / توخمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی[1].

لە ئاستی یەکەمدا، پێویستە بایەخبدرێت بە دیمەنی کۆمەڵەکان (مۆرڤۆلۆجی) رێکخستنیان و دەستگاکانیان و تەرزی نرخەکانیان، بە شێوەیەکی زنجیرەیی. ئەمە یەکێك لە بوارەکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی دادەنرێت، چونکە دەتوانرێت نیشانەی رواڵەتە کۆمەڵایەتییەکان بکرێنو پێوەنداریکرێن، بەبێ ئەوەی بەراوردبکرێن بە توخمە تاکییەکانەوە. بەلام لە ئاستی تاکەکاندا، لێرەدا چەند تەرزە رەفتارێکی کۆمەڵایەتی دژ بە یەك هەن، وەکو / لەیەکچون، گێڕ، زاڵ، شوێنکەوتن، گۆشەگیربوون.

ناتوانرێت ئەم کردارانەش شیبکرێنەوە، لە دوتوێی بەستنی بە هەندێك پاڵنەری دەروونییەوە نەبێت لەلایەکەوە، لە لایەکی دیکەوە لە رێگەی بەستنی بە هێندێك هەڵوێستو گوزەرانی کۆمەڵایەتییەوە نەبێت. ئا لەم ساتەوە، دەتوانرێت مەودای دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی دیاریبکرێت، لەڕووی ئەوەوە کە سیستمی تاکەو کارێکە لە رێگەی یەکخستندا، لەبەرئەوەی کە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی دەمێك پشت بە کارتێکەرە کۆمەڵایەتییەکان دەبەستێت، دەمێکی دیکەش پشت بە کارتێکەرە دەروونییەکان دەبەستێت.

پێویستە لەم مەودایەدا، ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، ئەگەر بە تەواوەتی لە دژواریی روکەشی نێوان تاكو کۆمەڵدا، تیپەڕین (لەگەڵ پێشخستنی یەکێکیان)، ئەم لێکۆڵینەوەیە لە مەودای دەروونزانیی

---

(1) Jean Maisonneuve, op. cit. P.7

رودانی راستیدا دەمێنێتەوە، ئەگەر گەلاڵەی رەفتاری تاکی بە چەند کارێکی کۆمەڵایەتی شارستانی دیاریبکرێت، ئەو کاتە پێویستە کارایی دەروونی کاریگەر لە نێوان کارا کۆمەڵایەتیی و بابەتییەکان و لەنێوان رەفتاری تاکدا هەبێت.

ئەگەر رەفتاری وەك یەکی بەستراو بە ناوی کۆمەڵایەتییەوە، دەبینین وەك یەك بوونەکە بە شێوەیەکی ئالی تەواو نابێت، بەڵکو لە دوتوێی ئەو واتایەی کە وەریدەگرێت تەواودەبێت. ئەم واتایەش واتا: وروژێنی ناوەکی، لەسەر پەیوەندی بوون و یەکبوون، بە شوێنی پەیوەندی بابەتەکەو گرنگییەکەیدا دیاریدەکرێت. جاری وا هەیە پاڵنەرەکە سووربوونە لەسەر هەرەوەزیو هاوکاری کۆمەڵایەتی، جاری واش هەیە ترسە لە دەرکەوتن لە شێوەی نامۆییدا، یان ناسینەوەیە، یان پێزانینە، یان گاڵتەجارییە.

لەنێو ئەم چوارچێوەدا دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، بە دەروونزانییەکی رووت دەمێنێتەوە، پێچەوانەوەی ئەم کارکەرە دەروونییانە، ملکەچدەبن بۆ چەند کارێك و ورياکەرەوەيکی کۆمەڵایەتی. ئەگەر نموونەی پێشو وەرگرین، ئەبینین ناتوانین گێڕی یان چەوتی پێناسەبکەین لە دوتوێی رێسا کۆمەڵایەتییە هاوبەشەکاندا نەبێت، جاری واش هەیە چاو دەخشێنرێتەوە بە بارو رێسا کۆمەڵایەتییەکانداو راستی دەکرێنەوە یان دەگۆڕدرێن. بەمجۆرە دەبینین کۆمەڵگە تەنها تاکە یاخیبووەکانی کاری هاندەری تاکی ناگرێتە خۆی، بەڵکو گرنگێتی بە کەسانێك دەدات، کە سوورن لەسەر گۆڕینی بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی.

بەم واتایە دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، بەرگێکی کۆمەڵایەتی بەسەر ئەو رواڵەتانەدا دەدات، کە گرنگییان پێدەدات، هێندێك لە لێکۆڵەرەوەکان، وەکو / جان ستوتزل فەرەنسی، لە دانراوەکەیدا

(دەروونزانیی کۆمەڵایەتی)، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەم زانستە بەستراویشە بە مرۆزانی شارستانییەوە، واتا!

دەتوانرێت، دەروونزانیی کۆمەڵایەتی بە (کرداری شارستانی – Fait Cultural ) دابنرێت. هەروەها دەبەسترێت بە سروشتەکانی فەلسەفەی کۆنەوە، هەرچەندە ئێستاکێ بە کانگایەك، یان سروشتێکی ئەمریکایی دادەنرێت. ئەم زانایە، بەهۆی زانستی مرۆیی شارستانییەوە توانیویێتی جیاوازییە شاریتانییەکان لەنێوان کۆمەڵگا جۆربەجۆرەکاندا بدۆزێتەوە، یان روویان لەسەر هەڵماڵێت.

لەبەرئەوە ئەم لایەنە، وا دادەنرێت کاریگەریی هەیە لە رەفتاری مرۆڤایەتیداو لە پەیوەندی کۆمەڵایەتییدا. ئەتوانین پێناسەیەکی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی کاکڵەبکەین و بڵێین: دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، ئەو زانستەیە کە لە رەفتاری مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، بەو شێوەی یان بەو چەشنەی کە لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتیو شارستانییەکاندا یەکیگرتووە، واتا بابەتی ئەم زانستە لێکۆڵەرەوەی رەفتاری تاکەکانە، لەژێر کاردانەوەی وریاکەرەوە دەروونییەکان و کۆمەڵایەتییەکاندا، بە شێوەیەکی زانستی.

# پێرست

# دەروازەی یەکەم

## بەشی یەکەم

# پەرەسەندنی مێژوویی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی

- ☐ ئەفلاتۆن
- ☐ ئەرستۆ
- ☐ ئیبن خەلدون
- ☐ تۆماس هۆبس
- ☐ جان جاك رۆسۆ
- ☐ تشارلز داروین
- ☐ فۆریە
- ☐ ئۆگست کۆمت
- ☐ گۆستاف لۆبۆن
- ☐ لیستەر وارد
- ☐ ئالتون مایو

# دەروازەی یەکەم

## بەشی یەکەم

## ﴿ پەرەسەندنی مێژوویی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی ﴾

دەروونزانیی کۆمەڵایەتی وەکو هەموو زانستە مرۆڤایەتییەکانی دیکە نەوەی فەلسەفەیە، واتا سەرەتاکانی لەگەڵ دەستپێکردنی هەوڵە فەلسەفییەکاندا دەستپێدەکات بۆ تێگەیشتنی سروشتی مرۆڤو دەوروبەرە کۆمەڵایەتییەکەی، ئازایی ئەم پەرەسەندنەش بۆ (ئەفلاتۆن و ئەرستۆ) دەگەڕێتەوە، هەرچەندە سیفەتێکی زانستییانەی وەرنەگرت و بەکارهێنانی بڵاوبوونەوەی دوای جەنگی جیهانی دووەم نەبێت.

**ئەفلاتون**[1] :

هەوڵی ئەوەیدا رێگەو هۆکارێك پەیدابکات بۆ بەربەستکردنی روونەدانی گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوەش لە نوسینەوەکانیدا دەردەکەون لە (کۆمارەکەیدا)، (یاساکان) کە بۆچوونی نموونەیی بەشێوەیەکی ئاشکرا لەخۆگرتبوو، لە یەکەمیاندا نموونەی کۆمەڵگایەکی دەرخستبوو کە لەسەر بنەما دەروونییەکان راوەستابوو، ئەفلاتۆن لە مرۆڤدا ئەوەی بەدیدەکرد کە دەروونزانیی کۆمەڵایەتی هاوچەرخ، وەك هاندەرە سەرەکییەکانی رەفتاری مرۆڤ، بەدییاندەکات خاڵی دەستپێکردنی بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی لای ئەفلاتون گریمانە دەروونیەکەیەتی کە پشت بە شیکارکردنی ئارەزوو[2] لەگەڵ وورژێنەرە ناوەکییەکان دەبەستێتو دەڵێت کە دەروون سێ هێزی بنچینەیی هەیە:

---

[1] ئەفلاتون: فەیلەسوفێکی یۆنانییە، لە ساڵانی (٤٢٨)ی پێش زایین، تا ساڵی (٣٤٧) پێش زایین ژیاوە، قوتابی سوقرات بووە. - و -

[2] Sachdeva Vida Bushan, An Introduction to Sociology Kitab mahal, auad, 1979. P.5.

١- دەروونیی ئارەزووومەندی / ئارەزووکردنی مرۆڤ بۆ هەستپێکراوەکان، لە بەشی خوارەوەی جەستەدا جێگربووە.
٢- دەروونیی تووڕەبوون/ واتە ئارەزووکردنی مرۆڤ بۆ سۆزداریو مەڵبەندەکەشی (دڵە).
٣- دەروونیی ژیری / واتە ئارەزووکردنی مرۆڤ بۆ دانایی کە مەڵبەندەکەشی (سەرە).

لەم سێ هێزەشدا سێ ئاکاری بەرز دەردەکەوێت کە ئەوانیش پاکیزەییو ئازایەتیو ژیرین، لە هاوسەنگی هەرسێکیاندا دادپەروەری هەڵدەقوڵێت. (سەر) بیردەکاتەوەو (دڵ)یش ئەخرۆشێو (بەشەکانی خوارەوە)ش جێبەجێیدەکەن.

ئەفلاتون ئەم دابەشکردنەی بەسەر کۆمەڵگەدا لە کۆمارە نموونەییەکەیدا چەسپاندووە کە بە بۆچوونی ئەو کۆمەڵ لە سێ چین پێکهاتووە.

١- چینی گشتی کە بەرامبەر بە دەروونی (ئارەزوومەندی) دەکات.
٢- چینی سەربازان کە بەرامبەر بە دەروونی (تووڕە) دەکات.
٣- چینی فەرمانڕەواکان کە بەرامبەر بە دەروونی (ژیری) دەکات.

بەپێی بۆچوونی ئەفلاتون دەتوانین توانستەکانی مرۆڤ بە ڕێگەی پەروەردەو تاقیکردنەوە لە تەمەنە جیاوازەکانی مرۆڤدا بناسینەوە. بە جۆرێکی وەها پۆلێنیانکەین، کە یارمەتی کەسە توانا هەڵکەوتووەکانبدات، بۆ گەیشتن بە پلە باڵاکانی کۆمەڵ. بەڵام کەم تواناکان لە پلەی نزمتردا دادەنرێن بەگوێرەی پێشکەوتنو دواکەوتنی تاکەکانی کۆمەڵ، دەتوانین ریزیانکەینو بیانخەینە دەستگا پەروەردەییە تایبەتییەکانی، هەر چینێك لە چینەکانی کۆمەڵ. خاوەن

توانستە باڵاکان دەگرن بە پلەی کارگێڕان، فەیلەسوفەکان، ئەوانەی لە خواری ئەوانەوەن دەبنە سەربازو بەرگری لە کۆمارەکە دەکەن.

بەڵام ئەوانەی نەیانتوانی قۆناغە سەرەتاییەکان ببڕن لە ریزی چینە گشتییەکاندا، ریزدەکرێن. دابەشکردنی کار بەم شێوەیە دەبێتە بەربەست لەبەردەم ئەو ململانێیە، کە هۆکارەکەی دانەنانی تاکەکانە لە شوێنی شیاوی خۆیان لە کۆمەڵگەدا. ئەمەش دەبێتە یارمەتیدەر لەسەر رێکخستنی پەیوەندییەکانیان لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگەدا، ئەفلاتون لەو باوەڕەدایە کە ملکەچپێکردنی فەرمانڕەواکان بۆ پەروەردەکردنی تایبەت گرنگ‌و پێویستە، هێندێك مەرج بەسەر ئەوان‌و چینی سەربازەکاندا دەسەپێنێت، وەکو ژن نەخواستن، ماڵ‌و موڵك نەکڕین، ئەمەش بۆ ئەوەی دووربن لە کاروباری تایبەتییەوە، دووربن لە چاوچنۆکی، چونکە ئەم دوو سیفەتە ئەبنە تەگەرە لەڕێگەی بەجێهێنانی پێویستییەکانی سەرشان بەشێوەیەکی راستی لە کۆمەڵگەو لە پاراستنی کۆماردا.

ئەفلاتون جەخت لەسەر فێرکردن دەکاتەوە، فێرکردنی منداڵ لە تەمەنی (٧) هەتا تەمەنی (١٤) ساڵی بەپێویست دادەنێت‌و پاشان پێویستە تاقیبکرێنەوە، ئەوەی شکست بهێنێت ئەوا لە ریزی چینی گشتیدا دادەنرێت، بەڵام ئەوەی سەربکەوێت ملکەچی پەروەردەکردن دەکرێت بۆ ماوەی حەوت ساڵی دیکە، جێبەجێکردنی تاقیکردنەوەیەکی نوێی دیکە لە تەمەنی (٢١) ساڵیدا ئەوەی شکستبهێنێت‌و دەرنەچێت لە چینی سەربازەکاندا دادەنرێت، بەڵام دەرچووەکان بە راهێنانێکی دیکە ئامادەدەکرێن تا تەمەنی (٣٥) ساڵی، بۆ ئەوەی ببنە شیاوی فەرمانڕەوایی کۆمارەکە. نموونەییەکە، ئەوەش

پاش تێپەڕبوونیان بە چەندین گەشتو هەوڵداندا کە بە هۆیەوە گەلان بناسنەوە.

ئەم ئەزموونەشیان بۆ ماوەی (١٥) ساڵ بەردەوام دەبێت، بەم شێوەیە ئەم تێڕامانە فەلسەفییە، کە دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی دوور کە لە دوو بیرۆکەدا هاتووە:

یەکەم / ئامادەگییە دەروونییەکان: ئەمەش دەزگا کۆمەڵایەتییەکان دیاریدەکەن.

دووەم / کارتێکردنی ژینگەو هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان لە بەختیاری تاکەکاندا.

بیرۆکەی یەکەم هەوڵدەدات بە کورتی راڤەی رێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان و گەشەو پەرەسەندنیان بکات، لە رێگەی ئامادەگییە تاکیەکانەوە، یان ئەوەی ناونراوە (سروشتی مرۆیی).

بەڵام بیرۆکەی دووەم جەخت لەسەر کارتێکردنی بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان دەکات لەسەر بەختیاری تاکەکان. لەبەرئەمەشە ئەفلاتون جەخت لەسەر رۆڵی پەروەردەو یاسا دارێژراوەکان دەکاتەوە.

**ئەرستۆ**[١] – Aristoto (٣٨٤ – ٣٢٢) **پ.ز**

هەوڵیداوە لە ئەفلاتون زیاتر راستیتربێت، لە دانراوەکانیدا بەشێکی گەورەی تەرخانکردووە بۆ لێکۆڵینەوە لە راستییە کۆمەڵایەتییەکان. کاتێك هەوڵی چاککردنی فەرمانپێکراوەکانیدا پێش

(١) ئەرەستو: لە شاری ئەستاگیرا لە هەرێمی مەکدۆنیا لەدایکبووە، باوکی پزیشکی شا فلیب بووە، ئەمیش پەروەردیاری ئەسکەندەری کوڕی شا بووە، کاتێك کە ئەسکەندەر بووە پادشای یۆنان، لە رێگەی راوێژکارەکانیەوە ئەرەستو رەخنەی زۆری لێدەگرت، ئەگەر بە جەنگی رۆژهەڵاتەوە خەریك نەبوایە لەسێدارەی دەدا. — و –

فەرمانڕەواكان، مرۆڤی وا داناوە كە بوونەوەرێكی بایۆلۆجییە، دەتوانێت لە رێگەی لێكۆڵینەوەوە لە ئامادەگییە فیسیۆلۆجیە بۆماوەییەكانەوە سروشتەكەی دیاریبكات كە دەبێتە هۆی دروستبوونی رەفتاری كۆیی، ئەرستۆ جەختی لەسەر گرنگی دەوڵەت و كۆمەڵگە لەلایەك و كۆمەڵ وەك خێزان لەلایەكی دیكەوە كردۆتەوە.

لە كتێبی (رەوشت)دا ئەرستۆ هەوڵیداوە ئەوە روونبكاتەوە كەهاوكاری و پێكەوە گونجاندنی تاكەكان دەوەستێتە سەر رادەی رێكەوتنیان لە روكارو بۆچوونە رەفتارەكانیاندا. ئەرستۆ كۆمەڵگەی كردووە بە دوو بەشەوە (شارستانی و بەربەریی)(*) باوەڕی وایە كە ئاوو هەوا كاریگەرییان لەسەر دەروونی كۆمەڵگە هەیە.

دەتوانین بڵێین كە فەیلەسوفە عەرەبەكانیش وەكو فارابی و ئیبن خەلدون، كاردانەوەیان هەبووە لە لێكۆڵینەوە دەروونییە كۆمەڵایەتییەكاندا، فارابی دەڵێت / هەست بە كۆمەڵبوونی مرۆڤ سروشتی نییە، بەڵكو بەدەستهێنراوەو جەختی لەسەر فەرمانڕەواكان دەكردەوە چونكە بیری فەلسەفەی گریكی كاریتێكردبوو، هەروەها چەند مەرجێكی بۆ هەڵبژاردنی فەرمانڕەواكان دانابوو، وەك (لەشساغی، زۆر زیرەكی، بەهێزی، رەفتاری ئاسایی، روخۆشی، بەتوانایی، بۆ دابینكردنی ئارەزووە دەروونییەكانی وەك (تووڕەیی و هەڵچوون)، هەروەكو چۆن جەختی لەسەر لایەنی سایكۆلۆجی كۆمەڵایەتی دەكردەوە. وای دەبینی كە پێویستە فەرمانڕەوا لەژێر سیبەری چاودێرییەكی كۆمەڵایەتی باشدا پەروەردە بكرێت، بۆ ئەوەی رەفتارێكی سەركەوتووی بۆ فەراهەم بكرێت.

---

(*) مەبەستی لە (بەربەریی)، دەشتەكییە.

## ئیبن خەلدون (١٣٢٢ - ١٤٠٦) ز:

ئـیبن خەلـدون نـازێکی زۆر گـەورەی بەسـەر لێکۆڵینـەوە دەروونزانییـە کۆمەڵایەتییەکانـەوە هەیـە، چـونکە روونیکردۆتـەوە کـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی دیاردەیـەکی سروشـتییە، بـەڵام ژیـانی کۆمەڵایـەتی لەبـەر رۆشـنایی کارتێکـەرە جوگرافیـو سروشـتییەکان دیاریـدەکرێت، هـەروەکو چـۆن کاریگەرییـە دەروونییـەکانو ئابوورییـەکانی لـە ژیـانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا روونکردۆتەوە.

هـەروەها ئـیبن خەلـدون ئـەوە دووبـارە دەکاتـەوە کـە مـرۆڤ تاکـە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە کە پێویستی بە دەستەڵاتێك هەیـە، چـونکە نـەبوونی دەسـەڵات دەبێتـە هـۆی زاڵبـوونی پاڵنـەرە سروشـتییە خراپـەکانی بەسـەر هانـدەرە باشـەکانیدا، دەسـتەڵاتیش تـەنها پشـت بـە هێـزو جوامێریـو یـەکبوونی کۆمەڵایـەتی دەبەسـتێت، (دەمـارگیری هۆزگەری).[1]

ئـیبن خەلـدون کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی چـواندووە بـە مـرۆڤ لـە پەرەسندنو گەشەکردندا، چونکە وتوویـەتی کۆمـەڵ بـە گـوێرەی تـەمەن بە سێ قۆناغدا تێدەپەڕێت:

١- قۆنـاغی گەشـەکردنو دروسـتبوون: کـە ناشارسـتانیو زبرێتـی بەسەردا زاڵە، دەسەڵات تێیدا زیاتر مەڵبەندییە.

٢- قۆنـاغی گـەیینو کـامڵی: کاتێـك کـە پلـەو پایـەی دەسـەڵاتو سەرۆکایەتی تێیدا دەچەسپێت.

---

(١) Gastorv Bouthoul, histoire de la Sociologir, P.U.F Paris, France, 1961, P. 22.

٣- قۆناغی پیریو پەککەوتەیی: لەم قۆناغەدا کۆمەڵگە لە پەیوەستی ناوخۆدا، لە بەرهەڵستیو رووبوونەوەی مەترسییەکاندا لاوازە هەروەها نیشانەکانو ئارەزووەکانو ئامادەگییە سروشتییەکانو توانستی تاکەکان لە کاریگەریو کارلێککردن لەسەر ژینگەو ژیانی کۆمەڵ بەردەوامبوون.

گرنگی ئەم باسە بەڕوونیو ئاشکرا، بە درێژایی وەچە (نەوە)و بە تێپەڕبوونی چاخەکان هەر مایەوە تا سەردەمی راپەڕین، لە سەردەمی راپەڕیندا، بۆ جارێکی دیکە دەستپێکردەوە.

## تۆماس هۆبز[1] (١٥٨٨ – ١٦٧٩ ز):

هۆبز وەسفی ژیانی مرۆڤایەتی لە بارودۆخە سروشتییەکەیدا دەکات، واتا: ژیانی تاك لە دەرەوەی کۆمەڵگەدا بە شێوەیەکی گۆشەگیرو خۆپەرستو دڕندانەو خاوەن چەند پاڵنەرێکی دیاریکراو دیاریدەکات، وەکو پاڵنەرەکانی (برسێتیو تینوویەتیو رەگەزیو خۆپەرستیو شکۆمەندیو گەڕان بەدوای کامەرانیو خۆشگوزەرانیو خۆبەدوورگرتن لە ئازار.

بەڵام بەگوێرەی بیروبۆچوونی تۆماس هۆبز تەنها کۆمەڵگە کۆنترۆڵی ئەو پاڵنەرانەدەکاتو ئاڕاستەیان دەکاتو رێکیاندەخات، ئەوەش لە پێناوی پارێزگاریکردن لە (ئاشتیو ژیانی کۆمەڵایەتی).

لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی وانییە کە کۆمەڵگە، سروشتی ئادەمیزاد دیاریدەکاتو دەیسەپێنی بەسەریدا.لەبەرئەوەی بە ڕای ئەو سروشتی

---

(١) تۆماس هۆبز(Hobbes, Tomas): کاتێك لە دایکبووە نۆ مانگو نۆ رۆژەی تەواوەنەکردووە، هەموو جارێك دەیووت منو ترس هەردووکمان دوانەین. بەلایەوە وایە ترس لە مردنو، پێویستی بۆ ئاسایش هەردووکیان بنەمای دەروونیی تاکو بنەمای شارستانین. – و –

مرۆڤایەتی ئارەزووی ململانێو ناکۆکیو دووبەرەکیدەکات، دەروونزانیی بەلای (هۆبز)ەوە بریتییە لە شیکاری ئارەزووە دەرونییەکانو پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان.

کۆمەڵ شتێکی سروشتی نییە، بەڵکو بوونی پێویستەو لە ئەنجامی گرێدانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی گەشەدەکات.

## جان جاك رۆسۆ[٢] (١٧١٢ - ١٧٧٨)ز:

ئەمیش دووبارە گرنگیداوە بە لێکۆڵینەوەی باری سروشتی مرۆڤ، بەڵام ئەو تاك بە چاكیو لەخۆبوردوویی (نكران الذات) باسدەكات، باوەڕیوایە کە شارستانێتی سروشتی مرۆڤی گۆڕیوەو تێکیداوە، چونکە مرۆڤ بە هیچ شێوەیەك هیواو ئارەزوویەکی دیاریکراوی نییە لە دەرەوەی کۆمەڵدا. تەنانەت ئەو چاکانەیشی کە بە هەستێکی سروشتی داینـاوە، پێویستی بە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی هەیە، بۆ ئەوەی گەشەبکاتو پەرەبسێنێت.

تاك کاتێك دەگۆڕێت کە کۆمەڵ گەشەدەکات، لەبەرئەوەی کۆمەڵ پێویستی بە تایبەتمەندی نوێ هەیە، نەك سەرەتاییەکان، بۆ نموونە / پەیوەندییە خێزانییەکان گەشەناکات لەناو خێزاندا نەبێتچونکە خێزان دامەزراوەیەکی سروشتی نییە، بەڵکو کۆمەڵایەتییە، هەروەها موڵکداریێتی دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی بەربرەکانیو پێکدادانی بەرژەوەندییەکان. مرۆڤی کۆمەڵایەتی بەگوێرەی بیروبۆچوونی کەسانیدی کاریتێدەکرێتو رەفتاردەکات، لەبەرئەوەی

(٢) جان جاك رۆسۆ: زانایەکی فەرەنسییە، ئەندامی بزووتنەوەی روناککەرەوەی فەرەنسییە، دامەزرێنەری بنچینەی پەروەردەو فێرکردنە، یەکێکە لە رێخۆشکەرەکانی شۆڕشی مرۆڤایەتی فەرەنسی، یەکێك لە وتە بەنرخەکانی ئەوەیە، کە هەر شتێك لە سروشتدا دەستی مرۆڤی لێکەوت خراپ دەبێت. و -

خۆی لە چاوی خەڵکیدا دەبینێتەوە. بەم کارە ئەوە روودەدات کە ئەوا ئـەمرۆ پێیـدەوترێت رۆڵـو پلـەی کۆمەڵایـەتی، لـە دەروونزانیـی کۆمەڵایەتیدا، هەروەها لە پەرەسندنی ئەم زانستەدا چاکە دەگەڕێتەوە بۆ:

## چارلز داروین: (١٨٠٩ – ١٨٨٢)ز:

داروین لـە دانـراوە بەناوبانگەکەیدا (بنـەڕەتی جۆرەکـان) سـاڵی (١٨٥٩)ز تیـۆرە ناسـراوەکەی بـە نـاوی (گەشـەکردنو پەرەسـەندن) بڵاوکـردەوە، ئـەوەی کـە پـاڵی بـە زۆر زانـاوە نـاوە وەك (گـاڵتون)[1] کـە هەستێت بە لێکۆڵینەوەی کاریگەرییە بۆماوەییەکانو جیاوازییە ژیرییو دەروونییـەکان، لـە نێـوان تاکەکانـدا، ئـەم تیـۆرە کاریکردۆتـە سـەر لێکۆڵینەوەکانی (تـایلر)[2]یـش کـە وای دەبینێـت:- ئـایین پەرەیسەندووە تـا گەیشـتۆتە ئـەم قۆناغـەی ئێسـتای، واتـا مـرۆڤ لەپێشـدا دەسـتیکردووە بـە پەرسـتنی رۆحو هێـزە شـاراوەکان، پاشـان دەسـتیکردووە بـە پەرسـتنی خواوەندە جیاجیاکان، کە (خێرو قین –بوغز-) یان بۆ دەگەڕێتەوە.

---

(١) فەرەنسیس گاڵتون – Galton, Francis – (١٨٢٢ – ١٩١١٩): ژیانی بە خوێندنی جوگرافیاو دەیدەوانی دەستپێکرد، دوای ئەوە کۆڕی لێکۆڵینەوەی توانستەکانو پێوانەکانی جیاوازی تاکەکان، ساڵی ١٨٦٩ کتێبێکی بڵاووکردەوە بە ناونیشانی (بلیمەتی بۆماوەیی)، یەکەم کەسبو زانستی رەسەنچاکی (علم تحسین النسل)ی داهێنا. –و-.

(٢) ئەدوارد تایلر – Tylor (١٨٣٢ – ١٩١٧): زانایەکی ئەنثرۆپۆلۆجی ئینگلستانییە، هەموو ژیانی تەرخانکردبوو بۆ لێکۆڵینەوەکانی شارستانی، کە بەلای ئەوەوە هەموو بیروباوەڕو نەریتو زانستو هونەرو ئاینو یاساو رەوشتو هەموو کارامەییەکان دەگرێتەوە.

پاشان فکری مرۆڤایەتی پێشکەوت، تا وایلیهات باوەڕبکات بە خواوەندی تاك، هەروەها هەمان بارودۆخ بەلایەن (مۆرگان)[٣]ەوە کە وادەزانێ ژیانی ئابووریش ملکەچبووە بۆ یاسای پەرەپێدان، وەك: لە قۆناغی راوکردنەوە بۆ قۆناغی شوانیو پاشان بۆ کشتوکاڵی پەرەیسەندووە.[٤]

هەروەها زانا فەرەنسییەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا بەشدارییانکردووە لە پەرەپێدانی دەروونزانیی کۆمەڵایەتیدا، مەبەستیان ئەوەبووە کە ئایا چۆن ئاڕاستەی رەوشتی تاك دەکرێت لەلایەن کۆمەڵەوەو چۆنێتی کاریگەری تاکەکان لەسەر یەکتری، بەڵام:-

**سۆشیالیستخوازی نموونەیی فوریە** (Faurior) (١٧٩٢-١٨٣٧):

بە ڕێخۆشکەری دەرکەوتنی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی دادەنرێت، چونکە لە کۆمەڵگە نموونەییەکەیدا باسی حەزو ئارەزووە تاکییە ناوەکییەکان دەکات.

١- هەوڵیداوە ئارەزووە تاکییەکان شیکار بکات بۆ ئەوەی لە سروشتی مرۆڤایەتی تێبگات.

٢- هەروەکو چۆن هەوڵیداوە پەیوەندی نێوان سروشتی مرۆڤایەتیو بینای کۆمەڵایەتی پێکەوە ببەستێ.

٣- باوەڕی وایە کە بەختیاریو کامەرانی بە دەستناهێنرێ، تا ستەمو زۆری کۆمەڵایەتی بمێنێت.

(٣) پارێزەرێکی ئەمریکییەو زانایەکی ئەنثرۆپۆلۆجییە، لە نێوان ساڵانی (١٨١٨ – ١٨٥٧) دا ژیاوە، ساڵی ١٨٥١ پەرتوکێکی لەبارەی هۆزی (ئارکیوس) بڵاوکردەوە، ساڵی ١٨٧٧ کتێبێکیان بەناونیشانی (کۆمەڵگەی کۆن) بۆ بڵاوکردەوە.

(4) Schdeva Vidya Ehushan, P. Cit, P.6.

٤- پێیوایە شۆڕش تەنها لایەنی مادی ناگرێتەوە، بەڵکو پێویستە لایەنی مەعنەویو بژێویو دەروونیش بۆ خەڵکی دابینبکات.

هەروەها فۆرێی باسی رێکخستنی کاریکردووەو داوای جێبەجێکردنی دادپەروەرییو یەکسانی کۆمەڵایەتی لەنێوان ژنو پیاودا کردووە.

**ئۆگست کۆمت**[1] (Auguste Comte) (**١٧٩٨-١٨٥٧**)**ز**:

باوەڕی وایە دژایەتی هەیە لەنێوان کۆمەڵناسیو دەرونزانیداو دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کۆمەلناسی دەمانگەیەنێتە ئەو رواڵەتە تایبەتییانەی، کە جیاوازییان هەیە لە رواڵەتەکانی دەرونزانیی تاکی (فردی). هەروەها (ئەمیل دورکهایم)یش هەمان بیروڕای ئۆگست کۆمتی هەیە کە لە ساڵی (١٨٥٨-١٩١٧)ز ژیاوە.

**جابریل تارد**[2]:

بەربرەکانی لەنێوان تاردو دوو زاناکەی دیدا بەهێزبووە، هەندێ دەڵێن تارد ئینکاری کۆمەڵو رواڵەتەکانی کۆمەڵو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی نەکردووە، بەڵکو بیروڕای وایە کە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵ پشت بە دوو رواڵەتی دەروونی بنچینەیی دەبەستێت، ئەوانیش:

١- چاولێکەری ٢- داهێنانە

ئەو رواڵەتانە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی راڤەدەکەن و لێکیدەدەنەوەو هەندێ جار رواڵەتەکان کەسین، بەڵام زۆرجار جەماوەر دەیکات.

**گۆستاف لۆبۆن**:

(١) زانایەکی فەرەنسییە، لەنێوان ساڵانی (١٨١٧ – ١٨٢٣) لەگەڵ سان سیمۆندا کاریاندەکرد. یەکەم دامەزرێنەری کۆمەڵزانییە، دەروونزانی لە ریزی ژیانزانیدا (علم الحياة) ریزکردووە، بەلایەوە وایە ملکەچکردن بۆ رووداوەکانی سروشت خۆپەرستی کەمدەکاتەوە. – و –

(٢) جبرائیل تارد (Gabriel, Tarde) (١٨٤٣-١٩٠٤): دادوەرێکی فەرەنسی بوو، پسپۆڕ بوو لە کۆمەڵناسیو تاوانزانیدا. کتێبی زۆرن، گرنگترینیان (یاساکانی سنور)و (یاسا کۆمەڵایەتییەکان)ە.

(دەرونزانیی کۆمەڵەکان) لە لای گۆستاف لۆبۆن دەرکەوت، کە ئەم زانایە (سروشو نواندنی مۆگناتیسی) کاری لە لێکۆڵینەوەکانی دەکردو هەوڵیدەدا وشەی سروش وەك زاراوەیەکی بنەڕەتی بۆ لێکدانەوەی چۆنێتی کاریگەری کۆمەڵەکان لەسەر رەفتارو رەوشتی ئەندامەکانی بەکاربهێنێت. (سروش) بریتییە لە ئەمرێك یان لە فرمانێك کە بە کەسێك دەوترێ، بەڵام وشەی تێدابەکارناهێنرێت، واتا شێوە هەڵوێستو جوڵەیەکە، یان هێمایەکە، کە بەرامبەرەکەتی پێتێدەگەیەنیت.

پاشان زانا ئەڵمانییەکان لێکۆڵینەوەی تاقیکاری ئەزموونییان لەو بوارەدا جێبەجێکرد. (مۆد) بە یکەم کەس دادەنرێت کە تاقیکردنەوەی وردی بۆ لێکۆڵینەوەی کاریگەری ململانێو پیشبڕکێ لە رەفتاری تاکەکاندا دەرکرد، بەڕاستی دەرکەوتنی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی ئەمریکی سەرەتای سەربەخۆبوونی ئەم زانستە بوو. بێگومان دوو شەپۆلی تێدا ئاشکرابوو، کە راوبۆچوونەکانی پێشووی فەیلەسوفەکانیان دەنواند، یەکەمیان گرنگی بە لێکۆڵینەوەی دەروونی تاکەکانو شیکاری هاندەرە ناوەکییەکان دەدات، دووەمیشیان گرنگی بە لێکۆڵینەوەی گونجاندن لە کۆمەڵگەدا دەدات.

لیستەر وارد کە دەڵێت پشتگیریی ئەو ئاقارە دەکات، ژیانی کۆمەڵایەتی بە پاڵپشتی دەروونزانیی تاکی شیدەکرێتەوە، تاك بەوە دەناسێنێت کە ئارەزووی گۆشەگیریو خۆپەرستی دەکات، بەڵام دروستکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی لەلایەن تاکەکانەوە، بۆتە هۆی گۆڕینیان، چونکە تەنها هۆکاری بایۆلۆجی نابێتە هۆی پەرەسەندنی تاك، بەڵکو هێزە کۆمەڵایەتییەکانیش لەوەدا کاردانەوەی زۆریان هەیە، جیاوازیش لەنێوان دوو جۆرە هێزی کۆمەڵایەتیدا دەکات، یەکەم

سەرەکییە، ئەویش بریتییە لە ئارەزووی پارێزگاریکردن لەسەر ئەو جۆرەی کە دەبێتە هۆی ئارەزووکردنی خواردەمەنی. ئەویش لەلایەن خۆیەوە حەز لە ملکداریو گەڕان بە شوێن دەسەلاتدا دەڕسکێنێت، لەوانەیە پالپێوەبنێت بۆ دلڕەقیو دزیو دەستڕۆیشتن، بەلام دووەمیان کە لە پلەی دووەمدا دێت، سۆزو حەز بە زانست دەگرێتەوە، ئەمەیان پەیوەندی بە ژیانی کۆمەلایەتییەوە هەیە.

پێویستە دەروونزانیی کۆمەلایەتی گرنگیبدات بە لێکۆڵینەوەی ئەم ئارەزووانەو شیکارییان بکات، واتە: پێویستە لێکۆڵینەوە دەروونییەکان زۆر قولبکرێن. بەلام (ماکدۆگاڵ – Mac Dougal )[1] ی ئەمریکی رەگەز، بەڕەچەڵەك بەریتانی، دەگەڕێتەوە بۆ تیۆری هۆکاریە سروشتییەکان لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیدا، ئەوانەی بوونە هۆی لێکۆڵینەوەو توێژێکی یەکجار زۆر لەم بوارەداو بەشدارییانکرد لە پەرەپێدانی ئەم زانستەدا.

لە دانراوەکەیدا (دەروازەیەك بۆ دەروونزانیی کۆمەڵایەتی) ساڵی ١٩٠٨، پێشەکییەکی دەروونیی بۆ دەروونزانیی کۆمەڵایەتی دانا، گرنگی ئەم زانستەی بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵ باسکرد. تێیدا بنچینە تیۆرەکانی ئەم دەروونزانییەی دانا، رۆڵی ئارەزووەکانو ئاڕاستەکانی بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی روونکردەوە، بە هاندەرێکی بنچینەیی دانا، بۆ هەموو چالاکییەکی مرۆڤایەتی، بە ڕای ئەو دەروونی مرۆڤ لە کۆمەڵە پاڵنەرێکی (هاندەرێکی) سروشتی پێکدێت، بە تایبەتی ئەو هاندەرە

---

(١) ولیام ماکدۆگاڵ (١٨٧١-١٩٣٨): زانایەکی ئینگلستانییە، ساڵی (١٩٢٠) لە ئەمریکا جێگیربووە، شیتەڵکردنی زانا پەیوەستەکانو زانا تێڕامانەکانی بۆ (هەست) پەسەندکردووە، ئاڕاستەی دەروونزانیی کردووە بۆ ئەوەی وەسفی رەفتاربکات. — و –

گشتییانە، هەموو هاندەرێکی سروشتیش کارتێکەرێکی سۆزی تایبەتی هەیە.

بۆ نموونە هاندەری هەڵهاتن، لە هۆکاری دییشەوە هەڵدەقوڵێت، رەفتارەکانی مرۆڤ پشت بە کۆمەڵێك هاندەری سروشتیو ئەو ئارەزوانەی کە لێیانەوە پەیدابوون دەبەستێت. دروستبوونی کۆمەڵگە، بۆ پاڵنەری سروشتی دایکیو باوکی دەگەڕێتەوە، کە خێزانیان دروستکردووە، ئەویش لەلایەن خۆیەوە کۆمەڵگەی دروستکردووە. ئەگەر هەردوو هاندەری بەربەرەکانیو ململانێ نەبونایە، شارستانی پەیدانەدەبوو، پێشکەوتنی کۆمەڵایتی روویندەدا، پاڵنەری (هاندەری) سروشتیش: ئامادەبوونێکە سروشتییە، سێ لایەنی هەیە، لایەنی زانیاری (aspect coguitif) ، لایەنی سۆزی (las pect affectif) ، لایەنی زانستی.

بەڕاستی ماکدۆگاڵ لە لێکۆڵینەوەکانیدا، ئەو وزە بیرکردنەوانەی ئەو سەردەمەی خۆی کە زاناکانی ئەو سەردەمەی خەریك کردبوو، وەکو: داروین، جێمس سلی، کاریتێکردبوون، ئەم رایانەی بوونە هۆی دەرکەوتنی چەند رایەك کە دژی وەستانەوە، لەلایەن ئەو زانایانە ، کە گرنگییان بە زانستە مرۆییەکانو شیکاریی دەروونی دەدا، هەرچەند فرۆید خۆی دادەنا بە گەورەترین ئەو کەسانەی پشتیاندەگرت.

ثۆراندایك[٢] (Thorandike) لە کتێبەکەیدا (پێشەکییەك بۆ دەروونزانیی کۆمەڵایەتی) ئاماژە بۆ بایەخی کاری زانستی دەکات لە

---

[٢] أدوارد ثۆراندایك (١٨٧٤-١٩٤٩): زانایەکی ئەمریکی رەفتارییە، بەناوبانگە بە تاقیکردنەوە لەسەر گیانەوەران، بە زیرەکی پێوەکانی، بەناوبانگترین کتێبەکانی: دەروونزانیی پەروەردەیی، زیرەکی گیانەوەران، سایکۆلۆجی فێربوون، زیرەکی‌پێو، هەمیشە پری ژوورەکەی جوجەڵە بووە.

دروستبوونی خوڕەوشتو ئاراستەکردنی ڕەفتاری مرۆڤایەتیدا. دەرکەوتنی خوێندنگەی ڕەفتاریی لەم بوارەدا بە شۆڕش دادەنرێت. ئەم خوێندنگەیە لە هەردوو وڵاتی ئەمریکاو بەریتانیا لە ساڵانی (١٩١٢-١٩٢٠) دەرکەوت، واتسۆن بە گەورەترین پێشەواکانی دادەنرێت، ئەم زانایە جەخت لە نەبوونی ھاندەرە ناوەکییە سروشتییەکان لە دەروونی مرۆڤدا دەکاتەوە، لەباتی ئەوە ئاماژە بۆ بنچینەیەکی میکانیکی دەکات، بۆ بوونەوەری مرۆڤایەتی، کە پەیوەستەو دەستنیشانکراوە، بە ژینگەی کۆمەڵایەتییەوە، بەلایەوە وایە کە دەروونزانیی هەرگیز نازانرێت لە ڕێگەی کۆمەڵەوە نەبێت، ئەوەش لەبەرئەوەیە رواڵەتە دەروونییەکان دیارینا کرێت لەبەر روناکی دەوروبەری کۆمەڵایەتی نەبێت.

بەڵام کاتێك کە دەروونزانیی کۆمەڵایەتی کە لە ئەمریکا ساڵی ١٩١٩ دەرکەوت، بووە هۆی سەربەخۆبوونی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی لە جیهاندا، ئەوکاتە دوو شەپۆل لە دەروونزانە کۆمەڵایەتییەکاندا ھاتە کایەوە کە لێتوێژینەوەکان لەم بوارەدا ھێنایان:

١- گرنگیدەدات بە لێکۆڵینەوەی دەروونی تاکەکانو شیکاری ھاندەرە ناوەکانیان.

٢- گرنگیدەدات بە لێکۆڵینەوەی تێکەڵاوبوون لەگەڵ کۆمەڵگەدا.

**لیستروارد**(١):

لیستروارد پشتگیریی ئەو بۆچوونەدەکات کە دەڵێ ژیانی کۆمەڵایەتی بەپێی لێکۆڵینەوەی دەروونزانیی تاك ڕاڤەدەکرێ، وەسفی تاکی

(١) لیستەر فەرانگ وورد (١٨٤١-١٩١٣): زانایەکی کۆمەڵناسی ئەمریکی بوو، لێکۆڵینەوەکانی لە دەوری فرمانەکانی کۆمەڵگە دەسوڕایەوە، کاردانەوەی بە ئۆگست کۆنت هەبوو، ڕاکانی پشتگیریی تەواوی ڕای گشتی ئەمریکی بە دەستنەھێنا، چونکە بانگەشەیدەکرد بۆ ئەوەی کە دەوڵەت دەستبخاتە کاروباری گەلەوە. – و –

کردووە بەوەی کە حەزی لە دابڕان و خۆپەرستییە، بەڵام کۆبوونەوە و دەرکەوتنی جیهانی کۆمەڵایەتی وایکرد کە دانەبڕێت و کۆمەڵایەتی بێت. پەرەسەندنی تاك تەنها بەهۆی هۆکارە بایۆلۆجییەکانەوە راگیرنابێ، بەڵکو ئەو پەرەسەندنە دەرەنجامی کاریگەری هێزە کۆمەڵایەتییەکانە.

لە ساڵی ١٩١٩ دا کۆمەڵێ لە دەروونزاەکانی دەروونشیکاری ئەڵمانو نەمساویو هەنگاریەکان هاتن ئەفسانەکانیان لێکدایەوە، هەروەها نیشانە ئاینییەکان و کەلەپوری میللییان لێکدایەوە لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئەمانە لەبارەی کۆمەڵەوە دەردەبڕدرێت و خەونەکانو ئامانجەکانی کۆمەڵ دەردەبڕن، وەکو (کارل ئەبراهام[٢] ، ئوتورانك[٣] ، جیزارهایم[٤]).

ئەم سێ زانایە گرنگییانداوە بە لێکۆڵینەوەکانی دەروونزانیی کۆمەڵ، ئەوەی کە لێکۆڵینەوەکانی دەروونزانە رەفتارییەکان پشت

---

(٢) کارل ئەبراهام (Abraham, Karl) (١٨٧٧-١٩٢٥): دەروونزانێکی شیتەڵی دەروونییە، جولەکەیەکی ئەڵمانییە، یەکێك بوو لە قوتابییەکانی بلولر، پەرتوکەکانی فرۆیدی خوێندەوە، دوای ئەوە ساڵی ١٩٠٧ بە فرۆید گەشیت، ساڵی ١٩١٠ کۆمەڵەیەکی دەروونیی لە بەرلین کردەوە. چالاکییەکی زۆری نواندووە لە مەیانەی دەروون شیتەڵیدا لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، بووە پزیشکێکی دەروونیی سووپایی، لە ساڵی ١٩٢٥ لە تەمەنی ٤٨ ساڵیدا کۆچی دوایکرد.

(٣) ئۆتۆرانك (Rank, Otto) (١٨٨٤-١٩٣٩): یەکێك لە لایەنگرەکانی فرۆید، بەڵام ئەم دانیناوە بە خرپەی لەدایکبووندا (صدمە المیلاد)، بەلایەوە وایە کە ویست بەهێزی گرنگترین بنەماکانی کەسێتی مرۆڤە. — و -

(٤) جیزا رۆهایم (Roheim, Geza): ساڵی ١٨٩١ لە بودابست لە دایکبووە، لە نیۆیۆرك مردووە، خولیای ئەو ئەفسانە و هونەری گەلی بووە، ساڵی ١٩٢٥ خەڵاتی فرۆیدی لەسەر لێکۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (تەوتەمی ئوستورالی) وەرگرتووە.

گوێیــان خســتبوو[1]. ئاوەهــا روکــاری یەکــەم کــە (وروژێنــەرە ناوەکییەکانە)، بەهۆی یەککگرتنی لەگەڵ روکاری دووەمدا کە کەسێتیو رەفتاری تاك یان کۆمەڵ لە دەوروبەری کۆمەڵایەتیدا دەگەیەنێت لەگەڵ چــەند شــتێکی دیکــە کــە هــەبوون، هەرهــەموو بەشــدارییانکرد لــە پەرەســــەندنی دەروونزانیـــی کۆمەڵایەتیـــدا، وەکـــو لێکۆڵینــــەوە مرۆڤزانییــەکان (علــم الانســان)و لێکۆڵینــەوە شارســتانییە کۆنــەکان لــە سییەکانی سەدەی بیستەمدا (١٩٣٠) وەکو (رۆزبنـدکت، هێرسکوفیتز) ئەمانــە ئاشــکرایانکرد کــە جیــاوازی لــەبارەی دەروونــەوە لــە ئــەنجامی جیــاوازی ژینگــەی شارســتانێتییەوە دەردەکــەوێت، واتــە شارســتانیی کاریگــەریی هەیــە لەســەر رەفتــاری تاکــەکان.[2] ئەمــەش دەبێتــە هــۆی جیــاوازیی جۆری رەفتارو بەها کۆمەڵایەتییەکانو کەسێتی، بەم جۆرە لێکۆڵینەوە دەروونییەکان لەکاتی لێکۆڵینەوەی رەفتارو تاكو کۆمەڵدا، کارکــەرە دەروونییــەکانی بەســتووە بــە کارکــەرە کۆمەڵایەتییــەکانو شارستانییەکانەوە.

بــەم شــێوەیە لــە ساڵی (١٩٤٠ ز) ســێ شــەپۆلی بنچــینەیی لــە دەروونزانی کۆمەڵایەتیدا دەرکەوتن:

یەکەم / شەپۆلی شیکاریی (بەتایبەتی ئیکلینیکی)

دووەم / شەپۆلی رەفتاری، بەتایبەتی تاقیکاریی

سێیەم / شەپۆلی شارستانیی (الحضاري)

---

(1) Ygastellan, in itation. la Psychelogie, sociale Armand Colin, Paris, France, 1970, P. 18.

(٢) رۆز بەندەکت (Bendict Ruth) (١٨٨٧-١٩٤٨): زانایەکی ئەمریکییە، پسپۆرە لە مرۆناسیدا، بە کتێبی (تەرزەکانی رۆشنبیریی کە ساڵی ١٩٣٤ بڵاویکردەوە ناوبانگیدەکردووە، تێیدا تێکەڵاوی لەنێوان تیۆرەکانی سایکۆلۆجیو ئەنثرۆپۆلۆجیدا کردووەو تێکهەڵکێشکردووە. - و -

هەر لە جەنگی جیهانی دووەمەوە کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی جۆربەجۆری دیکە دەرکەوت وەك:

١- ئەو لێکۆڵینەوانەی کە پشتیانبەستووە بە کەسێتیو پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و لێکۆڵینەوە شارستانێتیو شێکاریی دەروونیو فێرکردن، ئەم قوتابخانەیە بە میراتگری بەتایبەتی (مارگریت مید) دادەنرێت ئەمیش بە میراتگری (روز بندکت) دادەنرێت، ئەم لێکۆڵینەوانە بەتایبەتی لە ولایەتە یەگرتووەکانی ئەمریکادا گەشەیانکرد.

٢- کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەك لەگەڵ ئەوەی کە گرنگیدەدات بەو لێکۆڵینەوانەی پێشوو گرنگیدەدات بە لێکۆڵینەوە لەبارەی جیاوازی لەنێوان کۆمەڵە کۆمەڵایەتییەکان و کۆمەڵە نەتەوەییەکان و کۆمەڵە رەگەزییەکاندا.

**٣- ئاڵتون مایۆ** (Alton Mayo) :

چەند لێکۆڵینەوەیەکیکرد لەبارەی پێشەواییو پێکداچوونی کۆمەڵایەتییەوە، کە تا چ رادەیەك کاردەکەنە بەرهەم، ئەم لێکۆڵینەوانە سەرەتا لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەرکەوتو پاشان لە فەرەنسادا بڵاوبووەوە.

هەروەها (جان لویس مۆرینۆ) (Moreno) ناسراوە بە لێکۆڵینەوەکانی لەبارەی پێوانەی کۆمەڵایەتییەوە (سۆسیۆمەتری) ئەم پێوانە جۆرە تاقیکردنەوەیەکە کە پەیوەندی نێوان خەڵکەکەی پێدەزانێ) کە تا چ رادەیەك ئەو پەیوەندییە کاردەکاتە سەر بەرهەم، پەیوەندی نێوان کرێکارەکانیش دیسان لەناوخۆیاندا گرنگە، چونکە دەرکەوتووە هەتا ئەو پەیوەندییانە باشو خۆشبن، ئەوا بەرهەمیش زیاددەکات، لەناو کێشی لێکۆڵینەوەکانی بۆ تۆڕی پەیوەندی تاکەکان

له کۆمەڵە بچوکەکاندا، لە ئەنجامدا دەگەینە ئەنجامی زانینی پەیوەندی نێوان رەفتاری تاکەکان و کۆمەڵە بچووکەکان، هەروەکو چۆن (کۆرت لڤین)[1] هاتووە لێکۆڵینەوەی لەسەر قەیرانەکانی بەرهەمکردووە. بەتایبەتی لەسەر بەرهەڵستیکردنی گۆران، (جیب) لێکۆڵینەوەی لەسەر دیاردە پەیوەندیدارەکان بە فرمان و دەسەلاتەوە کردووە و ئەم لێکۆڵینەوانە تێپەڕیکرد بۆ چەند لێکۆڵینەوەیەکی دیکە بۆ ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوانە کۆمەڵگا پیشەسازییەکانیش بگرێتەوە.

٤- کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەك کە پشتی بە بەرامبەرێن و راوەرگرتن بەستووە، بۆ لێکۆڵینەوەی ژیانی گشتی کۆمەلایەتی، ئەم رووکارە رای گشتیو روکارە دەروونییەکانی گرتۆتەوە، هەروەکو چۆن پاگندەو ئاگاداریو قاوداخستنی گرتۆتەوە، ئەم لێکۆڵینەوانە لە ئەمریکا دەستیپێکرد، دوای ئەوە لە فەرەنسا لە ساڵەکانی (١٩٤٣ ز) و لەسەر دەستی (جان ستوتیزل – Jean Stoetzer) و بلاوبووەوە، گرنگی زۆری پێدرا لە مەوداکانی ئابووری و رامیاری و بەتایبەتی لە کاتەکانی هەڵبژاردنی سەرۆك و پەرلەمانتارەکاندا.

٥- کۆمەڵە لێکۆڵینەوەیەك کە گرنگیدەدا بە گرفتە کۆمەلایەتییەکان، وەك لادانو تاوانو نەخۆشییە ژیرییو دەمارگیرییەکانو هەوڵیاندا بگەنە ئەنجامی ئەوەی بۆچی ئەو کارکەرە کۆمەلایەتییانە بلاودەبنەوە.

---

(١) کۆرت لیڤین K.Lewin-: (١٩٤٧-١٨٩٠) جولەکەیەکی ئەلمانی بووە، هاوڕێتی فەرتایمەرو کەهلدری کردووە، بەهۆی نازیەکانەوە کۆچی بۆ ئەمریکا کردووە، پەرەی بەدەروونزانیی تۆبولوجی داوە، تیۆری ( مەودای) بەسەر دەروونزانیی کۆمەلایەتیدا جێبەجێکردووە گرنگترین پەرتوکەکانی (بەرەو تیۆری دینامی لەکەسێتیدا) و (بنەماکانی دەروونزانیی تۆبولوجی). - و -

٦- کۆمەڵـە لێکۆڵینەوەیـەك کـە گرنگیـدەدات بـە دامـەزراوە رێکخـراوە نێودەوڵەتییەکان کە باسی فێربوونو خواردنو تەندروستییان کردووە لـە رێگەی چەند رێنماییەکەوە.

٧- کۆمەڵـە لێکۆڵینەوەیـەکی تاقیگـەیی کـە باسـی کارکـەرە کۆمەڵایەتییـەکان دەکـاتو رادەی کاریگـەرێتی بـۆ سـەر دەروونـی تـاکو پاڵنـەرە (هانـدەرە) ناوەکییەکانو وێناکردنو یادەوەریو زیرەکی.

ئەم لێکۆڵینەوانە لە ئەمریکا ساڵی (١٩٥٠) زۆر چالاکبوون بۆ ئەوەی لـە فەرەنساو ئەوروپاش بڵاوببنەوە.

# دەروازەی یــەکــەم

## بەشی دووەم

- پەیوەندی دەروونزانیی کۆمەڵایــەتی بــە زانســتە مرۆییەکانی دیکەوە.
- دەروونزانیی کۆمەڵایەتیو دەروونزانیی گشتی
- دەروونزانیی کۆمەڵایەتیو کۆمەڵناسی
- دەروونزانیی کۆمەڵایەتیو گەلزانی
- دەروونزانیی کۆمەڵایەتیو ئابووریزانی

# بەشی دووەم

## ﴿ پەیوەندی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی بە زانستە مرۆییەکانی دیکەوە ﴾

زانستە مرۆییەکان، هێندێکیان پەیوەندییەکی پتەویان هەیە بە هێندێکیانەوە لەبەرئەوەی هەموویان لە مرۆ دەکۆڵنەوە، لەبەرئەوەی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی گرنگیدەدات بە لێکۆڵینەوەی تاك، هەروەها بەو کارکەرانەی کە کاریتێدەکەن، سنوورەکانی دیاریدەکەن، لەبەرئەوەی پەیوەندی هەیە بە هەموو زانستە مرۆییەکانی دیکەوە کە گرنگیدەدەن بە لایەنێکی تایبەتی لە ژیانی تاکدا. وەکو (دەروونزانیی گشتی، کۆمەڵناسی، مرۆڤناسیو ئابوورییو رامیاری)و بێجگە لەمانەیش لە زانستە مرۆییەکانی دیکە.

دەروونزانیی کۆمەڵایەتی لەکاتێکدا کە هەوڵدەدات رەفتاری مرۆڤ تێبگات لە رێگەی زانستەکانی دیکەوە تێیدەگات. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت تەنها زانیاری لەو زانستانەوە وەردەگرێتو هیچیان پێنابەخشێت. بەڵکو ئەمیش زانیاری زۆریان لە لێکۆڵینەوەو جێبەجێکردنیدا پێدەبەخشێت لە گۆشەی تاکدا گرنگییەکەی زیادیکردووە، هەروەکو چۆن لە رەفتاری کۆمەڵدا گرنگییەکەی زیادیکردووە.

### ١- پەیوەندی دەروونزانیی کۆمەڵایەتیو دەروونزانیی گشتی:

ئەم دوو زانستە لە بواری لێکۆڵینەوەی فراوانیدا بە تایبەتی، ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە فرمانەکانی دەروونو کارکەرەکانی دەروونەوە بەشداریدەکەن. زۆر لە زاناکان دەڵێن جیاکردنەوەی ئەم دوو زانستە ناکرێو ناگونجێ، ئەوانەی کە وایان وتووە (کاتز Katz– شانك Shanck –)ە ، بەلام هێندێکی دیکە وەك (کلینبرك – Klineberg) دەڵێن جیاکردنەوەیان گیروگرفتی تێدایە، هەندێ زانای دی، وەکو

(گرینـــە - Gurnee) دووپـــاتی ئـــەوە دەکەنـــەوە کـــە دەروونزانیـــی کۆمەڵایـــەتی بەشـێکە لـە دەروونزانیـی گشـتیو لەگـەڵ جیـاوازیی ئـەم بۆچوونانەدا دەتـوانین هـەردوو زانسـتەکە بـە سـەربەخۆ دابنـێین لـە بوارەکانی لێکۆڵینەوەو ڕێگاکانی توێژینـەوەدا یـان لـە بەشداریکردندا، لـــە لێکۆڵینـــەوەی فرمانـــە دەروونییەکانـــدا، چـــونکە دەروونزانیـــی کۆمەڵایـــەتی لـــە ڕواڵەتـــە دەروونییـــەکان دەکۆڵێتـــەوە لـــە دووتـــوێی پەیوەنـدی بـە کارکـەرە کۆمەڵایەتییەکانـەوەو ڕادەی ئـەو کارکەرانـە لـە ڕەفتاری خەڵکدا (تاك)و کۆمەڵدا، واتای وایە هەر گرنگیناداتا بە لایەنی دەروونییو هیچیدی. بەڵکو هەوڵی ئەوەدەدات رووکارەکانیان بزانێت، بۆچوونو ڕەفتارەکانیان بزانێتو بە پێچەوانەی دەروونزانیی گشتییەوە کـە گرنگیـدەدات بـە لێکۆڵینـەوەی بـاری ژیـری بـە شێوەیەکی گشـتی، هەروەها بە لێکۆڵینەوەی باری سۆزیان هێنانە پێش چاو (وێناکردن)و پـەیپێبردن بەبێ ئـەوەی بیبەستێ بە ڕۆڵـی تاکەوە، یان دەوروبەرەوە، وەکـو ڕادەی کۆمەڵایـــەتیو زانسـتی ئـابووریو پیشـەو ئـایینو ڕادەی ڕۆشنبیرییو .......هتد.

لــە کاتێکـدا دەروونزانیـی کۆمەڵایـەتی تـەنها گرنگینـادات بـە کارکـەرە تاکییـەکان، بـەڵکو تێدەپـەڕێت بـۆ ئـەوەی گرنگیبـدات بـە پەیوەندییـەکانی نێـوان تاکـەکان، لـەنێوان خۆیانـدا هـەروەکو چۆن لـە دەوروبەری کۆمەڵایەتیو شارستانی پەیوەندی بە ڕەفتاری تاکەکانەوە دەکۆڵێتـــەوە. دەروونزانیـــی کۆمەڵایـــەتی جیاوازیـــدەکات بـــۆ نموونـــە لـەنێوان ڕادەی ژیـری دانیشـتوانی لادێـو شارۆچکە نشینەکانداو ژیـری دانیشـتوانی شـارە گـەورەکانـدا، لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەردووکیان لەیەکـەوە نیزکنـو لەیـەك دەچـن چـونکە هـەردوکیان گرنگیـدەدەن بـە کۆمەڵـە گرفتێکی هاوبەش، هەرچەند هە... بۆچوونی جیاوازی خۆی هەیە.

وەکو باری گرێی ئۆدیب، کە دەروونزانیی گشتی دەڵێت / رواڵەتێکی گشتییە لەگەڵ ئەوەشدا دەروونزانیی کۆمەڵایەتی دەڵێت پەیوەندی هەیە بە کرداری شارستانیو کۆمەڵایەتییەوە. لەبارەی ئەو رێگایانەی بۆ لێکۆڵینەوە بەکاریدەهێنن، دەروونزانیی کۆمەڵایەتی پشت بە هێندێك رێگە دەبەستێت، کە ئەو رێگایانە بەکاردەهێنرێت بۆ لێکۆڵینەوە دەروونییەکان، وەکو پێوانە دەروونییەکان و لیکۆڵینەوە تاقیارییو بینگەییەکان، بەلام دەروونزانیی گشتی ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوانە بە سنوردار دادەنێت، لەبەرئەوە پشت بە لێکۆڵینەوەی کرداری تایبەتی دەبەستێت، وەکو چاوپێکەوتنو بەراوردەکارییو پێوانەی روکارەکانو شیکاری سۆسیۆمەتریو شیتەڵکردنی ناوەرۆك.

لەبارەی ئامانجەوە، لێکدانەوەی دەروونزانیی گشتیی تاکییە، دەیەوێت ئەو یاسایانە دیاریبکات کە بارە دەرونییەکە لە تاکدا رێکدەخات، بەلام دەروونزانیی کۆمەڵایەتی بۆ وردتر دەڕوات لەکاتێکدا گرنگیدەدات بە سیستمی شارستانیو ئەو دەوروبەرەی کە دەوری تاکو کۆمەڵیانداوە، بێجگە لە لێکۆڵینەوەی تاكو کەسێتیەکەییو کارکەرە ژێریو دەرونییەکانی.

دووبارە ئەم دوو زانستە سودگۆڕکێدەکەن، بە پشت بەستنی دەروونزانیی گشتیی بە تایبەتی لە لقە جێبەجێکاریو کردارییەکانیدا، وەکو دەروونزانیی بازرگانیو سەربازی بە دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، هەروەکو چۆن دەروونزانیی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵێ لێتوێژینەوەکانیدا پشت بە دەروونزانیی گشتیی دەبەستێت وەکو پێوانە دەروونییەکانو هاندەرەکانو هیدیش.

## ٢- پەیوەندی نێوان دەروونزانیی کۆمەڵایەتی کۆمەڵناسی:

لەپێشدا وات بۆ دەردەکەوێت کە جیاکردنەوەی ئەم دوو زانستە قورسو گرانە، چونکە هەردوو زانستەکەگرنگی بە رەفتاری تاك دەدەن لەنێو کۆمەڵدا. لە ماوەی پەیوەندییان بە باری کۆمەڵایەتیو کۆمەڵەوە، لەکاتێکدا هەردوو زانستەکە رەفتار دەبەستنەوە بە چەند پێوەرێکی تایبەتییەوە، وەکو / تەمەنو ئاستی ئابووریو کۆمەڵایەتیو باری زانستی، بەڵام راستی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە جیاوازیو سنورێك هەیە لەنێوان ئەم دوو زانستەدا، چونکە کۆمەڵناسی بەشێوەیەکی گشتیی لە رەفتاری کۆمەڵو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دەکۆڵێتەوە، لەکاتێکدا دەروونزانیی کۆمەڵایەتی لێکۆڵینەوەی رەفتاری تاك دەکات لەنێو کۆمەڵدا، واتا رەفتاری ئەندامەکانی کۆمەڵەکە نەك کۆمەڵگەکە، وەکو رێکخراوێکی کۆمەڵایەتی یەکەی لێکۆڵینەوە لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیدا، تاکە، نەك کۆمەڵ، ئەو کۆمەڵەی کەوا کۆمەڵناسی گرنگی لە لێکۆڵینەوەی بەهاو پێوەرە کۆمەڵایەتییەکەی دەدات، کۆمەڵناسی کاتێ لێکۆڵینەوەی خێزان دەکات، بۆ نموونە لێکۆڵینەوەی دەکات وەکو دەزگایەکی کۆمەڵایەتی جیاوازی هەیە لە رووی دیمەنی بناغەو بونیادەوە، بەگوێرەی کۆمەڵگەکانو قۆناغە مێژووییەکان، بەڵام دەروونزانیی کۆمەڵایەتی پەیوەندیی تاکەکانی لەناو خێزاندا بەلاوە گرنگە، کە ئایا پەیوەندی نێوانیان چۆنە؟

وەکو چۆن گرنگیدەدات بە زانینیی کاریگەریی باوان، لە دیاریکردنی رەفتاری منداڵەکانداو چۆنێتی پەیوەندییان بە یەکترەوە.

هەروەها دەروونزانیی کۆمەڵایەتی لەو ناوەندە کۆمەڵایەتیو شارستانییە دەکۆڵێتەوە ملکەچە بۆ (ئایا ئەو ناوەندە لەسەر بنەمای هاوکاریکردن یان پێشبڕکی دروستبووە؟) چونکە ئەمە کاریگەری هەیە لەسەر هەستی تاکەکانو رەفتارەکانیان.

بەڵام بەگوێرەی ڕێگاکانی لیکۆڵینەوە، کۆمەڵناسی ڕێگایەکی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە خۆی نییە، هەرچەندە دۆرکایم دانراوێکی دانا بە ناوی (بنەماکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی)و دیاردە کۆمەڵایەتییەکانو پۆلێنکردنیانی دیاریکردووە. لەبەرئەوەی کۆمەڵناسی لە لێکۆڵینەوەکانیدا پشت بە ڕێگا لێکۆڵینەوەکانی دیکەی زانستە مرۆڤایەتییەکان دەبەستێت، وەکو / یاسا – مێژوو– گەلزانی – زانیارییە ئامارییەکان، لە دامەزراوە کارگێڕییەکاندا، لەکاتێکدا کەوا لێکۆڵەرە کۆمەڵایەتییەکان گرنگییەکی زۆریان داوە بە لێکۆڵینەوە مەیدانییەکان (دێبەری)، لێکۆڵینەوەکانیان، لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی تایبەتییەوە پشتی بە دەروونزانیی کۆمەڵایەتی دەبەست، وەکو / راوەرگرتن بەراوردکردن لەگەڵ پشتبەستن بە تێبینییە تایبەتییە ئەنترۆپۆلۆجییەکان (مرۆڤییەکان)، بەم شێوەیە هاریکارییو پێکداچوون لەنێوان هەردوو زانستەکەدا لەبەر پێویستییان بە یەکتری زیادیکرد، چونکە دەروونزانیی کۆمەڵایەتی پشت بە بیردۆزەکانی کۆمەڵناسی دەبەست، بەتایبەتی لە لێکۆڵینەوەی دەروونزانییەکانو رامیاریو ئابووریوو سەربازییەکاندا.

**٣- پەیوەندیی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی گەلزانی (مرۆڤزانی شارستانی):-**

هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵ لە کۆمەڵە پلەیکی شارستانی دروستدەبێت، کە رەفتاری مرۆڤ تێیدا رێکدەخرێت، زانستی گەلان (مرۆناس شارستانی) گرنگیدەدات بە لێکۆڵینەوەی سیستەمە شارستانییەکان، لەبەرئەوە یەکەم جار وات بۆ دەردەکەوێت کە ئەم دوو زانستە زۆر لە یەکتری جیاوازنو پەیوەندییان پێکەوە نییە، لەگەڵ ئەوەشدا وانییە، چونکە مرۆناسی شارستانیی گرنگیدەدات بە شارستانییەکانو کۆمەڵگا تایبەتەکان، کۆمەڵە سەرەتاییەکان، کە لێکۆڵینوەیان لەسەر دەکات لەبارەی بناغەو پێکهاتەیانەوە بۆ ئەوەی

لەژێر رووناکی ئەو توێژینەوەیەدا لەو پەیوەندییانە بکۆڵێتەوەو دامەزراوەکانیان پێکەوە ببەستێت، بەڵام دەروونزانیی کۆمەڵایەتی گرنگیدەدات بەو دامەزراوانە، چونکە بەلای ئەوەوە ئەمانە ئاشکرانین، لەبەرئەوە گرنگییەکانی رووددەکاتە سەر تێبینی رەفتاری تاکو شیکردنەوەی ئارەزووەکانیانو ئاراستەکانیان، بەڵام لەلایەکی دیکەوە دەبینین کە هەردوو زانستەکە گرنگیدەدەن بە سروشتی مرۆڤ، چونکە رەفتارو بەها کۆمەڵایەتییەکان لێرەدا بەیەکداچوونو ناتوانن زانستییانە لە یەکێکیان بکۆڵنەوە، بێئەوەی یارمەتی لە زانستەکەی دیکە وەربگرین. لێکۆڵینەوە زانستییەکان ئاماژە بۆ ئەم کارلەیەککردنە پەیوەستییە دەکەن، لەبەرئەوە (یۆنگ) دەڵێت / (لبیدۆ) بریتییە لە نەستی کۆمەڵی (ئەوەی کەوا لە ئەفسانەو باوەڕە گەلییەکاندا دەردەکەوێت).[1] بەڵام فرۆید روونیدەکاتەوە کە دیاردە (رواڵەتە) دەروونییە تاکەکان دەگۆڕێن، یان لە رێگەی ئارەزوو هاندەرە خەفەکراوەکانەوە دەردەبڕێن، لەبەرئەوە فرۆید پشتگیریی پتەوکردنی پەیوەندی نێوان مرۆناسی شارستانیو شیکاریی دەروونی دەکات، چونکە دیاردە دەروونیو شارستانییەکان، راڤەی یەکتریدەکەن، واتا: دەبێت دەروونزانیی جیاوازییەکانی نێوان شارستانێتی گەلان بزانێت، چونکە هەر ئەو جیاوازییە دەبێتە هۆی ئەوەی رەفتارەکانیان جیاوازبێت، واتا شارستانی کاریگەری هەیە لەسەر رەفتاری تاکەکان، بەڵام مرۆڤزانی گرنگیدەدات بە رەفتاری تاکەکان، پاش ئەوەی ئەو باوەڕە نەما کە شارستانییە سەرەتاییەکان سروشتییە، یان خۆڕسکییە، بەڵکو باوەڕبوون بە جیاوازیی رەوشتی تاکەکان شوێنی باوەڕە

---

[1] لەبیدۆ – Libido، یان وزەی زیندەگی، یان سێکسی، مەبەست پێی لەپێشا وزەی سێکسی بوو. — و –

خۆڕسکەکەی گرتۆتەوە، بە گوێرەی کۆمەڵەکان و شارستانییەکانیان، ئەم جیاوازییە لەناو چوارچێوەی یەك کۆمەڵگەداو یەك شارستانێتی سەربەخۆو هاوبەشدا دەردەکەوێت.

لێکۆڵینەوە مرۆناسییەکان دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە رواڵەتە دەروونییەکان ئەوانەی بە شتێکی سروشتی لە قۆناغە دیاریکراوەکانی تەمەنی ژیانی تاکەکاندا، لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا دادەنرێن، کە ئەم رواڵەتانە لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا بەدیناکرێن. وەکو ئەو لێکۆڵینەوە مەیدانییانەی کە (مالینۆفسکی) ئەنجامیدان لە دورگەکانی (ترۆبریاند – Ites Trobroand ) لە ساڵی ١٩٢٨ ز ، جەختی لەسەر نەبوونی گرێی (ئۆدیب)[٢] دەکاتەوە لەناو دانیشتوانی ئەو دورگانەدا، ئەمەش هۆکەی دەگەڕێتەوە، کە دەسەڵات لەو دورگانەدا هی ژن بووە نەك پیاو، هەروەها بە نسبەتی کێشە دەروونییەکانەوە، کە روبەڕوی هەرزەکارو گەنجە تازە پێگەیشتووەکان دەبێتەوە لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا، هۆکەی بە پلەیەکی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکارە شارستانییەکان، نەك هۆکارە سەرەکییەکان. ئەمەش لێکۆڵینەوەکانی (روزنبدکت – دولارد – دیوا – اریکون – کاردینە – لنتون – مید – سابیر – هێندێکی تریش) جەختی لەسەر دەکەنەوە.

(٢) گرێی ئۆدیب: بریتییە لەوەی کوڕان لە تەمەنی منداڵییاندا پەیوەستن بە دایکیانەوەو غیرەیەکی زۆر لە باوکیان دەکەن، بەڵام لە رێگەی هەڕەش و گوڕەشەی باوکیانەوە کە دەبێت گونیان ببڕێت یان بیان خەسێنن، ئەم گرێیە کوڕان خەفەی دەکەن ئەم زاراوەیە فرۆید لە ئەو ئەفسانەیەوە وەریگرتووە، کە وێژەوانی یۆنانی کۆن (سۆفۆکلیس) بە ناوی ئۆدیب نوسیویەتی. – و –

### ٤- پەیوەندی دەروونزانیی کۆمەڵایەتیو ئابووریزانی:

دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، بەرفراوانتر بەرتەسکتریش دادەنرێت لە ئابووریزانی لەلایەکەوە، بەرفراوانترە، چونکە لە زۆر رووەوە لە پەیوەندی نێوان تاکەکان دەکۆڵێتەوە، نەك تەنها لە یەك رووەوە، وەکو پەیوەندییە ئابووریو رامیاریو ئایینیوو یاساییەکان. لەلایەکی ترەوە دەتوانین بڵێین بەرتەسکترە، چونکە ئابووریزانی گشتیترەو گرنگیدەدات بە کۆمەڵێ رواڵەتی کۆمەڵایەتی، کە پەیوەندییان هەیە بە سامانی کۆمەڵەوە، کە ئایا چۆن دابەشدەبێتو یاساکانی رەفتاری مرۆڤ بەرامبەری دیاریدەکات، هەروەها کارەکانی بواری ئابووریزانی، تەنها لەسەر کرینو فرۆشتنو بەخشینو بەکرێدان ناوەستێت، بەڵکو کاروباری ئابووری دیکەش دەگرێتەوە، وەکو هەڵوێستی تاکەکان لە دراوو شتومەکو وەکو هەوڵی بەرهەمهێنان بۆ تاكو کۆمەڵو هۆکاری ئابووری کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە دەروونی تاکەکانو کەسێتیاندا، بەتایبەتی لە کۆمەڵگە بوژاوەکانو لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا، چونکە کێشەی دەروونی ژێری (فرە) دەخاتەروو کە پێویستدەکات لەسەر دەروونزانەکان لێکۆڵینەوەیان لەسەربکەنو تێیان بگەن، لەبەر گرنگییان، ئابووریزانەکان گرنگیدەدەن بە هۆکارە دەروونییە ژێرییەکان، بۆ تاكو کۆمەڵو لە ئارەزووەکانیان دەکۆڵنەوە، بە تایبەتی ئەوەی کەوا پەیوەندی بە کارگەو پرۆژە ئابوورییە نوێکانەوە هەیە.

# دەروازەی دووەم

## بەشی یەکەم

- □ بەرنامەکانی لێکۆڵینەوەی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی
- □ جۆرەکانی لێکۆڵینەوە
- □ جۆرەکانی بەرنامەی لێکۆڵینەوە
- □ بەرنامەی مالیێنی کۆمەڵایەتی
- □ بەرنامەی لێکۆڵینەوەی بار
- □ بەرنامەی مێژوویی
- □ بەرنامەی تاقیکاری

# دەروازەی دووەم

## بەشی یەکەم

## ﴿ بەرنامەکانی لێکۆڵینەوەی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی ﴾

بەگشتی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکان دەبنە سێ بەشەوە ئەوانیش سێ جۆرن:

١- لێکۆڵینەوە شوێن ماڵییەکان، یان تێڕوانین یان پشکنینەکان.

٢- لێکۆڵینەوە وەسفییەکان.

٣- ئەو لێکۆڵینەوانەی کە چەند گریمانەیەکی هۆکاری تاقیدەکەنەوە (الدراسات التي تختبر فروضا سببية).

### ١) لێکۆڵینەوە پشکنینەکان:

ئەمە بە کارێکی پێویست لە لێکۆڵینەوە مەیدانییەکاندا، یان رواڵەتە کۆمەڵایەتییەکاندا دادەنرێت، کە پێشتر تۆژیارەکان نەیانکردووە، پێویستە ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەش بە شێوەیەکو ئەندازەیەکی زۆر، نەرمیو گشتگیرێتی تێدابێتو بەکاربهێنرێت، بۆ ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوە پشکنینانە باشترین ئەنجامیان هەبێت، پێویستە لەسەر تۆژیارەکە کە چاوبگێڕێت بەو لێکۆڵینەوانەی کە پێشتر کراونو پەیوەندی بە گیروگرفتی لێکۆڵینەوەکەوە هەیە، هەروەها پێویستە پشتببەستێ بە بیروڕای ئەو کەسانەی کە شارەزاییەکی زانستییانەیان هەیە لەبارەی بابەتی لێکۆڵینەوەکانەوە، هەروەها رای دانیشتوانی ئەو ناوچەیە وەردەگرێت کە لێکۆڵینەوەکەی تێدا ئەنجامدەدات، بۆ ئەوەی

بە باشی گرفتەکان بناسێتەوەو لە ئەنجامدا بگات بە دانانی گریمانەیەکی گونجاوی لەبار.

**٢) لێکۆڵینەوە وەسفییەکان:**

بریتییە لە راپۆرتنووسین لەبارەی تایبەتمەندییەکانی ئەو روالەتە دیاریکراوە.[1] ئەم لێکۆڵینەوەیە پشت بە راستی کۆکردنەوە دەبەسێت، لەبارەی روالەتێکی دیاریکراوەوە بۆئەوەی شیتەڵبکرێ و راڤەبکرێو واتای کورتبکرێتەوە، تاکو یارمەتی تۆژیارەکە بدات بۆ دانانی رێسایەك دەربارەی ئەو روالەتە (دیاردەیە).

زانیارییەکان لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەدا، لە رێگەی لێکۆڵینەوەکانی پێشووەوەو لە ئامێرە ژمێرییارییە گشتییەکانی دەوڵەتەوە لە رێگای لێکۆڵینەوە شیکارییەکانی پێشووەوە کۆدەکرێنەوە.

**٣- لێکۆڵینەوە تاقیکارییەکان (ئەزمونگەرییەکان):**

کە بە چەند هۆکارێك گریمانەکە تاقیدەکەنەوە، کە ئەگەر هۆکاری یەکەم سەرینەگرت، ئەروات بۆ هۆکاری دووەمو هەروەها... . لێکۆڵینەوە تاقیکارییەکان ئەوانەن کە هەوڵدەدەن ئەو هۆکارانە دەربخەن کە ئاماژە بۆ بوونی بەڵگەدەکەن لەسەر بوونی پەیوەندی نێوان هۆکارەکانو روودانی روالەتەکەندا، کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەیە. پێویستە لەسەر تۆژیار یان (کۆڵیار) گریمانەکان تاقیبکاتەوە، بە پەیرەوی مێژوویی لەگەڵ بەکارهێنانی لێکۆڵینەوەی لەباردا.

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە هێندێك جار پەیرەوی تاقیکردنەوەو تاقیکراوە بەکاردەهێنێت، بۆ دڵنیابوون لە راستی هۆکارە

---

[1] Robert Rosenthal, Ralphl, Ronsnow, Essentials of behavioral research, U.S.A. , 1948, P. 25. Mc Graw- Hill Book company.

گریمانەییەکان، کە پەیوەندی نێوان رواڵەتەکەو کارکەرە هۆییەکان، دیاریدەکات. بەڵام گرنگترین ئەو پەیڕەوانەی کە بەکاردەهێنرێت بۆ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییانە ئەمانەن: رووپێوی کۆمەڵایەتی، پەیڕەوی لێکۆڵینەوەی بار، پەیڕەوی مێژوویی، پەیڕەوی تاقیکاریی، بۆ هەریەکە لەم چوار پەیڕەوە سەرەکییە ئامێری تایبەت بە خۆی هەیە، کە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێویست لە لێکۆڵینەوەدا، بەکاریدەهێنێت، لێرەوە دەتوانین بگەینە یاسادانانو دارشتنی بیردۆزەکان.

لێرەدا هەریەکێ لەم چوار پەیڕەوە بەشێوەیەکی کورت دەخەینە روو:

**یەکەم / رووپێوی کۆمەڵایەتی، یان رووپێوی توێژینەوە:**

یەکێکە لەو پەیڕەوە سەرەکییانەی کە بۆ لێکۆڵینەوە وەسفییەکان بەکاردەهێنرێت، بەوە دەناسرێت کە هەوڵێکی رێکخراوە بۆ راپۆرتنووسینو راڤەی باری ئێستای سیستمی کۆمەڵایەتی، یان کۆمەڵێك یان ژینگەیەکی دیاریکراو، بە مەبەستی گەیشتن بە چەند زانیارییەککە دەتوانین پۆلینیبکەینو راڤەی بکەینو بڵاویبکەینەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەی کەڵکی لێوەرگرین بۆ ئامانجی زانستی، پۆلێنکردنی ئەم لێکۆڵینەوانە (لێتوێژینەوانە) لە رووی لێکۆڵینەوەکانەوە بۆ رووپێوە کۆمەڵایەتییە گشتییەکانی، چارەسەری گەلێ رووداو دەکات، لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، وەکو لێکۆڵینەوەی باری دانیشتوانو تەندروستییانو کشتوکاڵو لایەنی زانستی، لە کۆمەڵگایەکی گەورەدابێت یان لە کۆمەڵەیەکی بچوکدابێت، لەراستیدا دەتوانین لێکۆڵینەوە رووپێوەکە بگشتێنین، واتە ئەم رووپێوە هەموو پێکهاتەو تاکەکانی کۆمەڵگە بگرێتەوە، ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە، کاتێکی درێژو هەوڵدانو پارەیەکی زۆری دەوێت، کە ئەم رووپێوە بە رێگەی وەرگرتنی (نمونە)ی چینێك یان توێژێکی دەبێت کە لێکۆڵینەوەی ژمارەیەکی

دیاریکراوی خەڵك لە سنووری ئەو کاتو هەوڵو توانایەی کە لای لێکۆڵەر هەیە، وەکو: لێکۆڵینەوەکەی کە فریدریك لوبلای[1] لەسەر خێزانی کرێکارەکان لە هێندێك ناوچەی ئەورووپادا کردی.

زۆربەی ئەو ئامێرە بلاوانەی کە لە رووپێوی کۆمەلایەتی کۆلیار بەکاریدەهێنێت ئەمانەن:

(تێبینی – چاوپێکەوتن – [ زانیاری وەرگرتن ] – شیکاری ناوەرۆك)

بەلام گرنگترین هەنگاوەکانی روپێوی کۆمەلایەتی ئەمانەن:

١) نەخشەی پلانو دیاریکردنی ئامانج لە مالینەکەداو دیاریکردنی گرنگترین ئەو خالانەی کە لێکۆڵینەوەکە دەیگرێتە خۆیو دیاریکردنی زاراوەکانو ئەو ئامێرانەی کە بۆ لێکۆڵینەوەکە بەکاریاندەهێنێت، بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکانو کێشانیانو دیاریکردنی بوارەکانیو شوێنو کادرەکانی لێکۆڵینەوەکە.

٢) کۆکردنەوەی زانیاری.

٣) شیکارکردنی زانیارییەکانو ...... دارشتنو شیکاری بە شێوەیەکی ئامارییانە.

٤) خستنەڕووی ئەنجامو نوسینی راپۆرت.

---

[1] فریدریك لوبلای —Frederic Leplay (١٨٠٦-١٨٨٢)، ئەندازیارو زانایەکی کۆمەڵناسیی فەرەنسییە، گرنگترین بەرهەمەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیە بوو کە لەسەر باری کۆمەلایەتیو ئابوری (٣٠٠) خێزانی کرێکاری پیشەسازی ئەوروپی کردو ساڵی (١٨٥٥) بلاویکردەوەو ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئەم پاڵینا بە (چالس بوز)ەوە کە لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی کاردانەوەی هەژاری لەسەر مرۆڤ بکات. — و –

**دووەم / پەیڕەوی لێکۆڵینەوەی بار** (Case Study Method)

بە فەرەنسی پێیدەوترێت پەیڕەوی مۆنۆگرافی (Methods Monographique) (وەسفکردنی یان باسی بابەتی تاکێك، یان لێکۆڵینەوەی یەکەیەك) وەکو خێزان یان هۆز یان کارگە، بە لێکۆڵینەوەیەکی درێژو پانو چڕوپڕ بۆ دەرخستنی لایەنە جۆربەجۆرەکان بۆ گەیشتن بە یاساو رێساو گشتاندنێك کە بچەسپێ لەگەڵ یەکە لەیەکچووەکانی، جگە لە خۆی.

بەڵام زانا ئەمریکییەکان چەند پێناسەیەکی جۆراوجۆریان بۆ پەیڕەوی لێکۆڵینەوەی (بار) داناوە، زۆرینەی ئەم پێناسانە لەسەر ئەوە کۆکن کە پەیڕەوی لێکۆڵینەوەی بار ئەو پێڕەوەیە روودەکاتە کۆکردنەوەی زانیارییە زانستییەکان، کە پەیوەندیدارن بە هەر یەکەیەکەوە، ئایا تاك بێت یان دامەزراو، یان سیستمێکی کۆمەڵایەتی، یان کۆمەڵگەیەکی ناوخۆیی، یان کۆمەڵێکی گشتی بێت. هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ بۆ قۆناغێکی دیاریکراوی مێژووی یەکەیەك یان لێکۆڵینەوەی هەموو ئەو قۆناغانەی کە تیپەڕبوون بە مەبەستی گەیشتن بە چوارچێوەیەکی زانستی پەیوەندیدار بە یەکەیەکی لێکۆڵراوەوە، دەیگۆڕێت بۆ یەکە لە یەکچووەکان.

هەروەها پەیڕەوی لێکۆڵینەوەی بار، لە زۆر کۆنەوە لە زۆر بوارو بۆ مەبەستی جیاواز بەکارهێنراوە، زانا مرۆناسو کۆمەڵناسو دەروونزانەکان کە لە مەیدانی راژە (خدمة)ی کۆمەڵایەتیدا کاردەکەن بە کاریانهێناوە، وەکو چۆن پیاوانی رۆژنامەنوسو یاساو زۆرێکی تریش جگە لەمان بەکاریانهێناوە، تەنها هێندە نەبێت، کەوا هەر کەسێ لەمانە رێوشوێنو ئامانجی تایبەتی خۆی هەبووە لە لێکۆڵینەوەکەیدا کە لەوانەیە پێچەوانەی ئامانجەکانی ئەوانی دیکە بووبێت.

بەکارهێنانی ئەم پەیڕەوە لەم بارانەی خوارەوەدا پێویستە:

١- بۆ لێکۆڵینەوە درێژخایەنەکان و بۆ چەند هەڵویستێکی جیاواز لە بوارە کۆمەڵایەتیو شارستانییەکانداو بە هەموو ئەوانەوە کە شارستانێتی دەیگرێتە خۆی لە دابو نەریتو بەها کۆمەڵایەتیو بیروبۆچوونەکانو ئەو روکارانەی کە بڵاون.

٢- بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی پەرەسەندنی شتێك یان هەڵویستێکی دیاریکراو.

٣- بۆ زانینی باری ژیانی ناوخۆی کەسێك بە لێکۆڵینەوەی پێویستییە کۆمەڵایەتییەکانیو گرنگیدانو هاندەرەکانی، لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەو کەسە بە ئەندامێکی کۆمەڵ دادەنرێت کە لەگەڵیاندا دەژیو تێکەڵاویان دەبێت لەچوارچێوەی شارستانێتییە گشتییەکەدا.

٤- بۆ وەستان لەسەر ئەو هۆکارە ئاڵۆزکاوو بەیەکداچوانەی کە دەتوانین بەکاریانبهێنین لە وەسفکردنو شیتەڵکردنی ئەو کردارە کۆمەڵایەتییانەی کە لە ئەنجامی روودانی پێکداچوونی کۆمەڵایەتییەوە لەنێوان تاکەکاندا دەرکەوتووە.

ئەم پەیڕەوی لێکۆڵینەوەی بارە، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەداو دەرکەوت، کاتێك (لۆپلای) ویستی لەباری خێزانە ئیشکەرەکان بکۆڵێتەوە لە فەرەنسادا.

لە لێکۆڵینەوەی بارە تاکییەکاندا پێویستە جەخت لەسەر ئەم خاڵانە بکەینەوە:

١- کۆکردنەوەی زانیاریی تەواو، واتا دەەبێت بە شێوەیەکی وردو قوڵ لە بوارە جۆراوجۆرەکانی باردا کە هەموو لایەنە دەروونیو ژیریو تەندروستیو زانسیتو کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکان بگرێتە خۆی.

٢- راستیی زانیارییەکان، واتا / دڵنیابوون لە راستیی زانیارییەکان، بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکان.
٣- مسۆگەرکردنی بڵاونەکردنەوەی نهێنی زانیارییەکان بۆ کەسانی دیکە.
٤- مسۆگەرکردنی ئامۆژگارییە زانستییەکان بە جۆرێك رێکبکەوێت لەگەڵ ئەو ئەنجامانەی کە لێکۆڵەرەوەکە پێیدەگات.

بەڵام هۆکارەکانی کۆکردنەوەی زانیاریی لە بارە تاکییەکاندا بریتییە لە تێبینیکردنو چاوپێکەوتنو بەڵگەنامە کەسێتییەکان، واتە مێژووی ژیانو هەڵسوکەوتو وتارەکانی.

**سێیەم / پەیڕەوی مێژوویی:**

گرنگی زانینی مێژوو لەوەدایە کە هەوڵێکە بۆ گێڕانەوەی ئەو زانیارییانەی کە لە رابردوودا هەبوون بۆ خەیاڵمان بە شێوەیەکی کرداری رووتو بە شێوەیەك کە رووداوەکانی مێژوو بەسەریدا هاتووە. بەڵام بەکارهێنانی پەیڕەوی مێژوویی لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا واتای گەیشتنە بە بنەماو یاسا گشتییەکان، لە رێگەی لێکۆڵینەوەی رووداوە مێژووییەکانی رابردووەوە شیکاریی ئەو راستییانەی کە پەیوەندی هەیە بە گرفتە کۆمەڵایەتییەکانو هێزە کۆمەڵایەتییەکانو ئەوانەی ئەم بارەی ئێستایان دروستکردووە.

ئێمە دەمانەوێت ئەو بارە دیاریبکەین کە دەوری کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکان یان رواڵەتێك لە رواڵەتەکانی داوە، هەر لە سەرەتای گەشەکردنییەوە، ئەمەش بۆ زانینی سروشتەکەیو ئەو لایەنانەی کە ملکەچدەبن بۆ یاساکان. ئێمە دوای پەرەسەندنی مێژوویی دەکەوین بۆ ئەوەی بینای کردارە کۆمەڵایەتییەکان بگەڕێنینەوە بۆ ئێستاو

بیبەستین بە رابردووەوەو لە هێزە کۆمەڵایەتییە سەرەتاییەکان تێبگەین، کە ئەم بارەی ئێستای دروستکردووە، ئەمەش بە مەبەستی گەیشتن بە دانانی بنەماو یاسا گشتییەکان کە پەیوەندییان بە رەفتاری مرۆڤو کەسو کۆمەڵو رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە.

(ئیبن خەلدون، ڤیکۆ، سانسیمۆن، ئۆگست کۆمت) لە پێشەواکانی پەیڕەوی مێژوویین.

## چوارەم / پەیڕەوی تاقیکاریی:

دەتوانین هەموو روداوێکی کۆمەڵایەتی بە تاقیکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتی دابنێین، یان وەکو ئیبن خەلدون دەڵێت: رواڵەتێکە یان کارێکە لە چەند جارێك بە چەند رادەیەکی فرەو جیاواز دووبارەدەبێتەوە، ئەویش زانین، یان گومانی لێپەیداکردن، لەسەر ئەم بنەمایە، پەیڕەوی تاقیکاریی کۆمەڵایەتی تەنها پەیڕەوە کە لە لێکۆڵینەوەی رواڵەتو رووداوە کۆمەڵایەتییە رابردووەکاندا بەکاردەهێنرێت. بەگوێرەی ئەوەی کە تاقیکردنەوەیەکی لاوەکییە (عرضية)، دەتوانین بیکەینە بەڵگە بۆ دانانی یاساو داتاشینی تیۆرە کۆمەڵایەتییەکانو دروستکردنی گریمانی کۆمەڵایەتی.

دکتۆر (حسن ساعاتي)[1] ئەم جۆرە بەڵگانەی کە لەسەر تێبینییە کۆمەڵایەتییە هەستکراوەکان کە لە رابردوودا داڕێژراونو بینراونو تۆمارکراون، بوونەتە مێژوو بۆ ئێمە، بە پەیڕەوی تاقیکاری راستەقینەی دادەنێت، ئەوانەش وەکو ژنهێنانو جیابوونەوەو

---

[1] حسن الساعاتي – تصميم البحوث الاجتماعية، دار النهضة العربية، بيروت ١٩٨٢، ص ١٤٤.

بێوەژنکەوتنو بێئیشیو تاوانی تایبەت، کە لە تۆمارگەکاندا تۆمارکراون، یان لە شێوەی ئامارێکی بڵاوکراوەی یاساییدا تەنانەت هێندێك لە دیاردەکان کە تۆمارکراون بە تۆمارێکی چۆنێتی (کیفیة)و ئەمەش لە کاتی هەڵسوکەوتیدا لەسەر شێوەی باری تاکەکەسی لەنێوان کۆمەڵە مرۆڤێکدا بڵاودەبێتەوە.

هەروەها دەتوانین پەیڕەوی تاقیکاری بەکاربهێنین لە لێکۆڵینەوەی ئەو رواڵەتو رووداوە کتوپڕانەی کە دەتوانرێت بەهۆی هۆکارەکانی کۆکردنەوەی زانیارییە جیاوازەکانەوە تۆماربکرێن، وەکو تێبینیو چاوپێکەوتن، زانیاری کۆکردنەوە، ئەو تاقیکردنەوەی کە بە کرداری لە ژیاندا بەسەردا هاتووە کە توێژینەیەوەکی تاقیکارییە (امبیریقیة)، ئەوانەی کە نەریتو پێوانە کۆمەڵایەتییەکانە دیاریدەکەنو لێیاندەکۆڵنەوە، ئەوانەی کە رەفتاری کۆمەڵایەتی ئاڕاستەدەکەنو خوڕەوشتو باوو دابونەریت دەتەرزێنێن.

جاری وا هەیە (لێکۆڵیارەکە) روکارێکی وەسفی، یان بەڵگەیی دەگرێتەبەر، جاری واش هەیە هەردوو روکارەکە پێکەوە دەگرێت، جاری وا هەیە رێڕەوێکی چۆنی یان چەندی (کیفیاً وکمیاً) دەگرێتە بەر. لەم جۆرە دیاردە (رواڵەتە) کۆمەڵایەتییەدا تاقیکاری کارێکی نەکردەیە، چونکە ناتوانرێت رەفتاری مرۆڤ دابینبکرێت بۆ ژێر رکێفی لێکۆڵیارەکە، یان زانا کۆمەڵایەتییەکە، زانای کۆمەڵایەتی هەرگیز ناتوانێت منداڵان پێبگەیەنێتو فێریانبکاتو ژنو ژنخوازی لە نێوانیاندا بکاتو بەها کۆمەڵایەتییەکانیان لە نێوانیاندا لەسەر پلانێکی دیاریکراو بڕسکێنێت، بۆ تاقیکردنەوەیەکی ئامانجێکی دیاریکراو کۆنترۆڵیان بکات.

**تاقیکاری:** دیاردەیەکە یان راستییەکە لەخۆوەو بەبێ ویستی مرۆڤ روودەدات، کە توێژیار بە رێگەیەکی زانستی کاریتێدادەکاتو ئەنجامەکانی تێبینیدەکاتو ئەوەی بتوانرێ بپێورێو گشتی بکرێت لە تیۆرەکانو یاساکانو دەیاننرخێنێت. (حسن ساعاتي)[2] بەم پەیرەوی تاقیکارییە دەڵێت (تاقیکاری) ئەم پەیرەوە بەکاردەهێنرێت لە توێژینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا کە لە کۆمەڵگەدا روودەدات، وەکو رووداوی ئاژاوەگێڕیو مانگرتنو خۆپیشاندان، هەشیانە ئەنجامی رووداوە سروشتییە تێکشکێنەرەکانی وەکو لافاوو بوومەلەرزەو گڕکانەوە روودەدات، هەروەها جەنگەکانو هەموو ئەو کارەساتانەی کە لەگەڵ خۆیاندا نەهامەتی دەهێنێت لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشت بە رێگای تێبینیو بەڵگەهێنانەوەو رووپێوی کۆمەڵایەتیو لێکۆڵینەوە بارو تا رادەیەك ئامارییەکان، دەبەستێت.

---

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٥

# دەروازەی دووەم

## بەشی دووەم

- ئامێرەکانی زانیاری کۆکردنەوە
- تێبینیو تاقیکاری.
- پێوانە دەروونییە بەسەرابڕاوەکان.
- بەڵگەنامەو تۆمارە سەرژمێرییەکان.
- شیکاری ناوەڕۆك.
- چاوپێکەوتنو زانیاری وەرگرتن.
- ڕەوشە گشتییەکانی چاوپێکەوتن.
- گرنگترین هەڵوێستەکان.

# دەروازەی دووەم

## بەشی دووەم

### ئامێرەکانی زانیاری کۆکردنەوە:

ئەو زانیارییانەی کە لێکۆڵیار کۆیاندەکاتەوە، پەیوەندییان هەیە بە ڕواڵەتە دەروونیو کۆمەڵایەتییەکانەوە، کە لێکۆڵیار جەختی لەسەر دەکاتو هەوڵدەدات بگات بە ڕاستییەکان، ئەمەیش لە کۆمەڵەیەکدا یان لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا کە لێکۆڵیار دەتوانێت پەی پێبەرێت (هەستی پێبکات). بەڵام ئەو هۆکارانەی کە ڕێگەیەکی زانستی لە لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا دەردەخەن دۆخەکەیە، واتا:

هەڵسوکەوتکردنی لێکۆڵیار لەگەڵ ڕواڵەتە کۆمەڵایەتییە هەنوکەییەکەدا.

واتای تاقیکاری: ئەوەیە کە ڕواڵەتەکە، ڕواڵەتێکی هەستپێکراوەو دەتوانرێ تاقیبکرێتەوە. بەڵام بەلایەن نەریتو باوی کۆمەڵایەتییەوە لە کۆمەڵێکدا یان لە کۆمەڵگادا، دەتوانێت بیناسێتەوە بەهۆی ڕیزبەندیو ڕەنگدانەوەیان لە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا، کە دەبێتە خوڕەوشتێکی کۆمەڵایەتیو لەسەر دووبارەبوونەوەییو خوڕەوشتی باو، دابونەریت دەچەسپێت[1]، دەروونزانیی کۆمەڵایەتی گرنگیدەدات بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان، بەزۆری ڕوودەکاتە بەراوردکاریو تاقیکاریو جێبەجێکردن، هەروەها ڕوودەکاتە لێکۆڵینەوەی بینگەیی (کلینیکی).[2]

بەڵام باشترین هۆکار بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی، تێبینیو تاقیکردنەوەیە، ئەمە سودمان پێدەکەیەنێت لە کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانەی کە پەیوەندییان هەیە بە هێندێك ڕەفتاری کرداری تاکەوە لە هەڵوێستی ڕاستی ژیاندا. هەروەها

---

(١) حسن الساعاتي، تصميم البحوث الاجتماعية، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٢، ص ١٥٠.

(٢) Y- Castellan, Inition . ala. Psychelogie, sociale Armand Colin, Paris, 1972, P. 25.

بەشێوەیەکی گشتی (تێبینیو تاقیکردنەوە) کەڵکمان پێدەگەیەنن لە لێکۆڵینەوە دۆزەرەکانو وەسفیو تاقیکارییەکاندا، هەروەکو چۆن تاقیکارییە دەروونییە بەسەردا بڕاوەکان سوودیان لە لێکۆڵینەوەی رەفتاری کۆمەڵایەتی مرۆڤدا هەیە، ئاوەهاش سوودیان هەیە لە دۆزینەوەی کاریگەری پەروەردە، لە قۆناغەکانی منداڵیداو کاریگەرێتییەکانی لەسەر کەسێتیو رەفتاریان. بەڵام زانیارییە بەڵگەنامەدارەکانو تۆمارکراوەکان لە بەدەستهێنانی زانیاری پێویست لەبارەی رابردووەوە سوودمەندن.

شیکاریی ناوەرۆك سوودمان پێدەگەیەنێت لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو شیکردنەوەی رای گشتیدا، چاوپێکەوتنو راوەرگرتنی کەسی بەرامبەری، ئەمانە سوودمان پێدەگەیەنن لە بەدەستهێنانی زانیاریی پەیوەندیدار بە بیروباوەڕی تاکەکانو روکارەکانیان، بەرەو بابەتێکی دیاریکراو، واتا لێکۆڵەر چەند پرسیارێك ئامادەدەکاتو روویاندەکاتە تاکە لێکۆڵراوەکان لە رێگەی چاوپێکەوتنەوە بۆ پڕکردنەوەی فۆرمی راوەرگرتن.

لەم بەشەدا ئەم ئامێرانە بە شێوەیەکی کورت باسدەکەین:

**یەکەم / تێبینیو تاقیکاریی:**

تێبینی، یان چاودێری رەفتارە کۆمەڵایەتییە تاقیکراوەکان بە شێوەیەکی کرداری لە ژیانی رۆژانەیاندا، تێبینی سوودمان پێدەگەیەنێت لە لێکۆڵینەوە دۆزینەوەییو وەسفیو تاقیکارییەکاندا، بەڵام ئەوەندە هەیە لە هێندێك باردا ناتوانین ئەم هۆکارانە بەکاربهێنین لە کۆکردنەوەی زانیارییە پێویستەکاندا. لەبەرئەوە پێویستە لەسەر تۆژیار کە ئەمانە دیاریبکات:

١) ئەو دیاردەیەی کە پێویستە تێبینیبکات.
٢) چۆنێتی تۆمارکردنی تێبینییەکان.
٣) ئەو کارانە بکات کە پێویستن بۆ دڵنیابوون لە راستیو وردێتی تێبینییەکان.

٤) دیاریکردنی جۆری ئەو پەیوەندییەی کە لێکۆڵیار دەبەستێتەوە بە ڕواڵەتەکەوە، چۆنێتی دروستبوونی ئەو پەیوەندییە.[١]

بەڵام جۆرەکانی تێبینی ئەمانەن:

١- تێبینی ئاسایی:

بریتییە لە تێبینیکردنی ڕواڵەتێك کە لە بارێکی سروشتیدا لە خۆیەوە ڕوودەدات،
بەبێ ئەوەی بخرێتە ژێر ڕکێفی زانستییەوە. ئەوە لە لێکۆڵینەوە پشکنینییەکاندا، بۆ کۆکردنەوەی زانیارییە سەرەتاییەکانی کۆمەڵێکی تایبەتی خەڵك، لە ژینگەیەکی دیاریکراوداو لەژێر بارێکی دیاریکراودا بەکاردەهێنرێت، بۆئەوەی ڕێگەی ژیانیانو ڕواڵەتەکانی چالاکییان بناسرێت، وەکو لێکۆڵینەوەی چالاکیی قوتابی لە خوێندنگەکاندا، یان لێکۆڵینەوەی ژیانی کۆچکەران لە لادێوە بۆ شار. دەتوانین تێبینی ئاسایی ئەنجامبدەین بێ بەشداریکردنی لەگەڵ کەسە (لێکۆڵراو) تێبینیکراوەکەدا، یان بەبێ بەشداریکردنی لە چالاکییەکانی ڕۆژانەیاندا.

٢- تێبینی ڕێکخراو:

ئەم جۆرە تێبینییە لە لێکۆڵینەوەی وەسفیدا بەکاردەهێنرێتو لەو لێکۆڵینەوانەی
کە بە گریمانەیەکی هۆکاری تاقیدەکرێنەوە، تۆژیار چەند گریمانەیەك دادەنێت بۆ توێژینەوەکەو هەوڵدەدات لە ڕێگەی دانانی چەند

---

(١) عبدالباسط محمد حسن، أصول البحث الاجتماعي، مكتبة وهبة، القاهرة، ١٩٧٧، ص ٣٠٤-٣٠٥.

پرسیارێکی دیاریکراوەوە تاقیبکاتەوە، تۆژیارەکە هەوڵدەدات لە ڕێگەی تێبینیەوە بگات بە وەڵامەکانیان.

٣- لێرەدا ڕێگەی سێیەم هەیە بۆ تێبینی، کە دەگونجێ لە لێکۆڵینەوەی دەروونییو کۆمەڵایەتیدا بەکاربهێنرێت، کە ناونراوە بە (تێبینی ئاوێتە – المرکبة – )لێرەدا تۆژیار گرنگیدەدات بە تێبینیکردنی ڕەفتاری زارەکی (شفوي)و پەیوەندی بە کۆمەڵەکانو کۆمەڵگاوە، ئەمەش بۆ پێوانی ڕەفتارە پاشخانەکانیانو دووبارەبوونەوەیانو ڕەفتارە بەدوای یەکداهاتووە زانستییەکانو بنیاتی کۆمەڵایەتی وەکو تێبینیکردنی جوڵەی چاوی کەسە تێبینیکراوەکە، لەکاتێکدا هەڵدەچێت یان توشی دڵەراوکێ دەبێت. بەڵام مەبەست لە ڕەفتاری پاشخان، واتا تێبینیکردنی ڕەفتارێکی دیاریکراو کە لەسەر چەند تەرزە ڕەفتارێك، لە قۆناغەکانی پێشوودا بنیاتنراوەو پەیوەندییان بە ڕەفتاری ئێستەوە هەیە، (بۆ نموونە وەکو / پەنجەمژین، نینۆك کرۆشتن لای منداڵ، هستریا لای گەورەو ڕەفتارە بەدوای یەکداهاتووەکان، واتا: کردنی ڕەفتارێك لە داهاتوودا، لە ئەنجامی ڕەفتارێکدا کە ئێستا تێبینیکراوە کە دەیکات، (وەکو ڕەفتاری جگەرەکێشان کە لە داهاتوودا دەبێتە هۆی دەمارگیری. – و – )

**چوار جۆر ( جووڵە تێبینی – الملاحظة الحرکیة )مان هەیە**[1]:

١- **تێبینی زارەکیی**: تێبینی ڕەفتاری سەرزارەکییە لای لێکۆڵراوە کارلێککردووەکاندا.

٢- **تێبینی سەروو زارەکی** (الملاحظة ما فوق اللفظية): واتا تێبینیکردنی ئاستی دەنگبەرزی، دەنگدووری، کاتی (زمني)

(١) معن خليل عمر، الموضوعية والتحليل في البحث الاجتماعي، منشورات دار الآفاق الجديدة، بيرت ١٩٨٣، ص ١٩٢-١٩٣.

دەنگ، واتا ماوەی کاتی گورجیو سستی وتەکردن (نطق)و سەوداو زمانگیریی قسە (تلکؤ) لە قسەکردنو هەڵەکانی زماندا. هەروەها تێبینیکردنی رادەی دوو کەسی بەرامبەر بە یەك لەکاتی کارلەیەککردندا، تێبینی وشەکانی زمانو رستەکانو چۆنێتی پەیوەندی نێوان دەربڕینەکانی بیرۆکەکە.

٣- **تێبینی جووڵەی دەمو چاوو لەش:** تێبینیو هەوڵدان بۆ راڤەکردنی دەربڕینەکانو لێکدانەوەکانی تاك کە رەفتارێکە سیفەتێکی سەرزاری هەیە، جووڵەکانی دەمو چاو ئاماژەدەکەن بۆ کاریگەریی شارەزاییەکانی ئەو کەسە، بەڵام جوڵەکانی لەشولار زانیارییمان لەبارەی ئاستی پلەی کاریگەرییەکەوە دەداتێ.

٤- **بوارە تێبینی:** واتا پێوانەکردنی ئەو رووبەرەی کە لە نێوان تاکەکاندا هەیە لەکاتی کارلەیەککردنەکانیاندا، بەگوێرەی چینو پیشەیان.

٥- بەڵام تاقیکاری کۆمەڵایەتی، ئامێرێکە کە لێکۆڵیار لەرێگەیەوە دەتوانێت ئەو شوێنو کاتە دابینبکات کە لێکۆڵینەوەکەی تێدادەکات، بەپێی ئامانجی توێژینەوەکەو دەتوانێت جارێکیدی تاقیکارییەکان دووبارەبکاتەوە، دوای ئەوەی گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ بەسەر بابەتەکەو کاتو شوێنەکەیدا بهێنێت، بەجۆرێك بتوانێت بەراورد لەنێوان ئەو ئەنجامانەدا بکات کە دەستیکەوتوون، بۆئەوەی بتوانێت لەرێگەی تێبینی بەڵگەدارەوە کە داڕێژراوە، لەسەر تێبینی هەستکراو لە هەڵگوێزانی تیۆرەکانو یاسا کۆمەڵایەتییەکان، لەسەر رووناکی ئەم بەراوردکارییەو هەر لە رێگای بەراوردەوە توژیار دە[illegible]ت ئەو پەیوەندییە هۆکارییانەی

نێوان گۆڕدراوەکان (المتغیرات) ئاشکرابکات کە کاریگەرییان لەسەر یەکتری هەیە.[٢]

دەروونزانانی کۆمەڵایەتی جەخت لەسەر ئەو تاقیکارییانە دەکەنەوە کە لەسەر کۆمەڵەو کۆمەڵایەتییە بچووکەکان ئەنجامیاندەدەن، کە دەتوانین بیانکەین بە دوو بەشی بچووکەوە، کە یەکەمیان ملکەچبێت بۆ کارکەرەکان یان گۆڕدراوە سەربەخۆکان، بەڵام دووەمیان کۆمەڵی ڕێکخەرن کە دژایەتی ئەو گۆڕدراوانە ناکەنو لە ڕێگەی بەراوردەوە لەنێوان ڕەفتاری دوو کۆمەڵەدا تۆژیار دەگات بە دۆزینەوەو دانانی گریمانو یاساکان، کە دەتوانێت کاری کۆمەڵەکەو زیادبوونی چالاکییان دابیندەکات.

**دووەم / پێوانە دەروونییە (بەسەرابڕاوەکان):**

ئەم ئامێرانە لە لێکۆڵینەوەی کەسێتیو گرفتەکانی گونجاندنی دەروونیو کۆمەڵایەتیدا پشتیان پێدەبەسترێت، ئەمانە بریتین لە چەند ئامێرێك، ڕەفتاری خەڵکی ڕووندەکەنەوە، ئەو ئامێرانەی لەم بوارەدا بەکاردێن، بریتین لە یاریکردنو بوکەشووشەو هۆکاری وێنەڕەنگکردنو بارەکانی نواندنی، کە دەتوانێت لە ڕێگەی نواندنی ڕۆڵێکی دیاریکراوەوە پێیانبگەین.

تۆژیار دەتوانێت لە ڕێگەی ئەو یارییانەی کە مناڵەکە دەیکات کەسێتی بناسێتو ئاڕاستەکانی دیاریبکات، بۆ نموونە مناڵێك کە یاری بە بووکەشووشەیەك دەکات لەناکاودا فڕێیدەداتە شوێنێکەوە، پاشان لە دواییدا بە پەتێك رایدەکێشێتەوە، ئەم کردارە ئاماژەیە بۆ تۆرانی



(٢) حسن الساعاتي، تصميم البحوث الاجتماعية، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٢، ص ٢٣٤.

دایکیو هەستکردن بە کەمیی سۆزو خۆشەویستیو حەز بە گەڕانەوەی بۆ ماڵ.

پێوانەی پەڵەی مەرەکەبی (ڕۆرشاخ)و هۆیەکانی بەکارهێنانی وێنە، وەکو تێگەیشتنی (بابەت – الموضوع)، ئالێرەدا مشتومڕێك لە نێوان دەروونزانە تاقیکارییەکانو دەروونزانە چارەسەرییەکاندا لەبارەی چۆنێتی بەکارهێنانی ئەم هۆکارانەوە هەیە، چونکە دەروونزانە تاقیکارەکان باوەڕیان وایە کە پێویستە دەستبگیرێت بەسەر ئەو ئامێرانەداو ملکەچبکرێن بۆ پێوانەی لێکۆڵینەوەی تاقیکردنەوە.

بەڵام دەروونزانە چارەسەرییەکان رایان وایە، ئەو هۆکارانەی کە باسمانکردن بەها بەرزەکانیان لە دەستدەدەن، کاتێك هەوڵبدەین وەڵامەکانیان تاقیبکەینەوە. بەناوبانگترین پێوانە، پێوانەی پەڵە مەرەکەبی (ڕۆرشاخ)ە ئەوەی کە لەسەر دەستی پزیشکی ژیری سویسری (هێرمان ڕۆرشاخ)[1] بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٢١ ز گەشەیکردو چاپکرا. ئەم پێوانەیە دە کارتی سپی لاکێشەیی تێدایە، کە بەشێوەی زنجیرەی تایبەت دەخرێنە روو، هەموو یەکێك لەوانە (کارتەکان) پەڵەیەکی مەرەکەبی گەورەی لەسەرە، کە بە شێوەی دوو کەرتی بەرامبەر یەك دەردەکەوێت، ئەویش لە ئەنجامی دانانی پەڵە مەرەکەبەکەداو قەدکردنی کاغەزەکەدا دروستبووە.

هێندێك لەم وێنانە سێبەرەکانیان بۆرنو جیاوازن لەوانی دیکە، هێندێکی دیکە لەم یان ڕەنگاورەنگن، بە چەند ڕەنگێکی گونجاو، یان بە

---

(١) هێرمان ڕۆرشاخ: پزیشکێکی سویسری بوو، ساڵی ١٨٨٤ لە دایکبوو وە ساڵی ١٩٢٢ کۆچیدواییکرد.

چەند ڕەنگێکی نەگونجاو ڕەنگکراون، ئەمە بە شێوەی تاکی بەو کەسە دەدرێن بۆ ئەوەی چی تێدا بینی ڕاڤەیبکاتو دیاریبکات.

یەکێکی دیکە لە پێوانەکان، پێوانەکەی (مۆرایە[٢] – Murray ) بۆ تێگەیشتنی بابەتێك ساڵی ١٩٣٥ داینـاوە لـەم پێوانەیـەدا، چـەند پارچـەیەکی کـارتۆن بـە کەسـەکە دەدرێـت، کـە چـەند وێنەیـەکی ڕوونکراوەیان تێدایە، بەڵام هەڵوێستەکان تێیانـدا کـەمێك نادیـارن، یان کردەوەکـان تێیانـدا دیارینـەکراون، ئـەو کەسـە هەوڵـدەدات چـیرۆکێك لەبارەی وێنەکەوە بونیادبنێت، بەشێوەیەکی گشتی هـەواڵمان دەداتێ دەربارەی بەسەرابڕاوەکان هـەروەکو چۆن هەڵوێستەکە پێویستدەکات.
هـەروەها هەواڵمانـدەداتێ دەربـارەی ئـەو کارەسـاتانەی کـە هەڵوێسـتە وێنەدارەکەی لەسەری بنیادنراوە.

جاری وا هـەیە هـەواڵمان دەداتـێ لە ئەنجامە کۆتاییەکانی ئەو وێنانـە، هـەروەها تیپـە تۆمـارێکی هـەموو ئـەو چیرۆکانە دەکرێـت کـە کەسەکە بـە شێوەیەکی ڕێکوپێـك وتبێتـی (گێڕاوێتییـەوە)، وەکـو چۆن بیروبـاوەڕە بنەڕەتییـەکان شـیدەکاتەوە، وەکـو ئـارەزووی ڕەگـەزی خواسـتی پیشـەییو مشـتومڕە خێزانییـەکانو پلـە کۆمەڵایەتییـەکان... هتـد. لێـرەدا چـەند ژمارەیـەکی دیکـەی هۆکـاری بەسـەرابڕین هـەن، ئەوانـەش وەکـو پێوانـەی سـەرنەکەوتنی وێنـەدار (اختبـار الاخفـاق المصـور) کـە (ڕۆزیـن زوینـگ) ، سـاڵی (١٩٤٤ ز) داینـاوە، هـەروەها

---

[٢] هێنری مۆرای – Murray, Henry – ئەمریکی بوو، ساڵی ١٨٩٣ لەدایکبوو، لێکۆڵینەوەکانی لەسەر دۆزینەوەی کەسێتی ئاسایی بوو، پەرتوکەکانی (چەند دۆزینەوەیەکی کەسێتی) ساڵی ١٩٣٨ بڵاویکردەوە، (پێوانەی تێگەیشتنی بابەتەکان) لە ساڵی ١٩٤٣ بڵاویکردەوە، (نرخاندنی خەڵکی) ساڵی ١٩٤٨ بڵاویکردەوە. — و –

پێوانەی (زۆندی) لە ساڵی (١٩٣٠ز) داینـاوە، هـەروەها پێوانـەی رسـتە ناتـەواوەکان، لێـرەدا هۆکـاری بەسـەرابڕینی دیکەشـی هـەن. وەکـو لێکدانـــەوەی دەســـتنووس، لێکدانـــەوەی جووڵـــە دەربڕینـــەکان، وێنەکێشانو یاریکردنو سایکۆدراما.

### سێیەم / بەڵگەنامەو تۆمارە سەرژمێرییەکان:

هەموو بەڵگەنامەیەکی کەسێتیو یاساییەکان دەگرێتـەوە، بـەڵام گرنگترین سەرچاوە زانیاری سەرژمێرییەکانە، سەرژمێریی دانیشتوانو سەرژمێرییەکانی لەدایکبونو مردنو سەرژمێرییەکانی ژنهێنانو تەڵاقدان سـەرژمێرییە تایبەتییـەکانی وەك ئاسایشـی گشـتیو پـۆلیس. ئـەم بەڵگەنامانـەو تۆمـارە سـەرژمێرییانە لـە کۆکردنـەوەی زانیـاری، لـەکاتی بـەکارهێنانی پـەیڕەوی لێکۆڵینـەوەی (بـار)دا سـوودمان پێدەگەیـەنن، لەگەڵ هۆکاری تێبینیو چاوپێکەوتندا.

زانیارییـــە ئامارییـــەکان بـــەوە جیادەکرێنـــەوە کـــە تۆژیـــار بەشێوەیەکی جۆراوجۆر لە تۆمارە ئامارییەکانەوە وەریاندەگرێت، ئەمە سـەرەڕای ئـەوەی کـە کـاتو هـەوڵو پارەیـەکی زۆرمـان بـۆ دەگێڕێتـەوەو ئەنـدازەو قـەبارەی رواڵەتـەکانیش بـۆ تۆماردەکـات، لەگـەڵ ئـەو گۆڕانکارییانەی کە بە تێپەڕبوونی رۆژگار بەسەریدا هاتووە، بە روونیی دەریدەخاتو یارمەتیماندەدات لە زانینـی هۆکارەکانی ئەو گۆڕانکاریانە لەگـەڵ ئەنجامەکانیانـدا، لەگـەڵ ئەوەشـدا پەیوەنـدی ئـەو رواڵەتـە دەبەستێتەوە بـە رواڵەتـەکانی دیکـەوە ئـەو کاتـە، دەتوانرێـت کـەڵك وەربگیرێـت لـەو زانیارییـە ئامارییانـە لـە دروسـتکردنی گریمانـە پەیوەندیدارەکاندا، بە گرفتی لێکۆڵینەوەکە. هەروەها لە بواری بەکەڵکی گریمانە بابەتییەکاندا، وەکو یارمەتیماندەدات لە هەڵبـژاردنی توێـژی لێکۆڵینەوەو چۆنێتی دابەشکردنی لە کۆمەڵگە ئامارییەکاندا، هـەروەها

یارمەتیماندەدات لە دڵنیابوون لەو زانیارییانەی کە پێشتر کۆکراونەتەوە بەهۆی دیکەوە، وەکو تێبینیو چاوپێکەوتنو زانیاری وەرگرتنو تەواوکردنی ئەو زانیارییانە.

**چوارەم / شیکاریی ناوەرۆك:**

ئەو شێوازەیە کە ئامانجی وەسفکردنێکی بابەتیی رێکوپێکی چەندی ئەو ناوەرۆکە ئاشکرایەیە، واتا: شیکاریی ناوەرۆکی وێژەییو فیکری بەرهەمەکە. ئەم شێوازە لە وەسفی ناوەرۆکی بابەتی پەیوەندیدا بەکاردەهێنرێت، بەهۆی بایەخی ئەم بابەتەوە لە بواری تۆژینەوەی کۆمەڵایەتیدا، دەتوانرێت ناوەرۆکی رۆژنامەو کتێبو گفتوگۆو وێنەو فیلمی سینەماو بەرنامەکانی تەلەفزیۆن شیبکرێنەوە.

بەکارهێنانی ئەم شێوازە پشت بە سێ بنچینە دەبەستێت:

١- دەتوانرێت پاڵنەرو ئامانجەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیە دیاریبکرێت، کە لێکۆڵیار مەبەستی بووە.

٢- هەروەها دەتوانرێت کاریگەری ناوەرۆکی ئەو مادەیە بزانرێت لەسەر بیروباوەڕەکانی خەڵکو روکارەکانیان.

٣- نێرەرو وەرگر لە خاڵێکدا بەیەك دەکەن، ئەویش هاوبەشیکردنە، لە تەوەری یەك بایەخپێداندا.

**پێنجەم / چاوپێکەوتن[1] و زانیاری وەرگرتن:**

چاوپێکەوتن لێکۆڵینەوەکانی دەروونزانیی کۆمەڵایەتیدا بەکاردەهێنرێت، کە

---

(1) چاوپێکەوتن یان بەرامبەری بە زمانی فەرەنسی (LENTRITION) بەرامبەرەکەی لە زمانی ئینگلیزیدا (Interview) ، ( ن )

بیروباوەڕی خەڵکیو بۆچوونو ئارەزوو رەفتارەکانیان دەگرێتەوە، زۆربەی زۆری گرنگیپێدەرانی ئەم بوارە باوەڕیان وایە کە لێکۆڵینەوەو دیدەنیو لێپرسینی کەسەکان باشترین رێگەیە بۆ زانیاری کۆکردنەوە لەم بوارەدا، لەبەرئەوە گرنگییەکی تایبەتیی پێدەدەین، چاوپێکەوتن دەشێ چاوپێکەوتنێکی ئازادی ئاڕاستەنەکراوبێت. یان چاوپێکەوتنێکی وابەستە (مقید)، ئاڕاستەکراوبێت، کاتێك لێکۆڵەر پەنادەبات بۆ جۆری یەکەمیان، کە بە تەواوی سروشتی کۆمەڵ، یان ئەو کەسانەی لێیاندەکۆڵێتەوە نەزانێت. ئەویش زۆرجار دەکەوێتە پێش چاوپێکەوتنە وابەستەکەوە، ئەو کاتە لێکۆڵەر دەتوانێت لەبەر روناکی ئەو زانیارییانەی پێشتر کۆیکردوونەتەوە، بە رێگەی چاوپێکەوتنی ئازاد پرسیارەکان دیاریبکات. ماکۆگیو ماکۆبی Maccogy & Macoby پێناسەی چاوپێکەوتن بەوە دەکەن کە: کارلەیەککردنێکی سەرزارییە، لە نێوان دوو تاکدا لە هەڵوێستێکی روبەڕوودا بەرپادەبێت، کاتێك لایەنی یەکەم هەوڵدەدات هەندێ زانیاریو دەربڕین لای بەرانبەرەکەی بوروژێنێت کە پەیوەندییان بە شارەزاییو بیروڕاو بۆچوونەکانەوە هەیە. پۆلینج یۆنگ (P. Yong) پێناسەی چاوپێکەوتن دەکات بەوەی کە رێگایەکی رێکوپێکە، ئەو کەسە دەتوانێت رەوشتی ژیانی کەسێکی دیکە کە لای ئاشکرا نییە لێوەی بزانێت، هەروەها باوەڕی وایە کە ئەم رێگایە بە باشترین رێگا دادەنرێت لە لێکۆڵینەوەی دەروونیی کۆمەڵایەتیدا.

بەڵام: ئەنگلز / پێناسەی چاوپێکەوتن دەکات بەوەی گفتوگۆیەکە یاخود دەمەتەقێیەکی ئاڕاستەکراوە، کەسێك یان چەند کەسێك جێبەجێیدەکەن، مەبەستەکەی رۆشنکردنەوەی چەند زانیارییەکی

دیاریکراوە، بۆ سوودلێوەرگرتنی، لە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی، یان پەنابۆبردنی لە دیاریکردنو چارەسەرو ئاڕاستەکردندا.

بۆگاردۆس Bogardus/ ئاماژە بۆ ئەوەدەکات کە ناتوانێت لە هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکان بگەین، مەگەر لە ڕێگەی زانینی روکارو بیروباوەڕو ئەو دابو نەریتەوە نەبێت، لەسەریان دامەزراوەو ناتوانرێت روکارەکانو روودانی گۆڕانەکانی بناسرێتەوە لە ڕێگەی چاوپێکەوتنی تاکییەوە نەبێت.

چاوپێکەوتن ڕێگەیەکی ئاساییە، بۆ زانیاری کۆکردنەوە لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیدا، کە پشت بە کۆمەڵێ پرسیار یان وتووێژی ئاڕاستەکراو لەلایەن کەسێکەوە یان چەند کەسێك بەپێی پلانێکی دیاریکراو دەبەسێت، ئەمەش بە مەبەستی زانینی راو رەفتاری لایەنی دووەم بۆ مەبەستی کارتێکردنی.

چاوپێکەوتن سێ جۆرن:

١) هەواڵە چاوپێکەوتن ٢) مەبەستە یان پێویستە چاوپێکەوتن
٣) پشکنینە چاوپێکەوتن

ئامانج لە چاوپێکەوتنی هەواڵە چاوپێکەوتن سوودوەرگرتنە لە کەسانێك یان چەند کەسێکو پێدانی زانیاری لەلایەن کەسێکی دیکەوە یا زیاترەوە.

ئەمەش وەکو بارودۆخی ئاڕاستەکردنی رابەری پیشەیی یان وانەبێژ، بەڵام مەبەستە لە چاوپێکەوتنی مەبەستدار هاندانی کەسێك یان چەند کەسێك بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو، یاخود روودانی دژەکردارێکی دیاریکراو لەلای، وەکو خستنەڕوو (عرض)یەکی بازرگانی بە جوملە، کە مەبەستەکەی هاندانی بازرگانە تاکفرۆشەکانە بۆ شتومەك کڕین یاخود پزیشکێکی دەروونشیکار کە دەچێتە بواری

لێکۆڵینەوەو گفتوگۆ لەگەڵ نەخۆشێکدا بە مەبەستی گەیشتن بە زانینی هۆی ماندووبوون و نەخۆشییەکەییو دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆی، بەڵام پشکنینە چاوپێکەوتن مەبەستی زانینی ڕاو تاقیکردنەوەی زانیاری کەسێکی دیاریکراو یان زیاترو ئەمەش وەکو تاقیکردنەوەی زارەکی یان ئەو پرسیارانەی، لەلایەن لێکۆڵەری پۆلیسەوە ئاڕاستەدەکرێت، یان ئەو پرسیارەی کە ئاڕاستەی کۆمەڵێکی دیاریکراو دەکرێ بۆ زانینی بارودۆخی دیاریکراو لە ژیانی خوێندکاردا.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر قورسە بە وردی ئەم سێ جۆرە چاوپێکەوتنە لە یەکتری جیابکرێنەوە، چونکە جاری وا هەیە لە پشکنینەوە دەگۆڕێت بۆ هەواڵە چاوپێکەوتن، هەروەها بە پێچەوانەوە جاری وا هەیە (تۆژیار) لەباتی ئەوەی هەوڵبدات بە شێوەی زانستی (لێتۆژراو)ەکە بناسێت کەچی بۆچوونی خۆی دەسەپێنێت.

**ڕەوشتە گشتییەکانی چاوپێکەوتن:**

چاوپێکەوتن بە هەموو جۆرە جیاوازییەکانیەوە لە سێ توخمی بنچینەیی پێکدێت، ئەوانیش لێکۆڵەر، لێکۆڵراو، هەڵوێستی چاوپێکەوتنەکەیە، ئەم سێ توخمە پەیوەندییەکی پتەویان پێکەوە هەیە. بە شێوەیەك کە کاریگەری هەیە بۆ سەر ئەنجامە گشتییەکانی چاوپێکەوتنەکەو پەیوەندی نێوان تۆژیارو تۆژراوەکە کاریگەری هەیە بۆ چاوپێکەوتنەکە، هەروەکو چۆن بواری هۆشیو فکریش کاریگەرییان هەیە، هەریەکەیان چەمکو وێنەیەکی تایبەتی هەیە، لەبارەی ئەوی دیکەیانەوە.

چەندێك بیروباوەڕی لێکۆڵیارو لێکۆڵراوەکە لە یەکترییەوە نزیکبێت، ئەوا کاری چاوپێکەوتنەکەو سەرکەوتنی ئاسانتردەکات، لێکۆڵەرو لێکۆڵراو لە کاتی لێدوانەکانیاندا بەهۆی ئەو چێوە

پێشینەییەوە (الاطار المرجعي)، لە ماوەی کارو هەڵوێستی چاوپێکەوتنەکەدا بۆیان دروستبووە، باشتر لەیەکدەگەن" بەلام هەڵوێست بریتییە لە شوێنی چاوپێکەوتنەکەو هەموو ئەو کەسانەی کە بە رێکەوت ئامادەن لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا، هەروەها ئەو ئامێرو شتومەکە یارمەتیدەرانەش دەگرێتەوە، وەکو فۆرمی چاوپێکەوتنو هۆکارەکانی وروژاندنو گونجاندن ... هتد.

چاوپێکەوتن، زانستو هونەرە، پشت بە چەند بنەماو سەرەتایەك دەبەستێت کە پێویستە لێکۆڵیار یان ژمێریار لەسەری رابهێنرێت بۆئەوەی کەشو بارودۆخێکی گونجاو ئامادەبکات بۆئەوەی یارمەتیبدات بۆ بەدەستهێنانی زانیارییەکان لە کەسە لێکۆڵراوەکان بە راستگۆییەوە. لێرەدا پێویستە لەسەر لێکۆڵیار کە پابەندبێت بەم بنەمایانەی کە دێن:-

١- زانینو دیاریکردنی ئامانج لە لێکۆڵینەوەکەو دیاریکردنی بەشێوەیەکی ورد پێش چاوپێکەوتنەکە.

٢- پاراستنی پرسیارەکانو ریزکردنیان، با لە فۆرمەکانیشدا تۆمارکرابێت.

٣- دوورکەوتنەوە لە جیاکاریو لایەنیگیریی لە هەڵبژاردنی لێکۆڵراوەکاندا.

٤- دروستکردنی راگرتنی پەیوەندییەکی خۆش لەگەڵ لێکۆڵراوەکاندا، بۆ دەستەبەرکردنی باوەڕو بەدەستهێنانی زانیاری راستودروست.

٥- ئاراستەکردنی پرسیارەکان بە روونیو لەسەرخۆو دووبارەکردنەوەیان، ئەگەر لێکۆڵراوەکان تێیاننەگەیشت.

٦- نابێت کاریگەرێتی لەسەر لێکۆڵراوەکەو وەلامەکانی هەبێت

٧- نووسینی وەڵامەکان وەکو خۆی، وەك چۆن لێکۆڵینەوەکە بەشێوەی پلەپلە دەنووسیت بەبێ دەستێوەردانو بیروباوەڕی کەسی.

٨- روونکردنەوەی هۆی وەڵامنەدانەوەو بەشێوەیەکی روونو بە درێژیی، ئەمجا بۆ ئەوەی کاری چاوپێکەوتنەکە بە رەوایی بڕوات، پێویستە لێکۆڵیار لەباری دەروونیو ژیریو کەسێتی لێکۆڵراوەکە بە باشی تێبگات.

بۆیە لاکاش - Layache[1] جیاوازیدەکات لە دووبار لە چاوپێکەوتنو هەڵوێست لە بارودۆخی لێکۆڵراودا. لە باری یەکەمیاندا سەیری ئەو کەسە دەکرێت وەکو شتێکی رەها، بەڵام لە باری دووەمیاندا لێکۆڵراو بە کەسێك (مرۆڤێك) دادەنرێت کە هەستوسۆزی تایبەتی هەیە، کە پێویستە لەسەر لێکۆڵیار تێیانبگاتو رێزیانبگرێت، دەروونزانیی کۆمەڵایەتی لە باری یەکەمیاندا بە زانستێکی سروشتی دادەنرێت، بەڵام لە باری دووەمیاندا بە زانستێکی مرۆڤایەتی دادەنرێت. بەڵام گرنگترین جیاوازییەکانی نێوان ئەم دووبارە ئەمانەی خوارەوەیە:

١- دەروونزانیی کۆمەڵایەتی وەکو زانستێکی سروشتی واتە دەروونزانیی رەفتار، کە گرنگی بە رەفتاری ئاشکرای ئەو کەسانە دەدات. بەڵام دەروونزانیی کۆمەڵایەتی، لەباری دووەمدا بایەخپێدانەکەی تەنها بە رەفتاری کەسەکە نییە، بەڵکو لەو هۆیانە دەکۆڵێتەوە کە بوونەتە هۆی ئەو جۆرە رەفتارکردنە، هەر وەك چۆن هەوڵدەدات لە هەڵوێستەکانی تاکو گرنگیی بۆچوونەکانی تێبگات.

٢- دەروونزانیی کۆمەڵایەتی سروشتی تاکی دیاریکردووە بەوەی لە چەند توخمێکی جیاواز پێکهاتووە، بەڵام دەروونزانیی کۆمەڵایەتی

---

[1] جان دینوجیە، محاضرات غیر منشورة. (ن)

مرۆڤی، تاکە کەس بە بەشێکی دابەشنەکراو دادەنێت، کە قبوڵی دابەشبوون ناکات.

٣- دەروونزانیی کۆمەڵایەتی سروشتی، هەوڵدەدات لە یاساکانی رەفتار تێبگات، بەڵام دەروونزانیی کۆمەڵایەتی مرۆڤی، هەوڵدەدات لە تاك تێبگاتو رادەی جۆشخواردنو گونجاندنی راکانی لەگەڵ رەفتارو کارەکانیا بزانێت.

٤- دەروونزانیی کۆمەڵایەتی سروشتیی بە کرۆکی دیاردەو رواڵەتە دەروونییەکان بە کارێکی فیسیۆلۆژیی دادەنرێت، بەڵام دەروونزانیی کۆمەڵایەتی مرۆڤی، گرنگیدەدات بە لێکۆڵینەوەی دەروونو ژیری تاکەکانو پێکهاتە کەسێتییەکانیان. (پێکهاتەی کەسێتی وەکو کاریگەری هەژاریو دوو دڵیو باری دەروونیو زیرەکیو تەمبەڵیو هۆشیاریو تەندروستیو پێکهاتەی بەشەکانی لەشو ... هتد – و –)

هێندێك لە لێکۆڵیارەکان جیاوازییانکردووە لە نێوان چاوپێکەوتنو زانیاری وەرگرتندا.

لەسەر ئەو بنەمایەی کە چاوپێکەوتن بەوە جیادەکرێتەوە کە دیاریکراونییە، وەکو فۆرمدابەشکردن یان بەدواداگەڕان، کە جەخت لەسەر پرسیاری ورد دەکەنەوەو وەڵامی وردو دیاریکراویش داوادەکەن. بەڵام ئاراستەی نوێ لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیدا جیاوازینەکردنووە لە نێوان ئەم دوو ئامێرەدا.

چونکە فۆرم بە ئامێرێکی ئاسایی چاولێکەری کۆن بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان دادەنێت، بەڵام چاوپێکەوتن رێگەیەکی نوێیە لە لێکۆڵینەوە دەروونیو کۆمەڵایەتییەکاندا، کە بە هۆیانەوە لێکۆڵیار دەتوانێت زانیاری ورد بەدەستبهێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لە یەك کاتدا پشت بە هەردوو رێگەکە ببەسترێت. چونکە

دژایەتی لە نێوانیاندا نابینین، بەڵکو تەواوکەری یەکترنو یەکتر پڕدەکەنەوە، هەرچەندە پشت دەبەسترێت بە دیدەنی ئازاد پێش داڕشتنی پرسیارەکانی فۆرمەکە.

چاوپێکەوتن یارمەتی وەرگێڕانی ئامانجەکانی لێکۆڵینەوەکە دەدات، بۆ چەند پرسیارێکی دیاریکراو، کە یارمەتیماندەدات بۆ بەدەستهێنانی زانیاری پێویست، بۆ دۆزینەوەی ئەو لایەنانەی کە ئامانجەکانی لێکۆڵینەوەکە دیاریکردوون. هەروەك چاوپێکەوتن یارمەتیماندەدات لەسەر وروژاندنی پاڵنەرەکانی وەڵامدانەوە لەلای لێکۆڵراوەکان، بەڵام فۆرمی زانیاری وەرگرتن، دەتوانین دایبنێین بە ئامێرێك بۆ زانیاری کۆکردنەوە.

هەندێ لەو گرفتانەی پەیوەندییان بە چاوپێکەوتنو زانیاری وەرگرتنەوە هەیە:

لێکۆڵیار هەوڵدەدات لە ڕێگەی چاوپێکەوتنەوە زانیاری لە تاکە وەرگرێت، وای لێبکات کە بتوانێت شێوەیەکی فراوان لە کەسێتیو کۆمەڵگای لێکۆڵراوەکە دروستبکات، چاوپێکەوتن یارمەتی لێکۆڵیار دەدات لەسەر تێگەیشتنی پاڵنەرو پێویستییەکان، هەروەك یارمەتیدەدات لەسەر داڕشتنی پرسیارەکانی زانیاری وەرگرتنەکاندا، بۆ ئەوەی لەبەر ڕۆشنایی ئەوە کە ئایا باشتر وایە پرسیارەکان بە زمانێکی گشتی باوبێت، یاخود بە زمانێکی تایبەتی پاراو دابنرێت، ئەم چاوپێکەوتنە یارمەتیماندەدات لە دیاریکردنی جۆرو ژمارەی پرسەکاندا.

پێویستە لەسەر لێکۆڵیار کە زانیاری هەبێت لەسەر ئەو چوارچێوە پێشینەییەی کە لێکۆڵراوەکە هەیەتی، کە لە کاتی پرسیارکردنەکەدا لیکۆڵیار پەیپێدەباتو هەستپێدەکات. بەڵام شێوازە

گشتییەکان کە لێکۆڵیار دەتوانێت پشتی پێببەستێت لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا.

١- پێویستە لێکۆڵیار هەوڵبدات پاڵنەری لێکۆڵراوەکە بوروژێنێت، بۆ قبوڵکردنی چاوپێکەوتنەکە، لە ڕێی لێکدانەوەی ئامانجەکانی توێژینەوەو پێناسینی دەستەی سەرپەرشتێکەی جەختیش بکاتەوە لەسەر نهێنیکردنی تەواوی ئەو زانیارییانەی کە وەریاندەگرێت.

٢- پێویستە بواری تەواوی لێکۆڵراو بدرێت، کە بە ئارەزووی خۆی بدوێو لێکۆڵیاریش بە بایەخو ئارامەوە گوێلێبگرێت بێ ئەوەی مشتومڕی لەگەڵدابکات، یان ئامۆژگارییبکات، یان ناڕەزایی دەربڕێتو ڕەخنەی لێبگرێت.

٣- ئەگەر ویسترا چاوپێکەوتنەکە تاقیبکرێتەوە، پێویستە هەمان پرسیار بە هەمان شێواز لە هەموو لێکۆڵراوەکان بکرێت، بەڵام ئەمەیش ڕێ لەوە ناگرێت کە واتای وشەو ڕستە گرانەکان ڕوونبکرێتەوە یان پرسیارەکان دوبارە بکرێنەوە بۆ ڕوونکردنەوەیان دەشێ وەلامی پرسیارەکان کەمو نادیاربن، لەو بارەدا پێویستە لێکۆڵیار هانی لێکۆڵراو بدات کە ناتەواوی زانیارییەکانی تەواوبکات کە بۆ توێژینەوەکە پێویستنو نادیارەکانیان ڕوونبکاتەوە، بێ ئەوەی زۆری لێبکرێت یان لایەنگری وتەکانی بکرێت.

٤- پێویستە لەسەر لێکۆڵیار، زانیارییەکان بەبێ گۆڕان تۆماربکات، سووربێت لەسەر تۆمارکردنی شوێنو بوارو هەندێ خاڵی سەرەکی وەکو باری ژنهێنانو پیشەو ژمارەی منداڵو ئەندامێتی کۆمەڵەکان لە فۆرمی ئامادەکراودا، بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ ژمارەدانان بۆ فۆرمەکان.
چاوپێکەوتنەکە لەوانەیە سەربەستو کراوەبێت، یاخود وابەستەبێت،

واتە پرسیاری وردی دیاریکراوی تێدابێت کە پێویستی بە وەڵامدانەوەی وردو دیاریکراو هەبێت.

هەروەها لەوانەیە نیمچە وابەستەبێت، واتا لێکۆڵیار خۆی ببەستێتەوە بە ژمارەیەکی دیاریکراوو لە پرسیار لەگەڵ بونی توانا لەسەر ئاڕاستەکردنی پرسیاری دیکەی لاوەکی، کە پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەکەوە هەبێت، بەڵام زانیاری وەرگرتن کە دەتوانرێت وەکو ئامێرێك یا هۆیەکی چاوپێکەوتن لە کۆبوونەوەی زانیارییەکاندا بەکاربهێنرێت.

دەتوانرێت پرسیارەکان بەم شێوەیەی خوارەوە بێت:

١- ئاڕاستەکردنی پرسیاری زانیاری وەرگرتنی کراوە رێ بە لێکۆڵراوەکە بدات بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی بە شێوەیەکی ئازادو سەربەست، واتە بەبێ دیاریکردنی وەڵام، کە لێکۆڵراو لەلایەن خۆیەوە لێیان هەڵبژێرێت، بە جۆرێك کە بگونجێ لەگەڵ راوبۆچوونی خۆیدا.

ئەم شێوە پرسیارانە یارمەتی لێکۆڵیار دەدات بۆ راوەستان لەسەر لایەنی ناوەکی (ویژدانی نێو دەروونی لێکۆڵراوەکە، بەڵام ئەو کێشەیەی کە لێرەدا رووبەڕووی لێکۆڵیار دەبێتەوە لەم شێوە پرسیارانەدا، ئەوەیە کە وەڵامەکانی لێکۆڵراوەکە جۆربەجۆرو دژاودژ دەبن، رێگەنادات بەشبەشو پۆلێنو شیبکرێتەوە.

٢- ئاڕاستەکردنی پرسیاری زانیاری وەرگرتنی داخراو کە واتا: لێکۆڵیار چەند پرسیارێك دەکات پێویستی بە وەڵامدانەوەی داخراوی دیاریکراو هەیە وەکو / بەڵێ، نەخێر، یان نازانم، ئەم چەشنە وەڵامانە بۆ لێکۆڵیار ریزکردنو پۆلێنو شیکاری وەڵامەکانی لێکۆڵراو کارێکی زۆر ئاسانە.

٣- ئاڕاستەکردنی پرسیاری زانیاری وەرگرتن کە وەڵامی چاوەڕوانکراوی لەگەڵدابێت، یان لێکۆڵیار پرسیار دەخاتە روو، پاشان وەڵامی ریزکراوی رێکوپێکو وابەستەی بەدوادا دێنێت کە ئەو وەڵامانە شتێکی تێدا بێت کە بگونجێ لەگەڵ بیرۆکەی پرسیارەکەدا، هەشیانە کە لەگەڵیدا ناگونجێت، رێگە بە لێکۆڵراو دەدرێت ئەو وەڵامانە هەڵبژێرێت کە بە راستی دەزانێت. ئەم شێوە پرسیارکردنە وەڵامدانەوەی لێکۆڵراوەکە ئاساندەکات، هەروەکو چۆن پۆلێنو شیکاری زانیارییەکانو ریزکردنیان بۆ لێکۆڵیار ئاساندەکات، سەرەڕای ئەوەی دراوی کەمتریشی تێدەچێتو زوتریش تەواودەبێت. پێویستە لەسەر پسپۆڕ لە چاوپێکەوتنو زانیاری وەرگرتنەکەدا، هەمان زمانو شێوازی قسەی لێکۆڵراوەکە بەکاربهێنێت، واتا شیاوو گونجاو نییە کە پرسیارێك ئاڕاستەی منداڵێك بکەین بە هەمان رێگەی پرسیارکردنەکە بۆ کەسێکی پێگەیشتووی رۆشنبیر. چاوپێکەوتنەکە پێویستی بە دوو شتی سەرەکی هەیە، کە رێزگرتنی کەسێتیو بیروڕای لێکۆڵراوەکەو لێتێگەیشتنی سەرنجو بۆچوونەکانێتی، تەنانەت هێندێك جار بۆ روونکردنەوەشی، واتا: لێرەدا هەڵوێستی تۆژیاریان بەرامبەر تا رادەیەکی زۆر لە هەڵوێستی پزیشکێکی دەروونی دەچێت لە چارەکردنی نەخۆشەکەیدا، بەهۆی دەستنیشانکردنی هۆیەکانی نەخۆشییەکەوە. هەڵوێستی کەسەکە لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیداو لە چاوپێکەوتنەکەدا، بە جیاوازیی جۆرەکانیو ئامانجەکانی دەگۆڕدرێتو رەنگە گرنگترین هەڵوێست لەم بوارەدا ئەمانە بن

١) **هەڵوێستی بڕیار** – Attitude de Decision/ مەبەست لەمە، دابەشکردنی لێکۆڵراو یان ئامارەپێدانی لێکۆڵراو، یان

بەسەرداسەپاندنی کارێکی دیاریکراو، یاخود نەگەڕانەوە لە کارێکی دیاریکراو، ئەمەش لە ڕێگەی ئاماژەبۆکردنەوە.

٢) **هەڵوێستی کۆمەك (اسنادی)** – Attitude de Support / واتە دەرخستنی گرنگیی کێشە پێشنیارکراوەکە، یان کەمکردنەوەی مەترسیی کێشەکەو هاندانی لێکۆڵراوەکەو یارمەتیدانی.

٣) **هەڵوێستی نرخاندن** – Attitude Evaluation / پێویستیدەکات هەڵوێستی لێکۆڵراو پەسەندبکەین، یان بە هەڵەی دابنێین.

٤) **هەڵوێستی پشکنین** – Attitude de' Enquete / پێویستە لەسەر لێکۆڵەر هەوڵبدات لێکۆڵینەوە بکات بۆ زانینی هەستو بیروبۆچوونی، وەکو ئەوەی لێبپرسێت: ئایا بە رای تۆ باشتر وایە کە پشووی خوێندن لە هاویندا بێت یاخود لە زستاندا.

٥) **هەڵوێستی راڤەکردنو روونکردنەوە** – Attitude de Interpretation / لێکۆڵیار لەم هەڵوێستەدا هەوڵدەدات کە لە رابردوو بکۆڵێتەوە بۆ شیکردنەوەیو تێگەیشتنی ئەو هاندەرە راستەقینەی کە پاڵی بەو کەسەوە ناوە کاری وا بکات.

٦) **هەڵوێستی پەییبردن** – Attitude de Comprehension / ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە تەنها لە لێکۆڵراو تێبگەین، بەڵکو ئاگادارکردنەوەیشی لەو بارەیەوە پێویستە، لێکۆڵیار هەوڵیشدەدات یارمەتی لێکۆڵراوەکە بدات لە روونکردنەوەی رای خۆیو یارمەتیشیدەدات بۆ دەربڕینی.

بۆ روونکردنەوەی ئەم هەڵوێستانە وا گریماندەکات کە لێکۆڵراوەکە وەڵامیدەداتەوە، بەوەی هەستدەکات کە کارەکەی پێویستی بە هەوڵو کۆششێکی زۆرە، لە سەروو وزەو توانای ئەوەوەیە، بەشێوەیەك پاڵییپێوەدەنێت لێی پاشگەزبێتەوە یاخود بیگۆڕێت بە کارێکی دیکە.

وەڵامی لێکۆڵەر لە بارودۆخی هەڵوێستی بڕیاردا بەم شێوەیە دەبێت:

١- پێویستە بڕیارێکی روونو ئاشکرا بە وەرگرتن، یان بە وەرنەگرتن بدەیت.

٢- بەڵام لە بارودۆخی هەڵوێستی کۆمەکدا دەڵێت: خۆت ئازاکەو کارەکەت وەربگرە، هەموو کارێك بەشی خۆی قورسەو گیروگرفتی هەیە، ئەوانەش چارەسەریان هەیەو وردەوردە نامێنێت.

٣- بەڵام لە بارودۆخی هەڵوێستی نرخاندندا داوای لێدەکرێت: کە هاوسەنگیبکات لە نێوان ئەرکی سەرشانیداو پێویستیی بەردەوامبوونی لە کارداو لەنێوان هەستو حەز لە کارکردنداو قێزلێبوونەوەی لە کارەکە.

٤- بەڵام لە هەڵوێستی پشکنیندا پێویستە لێکۆڵیار لە لێکۆڵراوەکە بکۆڵێتەوە، بپرسێ بۆ ئەوەی بزانێت کە ئاخۆ لێکۆڵراو ناچارە بە کارکردن یان نا؟ ئایا هیچ هۆکارێکی راستەقینە هەیە کە پاڵی پێوەبنێت، رقی لە کارەکەی ببێتەوە؟ یاخود ئەمە خەیاڵبلاوییەو پێویستی زۆری بە کارکردن هەیە.

٥- بەڵام لە هەڵوێستی راڤەکردندا / لێکۆڵیار هەوڵدەدات کە وەڵامی لێکۆڵراو بەم شێوەیەی خوارەوە بداتەوە:

هەستکردن بە لێپرسینەوە لە لایەکەوە، چۆنێتی شارەزاییو زانیاریت لەم کارە لە لایەکی دیکەوە، وات لێدەکات دوودڵ بیت لە بەردەوامبوون لە کارەکەتدا.

٦- بەڵام لە هەڵوێستی پەیپێبردندا لێکۆڵیار بە لێکۆڵراوەکە دەڵێت / بۆیە حەزناکەم واز لە کارەکەت بهێنیت، لەبەرئەوەی کاری باشتر زەحمەتە دەست بکەوێت، باش وایە لەسەر کارەکەی ئێستات بەردەوامبیت.

واتا پێویستە لەسەر لێکۆڵیار کە گوێشلکات بۆ لێکۆڵراوو ئاگاداربێت لە ناوەرۆکی گفتوگۆکەیو هەستی تێبگاتو هەوڵبدات هاوسۆزی بێت. پێویستە لە گرنگیی ئەو کارە ئاگاداریبکات بەوەی کە ئەو مرۆڤێکەو هەستو سۆزی خۆی هەیە، کە دەبێت لێکۆڵیار تێیبگات، ئەمە دەبێت سادەیی هەبێتو زۆر لە خۆی نەکاتو بەو زمانە لەگەڵ لێکۆڵراو بدوێ کە تێیبگات، لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز نابێت کارە بنەڕەتییەکەی خۆیو ئامانجەکەی لەبیربکات، کە دەیەوێت لەو چاوپێکەوتنەدا بیوروژێنێت.

بە کورتیی چاوپێکەوتنو زانیاری وەرگرتن، لە هۆکارە بەکارهاتووەکانن، لە کۆکردنەوەی زانیاری بۆ لێکۆڵینەوەی کەسێتیو لێکۆڵینەوەی ئاراستە دەروونییەکانو لێکۆڵینەوەی رای گشتیو لێکۆڵینەوەی هاندەرەکاندا.

# دەروازەی دووەم

## بەشی سێیەم

### ➢ هەڵبژاردنی نموونە

- ☐ چەند ڕێگەیەکی لێتوێژینەوە
- ☐ بنەماکانی هەڵبژاردنی نموونە
- ☐ هەڵبژاردنی نموونە لە کۆمەڵگە گونجاوەکاندا
- ☐ هەڵبژاردنی نموونە لە کۆمەڵگە نەگونجاوەکاندا
- ☐ ڕێگاکانی هەڵبژاردنی نموونە
- ☐ ڕێگەی بەراووردکاریی تاقیکردنەوەی ئەنقەست
- ☐ ڕێگەی کــۆتـــــا
- ☐ ڕێگەی چوونییەککردنی لەوانەکاری هەڵەشە
- ☐ سەرچاوەکانی هەڵەکردن لە هەڵبژاردنی نموونەدا
- ☐ هەنگاوەکانی هەڵبژاردنی نموونە
- ☐ جۆرەکانی نموونە

## هەڵبژاردنی نموونەی لێکۆڵینەوە (سەمپڵ)

لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییەکاندا بە شێوەیەکی گشتی، زەحمەتە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی گشتگیر بۆ تاکەکانی کۆمەڵ هەموو، لەبەرئەوە لێکۆڵەر ناچاردەبێت کە رازیببێت بە لێکۆڵینەوەی ژمارەیەکی دیاریکراو لە بارەکانی یان تاکەکانی. لەبەرئەوە دەتوانرێت رێگاکانی لێکۆڵینەوە، یان پشکنینی کۆمەڵایەتی پۆلێنبکەین بۆ ئەمانە:

١- **لێتوێژینەوەی جۆری:** بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی وەسفیی بۆ رواڵەتێك کە بە توێژێك، یان نموونەیەك دادەنرێت، واتا لێکۆڵینەوەی هێندێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە راستییەکە، لە رێگەی چاوپێکەوتنەوە، یان پرسیارکردنەوە، دوای ئەو ئەنجامەی کە پێیدەگەین گشتگیر دەکرێت بەسەر هەموو ئەو کۆمەڵگەیەی کە لێیوەرگیراوە. بەکارهێنای ئەم رێگەیە، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لەسەر دەستی فریدریك لابلای دەستپێیکرد.

ئەمەش لە کاتێکدا کە لە تایبەتمەندی هێندێك خێزانە کرێکارەکان، لە یەکێك لە ناوچە پیشەسازییەکان دەکۆڵێتەوە، کاتێك کە ژمارەیەکی دیاریکراوی لە خێزانەکان، وەکو / نموونەیەك یان توێژێك بۆ لێکۆڵینەوە هەڵبژارد، دوای ئەوە ئەنجامەکەی بەسەر کۆمەڵگەی خێزانەکاندا گشتگیرکرد.

یەکێك لە چاکییەکانی ئەم رێگەیە ئەوەیە کە پشت بە لێکۆڵینەوە راستییەکەو راستەوخۆکە دەبەستێت بۆ نمونەکە، بەلام ئەو رەخنەیەشی لێدەگیرێت کە پسپۆرەکە خۆی بە خۆی توێژەکە یان نموونەکە هەڵدەبژێرێت، کە وای بۆدەچێت هەموو ئەو سیفاتانەی تێدایە کە ئەو دەیەوێت دەیانخاتە روو، ئەو کارەی لێدەکەوێتەوە کە سیفەتە زانستییەکە لاوازبکات.

**٢- لێتوێژینەوەی چەندی، یان سەرژمێری ( ماڵینی گشتگیریی:** ئەم رێگە قورسە هێواشەو کاتێکی درێژدەخایەنێت، بوجەیەکی زۆریشی تێدەچێت، لەبەرئەوەی پشت بە لێکۆڵینەوەی هەموو یەکەکانی کۆمەڵ دەبەستێت بە شێوەیەکی گشتگیریی، وەکو: ئەو سەرژمێرییە گشتییەی کە دەوڵەتەکان ئەنجامیدەدەن، هەموو کاتێك بۆ لێکۆڵەر نالوێت کە لێکۆڵینەوەکانی بەم رێگەیە ئەنجامبدات، چونکە کارێکی زۆر گەورەیەو هەولێکی زۆری دەوێتو بوجەیەکی فرەی تێدەچێت.

**٣- رێگەی تێکهەڵکێش، یان لێکۆڵینەوە لەسەر نموونەی بەراوردکاریی:** ئەم رێگەیە نموونەیەك لەکۆمەڵگەکە بە شێوەی هەڵەشە هەڵدەبژێررێتو لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکاتو

ئەنجامەکەی لەسەر کۆمەڵگە گشتیدەکات. ئەم رێگەیە زۆرینەی جار ئەنجامی زۆر وردمان بەدەستدەخات، ئەگەر مەرجە پێویستەکانی تێدادروستبێت، ئەوانەش وەکو:

ئەوەی قەبارەی نموونەکە گەورەکەیت، ئەگەر کۆمەڵگەکە زۆر گونجاونەبوو، یان هەر گونجاونەبوو. رێگەی دروستکردنی نموونەکە ئەو کاتە دەبێت رێژەکەی لەگەڵ رێژەی یەکەکانی کۆمەڵگە راستییەکەدا یەکسانبێت، لەبەرئەوە ئەم رێگەیە هەردوو رێگەی گرتۆتە خۆی، چونکە نیشانەکانی جۆریی تێدا هەیە، وەکو لێکۆڵینەوەی باری دەروونیی، تاکو ناسینەوە لە نزیکەوە تێیدا هەیە، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەوە نیشانە باشەکانی چەندیشی هەر تێداهەیە، چونکە بە شێوەیەکی یەکسانی دەرفەت بۆ هەموو یەکە کۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەوەی لە نموونەکەدا یان لە توێژەکەدا دەرکەون، دەڕەخسێنێت. ئەمجا بۆ ئەوەی دەستکەوتی وردی جۆراوجۆری لە خەڵکی دەستدەکەوێت، پەنادەباتە بەر رێگەی دیدەنی کەسەکان، بە بێ دیاریکردنی تەمەنیانو

گوزەرانیانو باری فیکریو پیشە جۆراوجۆرەکانیان، لەگەڵ گفتوگۆی بێئاڕاسە لەگەڵیاندا.

ئەمەش بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی نزیکی لە سروشتی ئارەزووەکانی ئەو تاکو کۆمەڵەی کە لە ژێر لێکۆڵینەکەدان دەستکەوێتو بزانێت کاردانەوەیان چییە، چونکە بێئەوە ناتوانرێت پرسیاری پێویست دابنرێتو دیدەنی تایبەتی ئاڕاستەکراو بەکاربهێنرێت. دوای ئەوە لە قۆناغی دووەمدا پرسیار دانانو تاقیکردنەوەیان لەسەر چەند بڕێك لە خەڵکی، بە ڕاوەرگرتنێکی سەرەتایی دێتە پێشەوە. ئەمەش بۆ دڵنیابوونە لە رادەی شیاویانو رادەی پەسەنکردنیان لەلایەن خەڵکەوە، دوای ئەوە پرسیارەکان پاکژدەکرێن بۆئەوەی چەند وەلامێکی ئاشکرامان لەلایەن ئەو کەسانەی کە لێکۆڵینەوەکەیان لەسەر دەکەین دەستدەکەوێت.

ئەمجا بۆئەوەی هەڵبژاردنی توێژەکە یان نموونەکە، هەموو یەکەکانی کۆمەڵگەکە بنوێنێتو ئەنجامەکانی لێکۆڵیەوەکەش نزیکبن لە ئەنجامەکانی رێگە سەرژمێرێکەوە، پێویستە لەسەر ئەم بنەمایانە بێت:

١- قەبارەی نموونەکە گرنگییەکی زۆری هەیە، ئەگەر کۆمەڵگە هاوڕەگەز نەبوو، ئەوکاتە پێویستە قەبارەی نموونەکە بە گوێرەی پێویست زیادکرێت.

٢- پێویستە نموونەکە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە بە رێژەی لە ٩٨٪ بنوێنێتئە ئەم رێگەیە لە ئەمریکا لەکاتی هەڵبژاردنە سیاسییەکاندا، رۆژنامەنوسەکان بەکاریاندەهێنا. ئەم رێگەیە واتای حوکمدانە بەسەر گشتدا لە رێگەی بڕیاردان بەسەر کەمدا. هەروەها وەکو قوماشفرۆشو دانەوێڵەفرۆشەکان بەکاریدەهێنن.

٣- ئەگەر کۆمەڵگەکە هاوڕەگەز نەبوو، پێویستە ئەم رێگایانە بگرینەبەر:

**یەکەم: نموونەی هەڵبژاردنی بەراوردکاریی، یان ئەنقەست:**

نموونـە لـە بنەڕەتـدا پشـت بـە بۆچـوونی لێکۆڵـەر دەبەسـێت، لـە هەڵبـژاردنی ئـەو حاڵەتانـەی کە نموونـەی لێکۆڵینەوەکە دروسـتدەکەنو ئامانج لە لێکۆڵینەوەکە جێبەجێدەکەن. ئەو ڕێگەیەی کە بۆ هەڵبژاردنی (نموونەی ئەنقەست) دەگیرێت، بریتییە لەو حاڵەتانەی کە لێکۆڵەر بە باشی دەزانێت، بۆ کۆمەڵگەی لێکۆڵینەوەکەی، ئەمجا ئەوجیاوازییانەی کـە لـە ئـەنجامی ئـەم هەڵبژاردنـەدا ڕوودەدەن، هێنـدێکیان هاوکێشـەی هێنـدێکی دیکـەیانن، چـونکە هەڵبــژاردنی تاکـەکانی نموونەکـە بــە شێوەیەکی سەپێنراوە. ئەمجا لەبەرئەوە بە هێندێك وەریناگرن، چونکە هەل بۆ هەموو یەکەکان نارەخسێنێت، بۆئەوەی لە نموونەکەدا بنوێنن.

ئەو هێندە کەسە وا بە باش دەزانن کە پەناببرێت بۆ هەڵبژاردنی تاکەکانی نموونەکە بە شێوەیەکی هەڵەشەیی، بەبێ جیاوازیکردن لە نێـوان تاکـەکانی یەکەکـەدا. لەوانـە ئاسـانترین شـێوەی هەڵبــژاردنی هەڵەشەیی ڕێگەی (پشك) بێت، بۆ ئەو یەکانەی کە دەچنە نموونەکەوە، هـەروەکو چـۆن لـە ڕاکێشـانی یانەسـیبدا بەکاردەهێنرێتو دەرفـەت بـە هەموو تاکەکان دەدرێت بۆ دەرکەوتن لە چوونە نێو نموونەکەوە.

هەڵبــژاردنی نموونــەی بـەراوردکاریی بـەم ئامێرانـەی خـوارەوە دەبێت:

<u>١-١- ڕێگەی یەکـەی نموونـەیی:</u> بۆ ئـەوەی لێکۆڵـەر ئـەو نموونەیـە هەڵبـژێرێت کـە کۆمەڵگەکـەی بنوێنێـت، هەڵدەسێت کۆمەڵـە خێزانێـکی نموونەیی یان هـەرێمێکی نموونـەیی هەڵدەبژێرێت، دوای ئـەوە ڕەوشو سیفاتی ئەو خێزانانـە، یان ئەو ناو هەرێمـە تاوتوێدەکات، دوای ئـەوە ئەنجامەکەی بەسەر هەموو خێزانەکاندا یان بەسـەر هـەموو ناوچەکاندا گشتیدەکات، بۆ نموونە: ئەگـەر ویستمان لێکۆڵینەوەیـەکی سـەرژمێری

بۆ کشتوکاڵ لە عێراقدا بکەین، دەبێت هەموو تیپێك لە کەسە هونەرییەکانو جوگرافییەکانو کشتوکاڵییەکان پێکبێت، بۆ ئەوەی هەستن بە لێکۆڵینەوەی ناوچە دیاریکرواەکان، ئەو کاتە قەزایەکی نموونەیی لەو پارێزگایەدا هەڵدەبژێرن، کە ئەو شارەزایانە بە باشترین نموونەی دادەنێن، دوای ئەوە لێکۆڵینەوەی کشتوکاڵی لەسەر دەکەنو ئەنجامەکەی بەسەر هەموو کشتوکاڵی عێراقدا گشتیدەکەن.

لەو رەخنانەی کە ئاراستەی ئەم رێگەیە دەکرێت ئەوەیە کە بڕیارێکی زۆرەملێ هەیە لە هەڵبژاردنکەدا، چونکە لەسەر بنچینەیەکی سەرژمێری لێکۆڵراو دانەمەزراوە، چونکە بۆ لێکۆڵینەوەی کشتوکال لە عێراقدا، ئێمە ناتوانین پشت بە قەزای (الشامیة) ببەستین. لەبەرئەوەی ئەم قەزایە تەنها بە چاندنی برنج بەناوبانگە، لەگەڵ ئەوەشدا چەند ناوچەیەکی دیکەمان هەیە، پشت بە چاندنی گەنمو جۆ دەبەستن، یاخود مزرەمەنی، لەبەرئەوە دەبێت رێگەیەکی دیکە بەکاربهێنرێت، کە زیاتر کۆمەڵەکە بنوێنێت، باشوایە بەکارهێنانی ئەم رێگەیە تەرخانبکرێت بۆ لێکۆڵینەوە (استطلاع)ییەکان، یان ئەوانە پێیاندەوترێت تاقیکردنەوە بە مەبەستی زانینی ئەندازەی تێچوونی لێکۆڵینەوەکە، بۆئەوەی بیرۆکەیەکی خێرامان لەبارەی گرفتەکەوە دەستکەوێت.

**٢-١- رێگەی گۆتا (Quota) یان رێگەی بەش بەش:**

ئەم رێگەیە جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە پێویستە لەکاتی هەڵبژاردنی نموونەکەدا رەچاوی جیاوازی ئەو پێکهاتانە بکرێت، کە کۆمەڵگەکەی لێدروستبووە، وەکو تەمەن، رەگەز، خوێندەواریی، ناوچەی نیشتەجێبون، پلەو پایەی کۆمەڵایەتی، باری ئابوری، چونکە بەگوێرەی ئەوانە لێکۆڵەر پلانی خۆی دادەڕێژێت بەگوێرەی ئەوە

پرسیار ئاراستەی چەند تاکێکی دیارکراو دەکات، بۆ نموونە / ئەگەر دانیشتوانی عێراق پێکهاتبوو لە ٤٦ ٪ نێرو لە ٥٤ ٪ مێ، پێویستە نموونەکە ئاوێتەبێت لە ٤٦ ٪ نێرو لە ٥٤ ٪ مێ.

هەروەها ئەمە مەرجە بە گوێرەی تەمەنو ئاستی ئابوریو رۆشنبیریو بە رێژەی ئاینو بیروباوەڕی سیاسی... هتد، واتا: پێویستە هەمان جیاکاری نیشانە لە نموونەکەدا هەبێت، چونکە هەموو ناوچەیەك گرنگی خۆی لە رووی دانیشتوانەوە. بەڕاستی سەرپەرشیاری (إستبار – بەراوردکاری) یەکە ئاڕاستەی پشکێنەرەکان دەکاتو چۆنێتی پێکهاتنی نمونەکە دەکاتو لەگەڵ ئەوەشدا پشکیان دەکات، لە هەڵبژاردنی ئەوکەسانەی کە سیفاتە پێویستەکانیان تێدا زۆرە.

ئەم رێگەیە بەوە لە رێگەی پێشوتر جیادەبێتەوە، کە بە پلانێکی دیاریکراو بەستراوەتەوە، بەلام رەخنەی ئەوەیشی لێدەگیرێت کە سەربەستی دەدات بە پشکێنەرەکان لە هەڵبژاردنی کەسەکاندا، ئەو کاتە ئەو کەسانە هەڵدەبژێرن کە لە بیرکردنەوەو راکانو ئاستی رۆشنبیریو ئابوری لە خۆیانەوە نزیکن. لەبەرئەوە پێویستە پشکێنەرەکان لە خاوەن ڕا جیاوازەکانو ئاستە رۆشنبیریو ئابورییە جۆربەجۆرەکان هەڵبژێردرێن.

لەگەڵ ئەوەشدا هەلڕێکخستن بۆ هەموو یەکەکان بۆئەوەی لە نموونەکەدا دەرکەون کارێکی زۆر قورسە، ئەمەیە ئەو رەخنەیەی کە لەم رێگەیە دەگیرێت.

**دووەم / چونیەککردنی لەوانەکاری هەڵشە:**

واتای هەڵشە ئەوەیە کە دەرفەت بۆ هەموو تاکەکان بڕەخسێنێت، بۆ ئەوەی لە نموونەکەدا دەرکەون. دەتوانرێت بۆ ئەم مەبەستە خشتەی هەڵەشەیی یان هەر ڕێگەیەکی دیکە کە دەرفەتبدات بە هەموو تاکەکان بۆ ئەوەی لە نموونەکەدا وەدەرکەون. ئەوکاتە نموونەکە لەسەر بنچینەی یاسای (لەوانەکاری – الاحتمالیة) هەڵدەبژێررێت، کاتێك کە یەکەکان دوابەدوا رادەکێشرێن، هەر یەکێکیان لەوانەکاری زانراوی هەیە لە هەڵبژاردنەکەداو لەناوبردنیشدا، واتا: بە گوێرەی نەخشەیەکی ئاماری تەواو دەبێت.

بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێگەی هەڵبژاردنی نموونەدا لە خشتەی هەڵەشەییدا، وا گریماندەکەین کە ئێمە لێکۆڵینەوە لەسەر گوزەرانی خوێندکارانی بەشی کۆمەڵناسی بە ڕێگەی هەڵەشە هەڵدەبژێرین، ئەتوانین شوێنی ئەم هەنگاوانە کەوین:

١- لیستێك بە ناوی خوێندکارانی بەشی کۆمەڵناسییەوە پەیدادەکەین، ساڵی خوێندنەکەیان دیاریدەکەین، با بڵێین: ساڵی خوێندنی ١٩٨٥ – ١٩٨٦، سەرژمێری خوێندکارەکان دەکەین، با بڵێین ژمارەیان (١٠٠) سەد خوێندکارە.

٢- هەر ناوێك ژمارەیەکی زنجیرەداری دەدەینێ، با بڵێن لە (١ – ٢٠٠) دەگرێتەوە.

٣- قەبارەی نموونە داواکراوەکە دیاریدەکەین، با بڵێین بە ڕێژەی ١٠٪ ئەمەش واتای ئەوەیە کە:

$$\text{قەبارەی نموونەکە یەکسانە} = \frac{١٠ \times ٢٠٠}{١٠٠} = ٢٠$$

٤- خشتەی هەڵەشەیی[1] دەکەینەوە، بۆئەوەی (٢٠) بیست خوێندکارمان دەستبکەوێت، لەگەڵ ڕەچاورکردنی ئەوەی کە دەبێت ژمارەکان پێکبێت لە سێ ڕێنووس، چونکە گەورەترین ژمارە کە (٢٠٠)ە لە سێ خانە پێکهاتووە، لەبەرئەوەی هەموو دەرفەت بڕەخسێنین بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵە سەرژمێریکراوەکە، کە دەرکەوێت لە نموونەکەدا.

٥- دوای ئەوە بێئەوەی تەماشای هیچ ژمارەیەك بکەین، پەنجەمان لەسەر ژمارەیەك لەو ژمارە هەڵەشییانە دادەنێین، بۆ نموونە ئەگەر هاتوو ژمارەکە ژمارە (١٧٤) بوو لە کۆمەڵەی سێیەم دێڕی سێیەم بێگومان نموونەی هەیە لە بەرنامە بنچینەییەکەدا، لە لاپەڕەیەکدا وەکو ناوی یەکەم لە نموونەکەدا تۆماریدەکەین، دوای ئەوە ناوەکانی دیکە بە شێوەیەکی ئەستونی یان ئاسۆیی تۆماردەکەین لەگەڵ دورخستنەوەی ئەو ژمارانەی لە (٢٠٠) زیاترن.

باشییەکانی ڕێگەی هەڵبژاردنی نمونەی لەوانەکاری، ئەوەیە کە توانای لەسەر دیاریکردنی ڕادەی (احتمال) ی دەرکەوتنی هەموو تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵگەکەی هەیە لە نموونەکەدا، بە هۆیەوە نموونەکە بە ڕێگەیەکی هەڵەشەیی بەبێ جیاوازی لە نێوان تاکەکاندا هەڵدەبژێررێت، بەڵکو هەلێکی یەکسانی بە هەموو تاکەکان دەدرێت، بۆئەوەی لە نموونەکەدا دەرکەون، نە لێکۆڵەر نە پێکهاتەکانی نموونەکە دەستێوەردانیان هەیە لە هەڵبژاردنەکەدا، بەڵکو ڕێکەوت دەیسەپێنێت.

---

[1] بۆ زیاتر تێگەیشتن لە خشتەی هەڵەشەیی، دەتوانن تەماشای کتێبی (مناهج البحث في التربية وعلم النفس)، نوسینی د. جابر عبدالحميد جابر، چاپی ١، قاهیرە، ل ٢٢٨-٤٥٠ بکەن. — و -

ئاسانترین شێوە بۆ ئەم ڕێگەیە ڕێگەی پشککردنە (خۆوبەخت) ئەوەی لە ڕاکێشانی یانەسیبەکاندا بەکاردەهێنرێت، وەکو ئەوەی هەموو ناوەکان لە سندوقێکدا، یان دەفرێکدا دادەنرێتو ژمارەیەکی دیاریکراوی لێڕادەکێشرێت. دەتوانرێت پەناببرێت بۆ هەر شێوازێکی دیکە لە هەڵبژاردنی تاکەکاندا، بە مەرجێك، ئەگەر لایەنگیریی تێدانەبێت. ئەو شێوازانە وەکو / بەکارهێنانی لیستی ناوەکان.

بۆ نمونە / ئەگەر ویستمان لێکۆڵینەوەی بارەکانی خوێندکارانی زانکۆ بکەینو ژمارەی ئەوان (٥٠٠٠) پێنج هەزار خوێندکار بوون، نمونەیەك لە (٥٠٠) پێنجسەد خوێندکار رادەکێشین ، لە ڕێگەی لیستی ناوەکانەوە، بەگوێرەی پیتی (ئەبجەد)ی ژمارەکانی: ١ – ١١ – ٢١ – ٣١...هتد هەلدەبژێرین، یان ژمارەکانی ٥ – ١٥ – ٢٥ ... هتد هەڵدەبژێرین.

واتا / پێویستە جیاوازی نێوان هەموو هەڵبژێرراوێکو ئەوەی لە دوایەوە دێت بەتەواوەتی یەکسانبن. ئەم ڕێگەیە کاتێك باشە کە لێکۆڵینەوەکان لەسەر کۆمەڵێکی دیاریکراوبێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێدەکەوێت لایەنگیریی تێدادەبێت، وەکو / پەنابردن بۆ ئەم ڕێگەیە کە لیستی تەلەفۆن بەکاربهێنرێت، چونکە چینە هەژارەکان زۆرجار تەلەفۆنیان نییە، تاکەکانیان لەنێو رابەری ژمارەی تەلەفۆنەکاندا تۆمارنەکراون، لەبەرئەوە هەلیان بۆ نارەخسێت کە لە نموونەکەدا دەرکەون.

بێجگە لەوەش ئەم ڕێگەیە بوجەی زۆری تێدەچێتو هەوڵی زۆریشی دەوێت، ناشگونجێت بۆ کۆمەڵگە هاوڕەگەزەکان نەبێت، بەڵام کۆمەڵگە فرەڕەگەزەکان ئەم ڕێگایانەیان بۆ بەکاردەهێنرێت.

## هەڵبژاردنی نموونە لە کۆمەڵگە فرەرەگەزەکاندا

**١- نموونەی لەوانەکاری هەڵەشەیی سادە:**

شێوازی نموونەی هەڵەشەیی سادە بە شێوازێکی بنەڕەتی دادەنرێت، بۆ نموونە لەوانەکاری (الاحتمالية). ئەم شێوازە بۆ هەموو تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە کە دەرفەتی یەکسان لە هەڵبژاردنەکەدا ڕێکدەخات. بێجگە لەوەش کە دەرکەوتنی هەموو تایبەتمەندیو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی لێکۆڵراوەکە لە نموونەکەدا. ئەم ڕێگەیە کاتێك بەکاردەهێنرێت کە جۆرە هاوڕەگەزییەك هەبێت لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵی لێکۆڵراوەکەدا. لە هەموو هەڵبژاردنی نموونەی هەڵەشەییدا بە شێوەی گشتی، پشت بە بەکارهێنانی خشتەی هەڵەشەیی دەبەستێت. بەڵام ئەگەر کۆمەڵگە بچوکبو، کۆمەڵێك کاغەزی چونییەك لە ڕەنگو شێوەو قەبارەدا، لەسەر هەر یەکەیان ناوی یەکێك لە ئەندامی کۆمەڵگە لێکۆڵراوەکەی لەسەر دەنوسرێت، بە مەرجێك ناوی کەسیان دووبارەنەبێتەوەو ناوی کەسیشیان لەبیرنەکرێت، ئەوساکە هەموو کاغەزەکان، یان کارتەکان بەباشی تێکەڵدەکرێن لە سندوقێکدا، یان لە هەر دەفرێکدا بێت بەتایبەتی بۆ ئەم مەبەستە دروستکرابێت، کە پێیدەڵێن دەفری نموونەیی، دادەنرێت، دەبێ دەفرەکە وەها دروستکرابێت کە هیچ کاغەزێك نەنوسێت بە لێوارەکانییەوە، ئەوکاتە کاغەزەکان یەکەیەکە بە گوێرەی ژمارەی نموونەکە ڕادەکێشرێن، واتا / ئەم کردارە لە کرداری ڕاکێشانی پشککردنی یانەسیب دەچێت.

**٢- نموونەی لەوانەکاری هەڵەشەی ڕێکخراو:**

ئەم ڕێگەیە لەبەر ئاسانی بەکاردەهێنرێت، کاتێکیش کە جۆرە هاورەگەزییەك هەبێت لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵەکەداو کاتێکیش کە

لیستێك هەبێت بە ناوی هەموو تاکەکانی کۆمەڵەکەوە. حاڵەتی یەکەمی لێهەڵدەبژێردرێت بە ڕێگەی هەڵەشە، حاڵەتەکانی، یان یەکەکانی دوای ئەو بە گوێرەی چەند مەودایەکی ڕێکخراو. بۆ نموونە / ئەگەر ویستمان نموونەیەکی (١٠٠) تاکی هەڵبژێرین، لە کۆمەڵگەیەك کە ژمارەکانی تاکەکانی (٦٠٠٠) شەش هەزاربوو، واتا دەرفەتی دەرکەوتنی هەر تاکێك لەو تاکانە، دەرفەتی (١ : ٦٠) کە لە نێو نموونەکەدا دەرکەوێت.

ئەگەر دەرکەوت ژمارەی تاکی یەکەم (٤٦)ە واتای وایە دوای ئەو تاکی ژمارە (١٠٦) دێت، تاکی ژمارە (١٦٦)، تاکی ژمارە (٢٢٦) دێت هەروەها ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دەرفەتی دەرکەوتنی ئەو تاکانەی کە ژمارەکانیان دەکەونە نێوان ئەم ژمارانەوە، بە شێوەیەکی سروشتی نامێنێت، هەر کە ژمارەی تاکی یەکەمت هەڵبژارد.

**٣- نموونەی لەوانەکاری هەڵەشەی چینایەتی:**

ئەم ڕێگەیە لە کۆمەڵگا نەگونجاوەکاندا (فرە ڕەگەزەکان) بەکاردەهێنرێت، ئەوەی کە دەکرێت بە چەند کۆمەڵە کەسانێکەوە، کە هێندێکیان لە هێندکێکیان جیاوازن.

بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت ڕای دانیشتوانی شاری بەغدا لەبارەی بەرنامەکانی تەلەفزیۆنەوە بزانین نابێ پەنابەرینە بەر ڕێگەی نموونەی هەڵەشەیی سادە، لەبەرئەوەی جیاوازی بۆچوون هەیە بە گوێرەی تەمەن، توخم، ڕۆشنبیریی، سەر بە چینایەتی، چونکە ڕێکەوت دەستتێوەردان دەکات لە نموونەکەدا، لەوانەیە زۆرینەی تاکەکان لە تەمەنێکی دیاریکراودا یان لە ئاستێکی ڕۆشنبیریی دیاریکراودا، یان کۆمەڵایەتی دیاریکراودا وەدەرکەون، ئەوکاتە نوێنەرایەتی لە نموونەکەدا دوردەبێت لە ڕاستییەوە. لەبەرئەو هۆیانە، کۆمەڵگەکە دەکرێت بە چەند کۆمەڵە کەسانێکەوە، ئەویش بەگوێرەی توخم،

تەمەن، رۆشنبیریی، ئاستی کۆمەڵایەتی، ئابوری. لە هەر کۆمەڵەیەك لەوانە کۆمەڵێك تاك بە گوێرەی رێژەی لە کۆمەڵگە گەورەکەدا، هەڵدەبژێرن، بەڵام بە رێگەیەکی هەڵەشەیی، دوای ئەم هەموو نموونانە کە لەو کۆمەڵە کەسانەوە وەرگیراوون بە یەکدا دەکرێن، بۆ ئەوەی نموونە هەڵەشە چینە گەورەکە دروستبکات. دوای ئەوە چەند رێگایەك هەن بۆ دابەشکردنی تاکەکانی چینەکە بەسەر چینە جیاوازەکان، دوای ئەوەش یان بە شێوەیەکی یەکسان، یان بە شێوەیەکی رێژەیی یان بە دابەشکردنێکی زۆر نموونەیی (الامثل) دابەشدەکرێن.

**رێگاکانی هەڵبژاردن:**

١- **دابەشکردنی یەکسان:** بەپێی ئەم رێگەیە، کۆمەڵگە پۆلێندەکرێت بۆ دوو چین یان زیاتر، وەکو / تەمەن، رەگەز، لە هەر چینێك لەم چینانەدا چەند یەکەیەك رادەکێشین، بەمەرجێك یەکسان بن بەو یەکانەی کە لە چینەکەی دیکە رامانکێشاون.

٢- **رێگەی دابەشکردنی گونجاو:** ئەم رێگەیە بەکاردەهێنرێت کە جیاوازی قەبارە هەبێت لەنێوان چینەکاندا، ئەوکاتە لە هەر چینێك ئەو ژمارەیە بۆ نموونەکە هەڵدەبژێرین کە بگونجێت لەگەڵ قەبارەکەیدا، بۆ نموونە / لە چینە قەبارە گەورەکە ژمارەیەکی گەورە رادەکێشین، لە چینە قەبارە بچوکەکە ژمارەیەکی کەم رادەکێشین، هەروەها بەو شێوەیە.

٣- **رێگەی دابەشکردنی زۆر نموونەیی:** ئەم رێگەیە کاتێك زۆر بەکاردەهێنرێت، کە هێندێك کۆمەڵ، یان چین گونجاوبن، هێندێکی دیکەیان کەمێك گونجاوبن، یان هەر نەگونجێن. ئەوکاتە لێکۆڵەر پەنادەبات بۆ راکێشانی ژمارەیەکی کەم لە کۆمەڵە یان چینە گونجاوەکان و راکێشانی ژمارەیەکی گەورە لە کۆمەڵە یان چینە

نەگونجاوەکان. ئەمەش بۆئەوەی جیاوازییەکان لە نموونە کورتەکەدا دەربکەوێت.

**نموونەی لەوانەکاری هەڵەشەیی فرەقۆناخ:**

ئەم رێگەیە لە کۆمەڵگە گەورە نەگونجاوەکاندا بەکاردەهێنرێت، کاتێك کە کۆمەڵگە ئامارکراوەکە، بۆ چەند کۆمەڵەیەکی دیاریکراو دابەشدەکرێت، دوای ئەوە ئەو کۆمەڵە دابەشدەکرێت بۆ چەند کۆمەڵەیەکی بچوکتر، دوای ئەوەش ئەو کۆمەڵەش دابەشدەکرێت بۆ کۆمەڵەی بچوکتر، دوای ئەوە چەند یەکەیەك لە هەموو کۆمەڵەیەك بە رێگەی هەڵەشەیی دیاریدەکرێت، هەڵدەبژێردرێنو لەیەکدەردەکرێن.

بۆ نموونە / ئەگەر لێکۆڵەرێك بیەوێت روپێوێکی کۆمەڵایەتی خێزانەکانی کۆمەڵگەی شارستانی بکات، دەتوانێت چەند شارێك وەکو نموونە هەڵبژێرێت، ئەو کاتە لە هەموو شارێك چەند گەڕەکێك هەڵبژێرێت، لە هەر گەڕەکێك نموونەیەك خێزان هەڵبژێرێت.

ئەم کردارە بە قۆناغی جیادا تێپەڕدەبێت، لەبەرئەوەیە ناونراوە بە نموونەی فرەقۆناخ. هەڵبژاردنەکە لەسەر فرەئاست، لە ئاستە تایبەتییەکان جێبەجێدەبێت، چەند یەکەیەکی دیکەش دەگرێتەوە.

**سێیەم / هەڵبژاردنی تێکهەڵکێش ( نموونەی رووبەری یان ئەستێلی ):**

لەبەر نەشیاوی بەراوردکاریی ئەنقەست، لەبەرئەوەی بە زۆر زەحمەت بەراوردکاریی لەوانەکاری هێندێك جار ئەنجامدەدرێت، لە لێکۆڵینەوەدا، بەهۆی کەمدەرامەتییەوە، ناچار لێکۆڵەر پەنادەبات بۆ ئەم جۆرە بەراوردە، کە بریتییە لە هەڵبژاردنی چەند کەسانێکی دەستنیشانکراو لە هەر ناوچەیەك یان لە هەر پارێزگایەك بە شێوەیەکی هەڵەشە، بۆ پێکهێنانی ئەو نموونەیەی کە لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجامدەدرێت.

لەو رەخنانەی لەم رێگەیە گیراون، ئەوەیە کە پێویستە لێکۆڵیار هاتوچۆبکات لەنێوان پارێزگاکانداو ناشتوانرێت بەشێوەیەکی راستی دابەشکردنی دانیشتوان بخەملێنین، هەروەها لێکۆڵەر دەتوانێت نموونەی لێکۆڵینەوەکەی بە جۆرێك دروستبکات، هەردوو شێوازی هەڵبژاردنی ئەنقەستو هەڵبژاردنی هەڵەشە کۆبکاتەوە. بۆ نموونە ئەگەر لێکۆڵەر ویستی لێکۆڵینەوەیەك لەسەر پارێزگایەك لە پارێزگاکان، لەبارەیەکەوە بکات، دەتوانێت چەند کۆمەڵگەیەك بە رێگەی ئەنقەست وەکو گەڕەك، گوند هەڵبژێرێت. ئەمە لە قۆناغی یەکەمدا، دوای ئەوە لەو گەڕەکو گوندانە لە قۆناغی دووەمدا، بە رێگەی لەوانەکاری هەڵەشە تاکەکانی نموونەکەی هەڵبژێرێت.

**سەرچاوەکانی هەڵەکردن لە هەڵبژاردنی نمونەدا:**

ئەنجامەکانی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە بە رێگەی بەراوردکاریی دەکرێن، روبەڕووی دوو جۆرە هەڵەکردن دەبنەوە:

**یەکەم:** هەڵەی رێکەوت، ئەم جۆرە هەڵەکردنانە، لە ئەنجامی جیاوازیکردن لە نێوان تاکەکانی نموونەکەو تاکەکانی کۆمەڵگەکەدا روودەدەن، بەڵام چەندێك قەبارەی نموونەکە گەورە بکرێتەوە، ئەوەندەشیانی هەڵەی رێکەوت کەمدەبێتەوە، دەشتوانرێت رێژەی هەڵەکان دیاربکرێت.

**دووەم:** هەڵەکردنی لایەنگیریی: کاتێك لێکۆڵەر توشی هەڵەکردن دەبێت لەکاتی هەڵبژاردنی نموونەکەدا" کە شوێن شێوازی رێگەی هەڵەشەیی نەکەوێت لە هەڵبژاردنەکەدا. یان بەهۆی ئەوەوە کە ئەو چوارچێوەی لێکۆڵەرەکە لە هەڵبژاردنی نموونەکەدا پشتی پێدەبەستێت بەسنەبێت بۆ مەبەستەکە.

یان بەهۆی گیروگرفتی پەیوەندیکردنەوە بە هێندێك لە کەسە لێکۆڵراوەکانەوە ناتوانرێت هەڵەکردنی لایەنگیریی نەخۆی نەڕێژەکەی

دیاریبکرێتو بزانرێت. بە شێوەیەکی کورت راڤەی هۆکارەکانی لایەنگیریی دەکەین، ئەوانەش وەکو:

**١- رەچاونەکردنی بنەمای هەڵبژاردنی هەڵەشەیی:**

واتا: نەرەخساندنی دەرفەتی زۆرو یەکسان بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەکە بۆئەوەی لە نموونە پێویستەکەدا، وەدەرکەون. چونکە لێکۆڵەرەکە بە راکێشانی نموونەکە تەنها لە یەك چین لە کۆمەڵگەکە وازدەهێنێت، دوای ئەوە ئەنجامەکە بەسەر کۆمەڵگەکە هەموو گشتیدەکات وەکو بەکارهێنانی رابەری ئامێری تەلەفۆن، یان پەیوەندیکردن بەو کەسانەی کە دەیانناسێتو ئاسانە پەیوەندییانپێوەبکات.

**٢- نادیاری چوارچێوەی دانیشتوان بە تەواوەتی:**

جاری وا هەیە لێکۆڵەر پشت بە چوارچێوەیەك دەبەستێت، کە هەموو کۆمەڵە کەسەکانی دانیشتوانی نەگرتۆتە خۆی، وەکو ئەوەی پشت بە سەرژمێرییەکی کۆن دەبەستێت، کە هەموو ناوو زانیارییە پێویستەکانی نەگرتۆتە خۆی. لەبەرئەوە پێویستە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە تەواوبێتو هەموو یەکەکانی کۆمەڵگەی گرتبێتە خۆی، هەموو ئەو زانیارییانە بگرێتەوە کە لێکۆڵەر پێویستی پێیان هەیە، هەروەها دەبێت زانیارییەکان نوێبنو راستیش بن.

**٣- دەستنەکەوتنی زانیاری لە بارەی هێندێك تاکەکانی لێکۆڵینەوەکەوە:**

جاری وا هەیە لێکۆڵەرەکە ناتوانێت زانیاری لە بارەی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەکەوە بەدەستبهێنێت، لەبەرئەوە ئەو ئەنجامەی لە لێکۆڵینەوەی لەسەر بەشێك لە کۆمەڵگەکە دەستکەوتووە، بەسەر هەموو کۆمەڵگەکەدا گشتیدەکات، ئەبوایە تەنها بەسەر ئەو بەشەدا بیکردایە کە نموونەکەی بەراستی لێوەرگرتووە.

**هەنگاوەکانی هەڵبژاردنی نموونە**

١- دیاریکردنی یەکەی نموونەکە.

٢- دیاریکردنی ئەو چوارچێوەی کە نموونەکەی لێوەردەگرێت.

٣- دیاریکردنی قەبارەی نموونەکە.

٤- دیاریکردنی ئەو ڕێگەیەی کە نموونەکەی پێهەڵدەبژێرێت.

**لەبەر گرنگیی ئەم هەنگاوانە هەر یەکێکیان بە کورتی ڕاڤەدەکەین:**

**یەکەم / دیاریکردنی یەکەی نموونەکە:**

نموونەی لێکۆڵینەوەکە لە کۆمەڵێك یەکە دروستدەبێت، جاری وا هەیە یەکەی نموونە خێزان یان زەمینی کشتوکاڵ یان خوێندنگە یان کارگە یان بەرهەمی کشتوکاڵی یان تاك دەبێت.

ئەگەر ئامانجی لێکۆڵینەوە کە زانینی بوجەی خێزان بێت لە شاری بەغداد، هەرچی خێزان هەیە لەم شارەدا کۆمەڵگەی لێکۆڵینەوەکە دەبن، بەڵام تەنها خێزانێك یەکەیەکی نموونەکە دەنوێنێت. ئەگەر ویستمان لێکۆڵینەوەی باری خوێندکاری زانکۆیی لە زانکۆی بەغداد بکەین، ئەو کاتە خوێندکارێك یەکەی نموونەکە دەبێت، بەڵام کۆمەڵگەی لێکۆڵینەوەکە هەموو خوێندکارەکانی زانکۆی بەغداد دەبێت. لەبەرئەوەی (یەکە) لە لێکۆڵینەوەیەکەوە دەگۆڕێت بۆ لێکۆڵینەوەیەکی دیکە، پێویستە یەکەم هەنگاو یەکەی نموونەکە دیاریبکات، دوای ئەوە ئەو نیشانە بنچینەییانەی کە پێویستە لە هەموو یەکەیەك لەو یەکانەدا هەبن.

**دووەم / دیاریکردنی چوارچێوەی دانیشتوان:**

پێویستە لەسەر لێکۆڵەر ئەو چوارچێوەیە دیاریبکات کە لە هەڵبژاردنی یەکەکاندا پشتیپێدەبەستێت، جاری وا هەیە چوارچێوەی لیستی ناوەکان یان چەند نەخشەیەك یان چەند سەرژمێرییەك دەبێت.

لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەدا ئەم مەرجانە دەگیرێت:

١- دەبێت تەواوبێت، هەموو ئەو بەشانە بگرێتەوە کە دەچنە نێو لێکۆڵینەوەکەوە.

بۆ نموونە ئەگەر لێکۆڵەر ویستی لە روکارەکانی خوێندکارانی زانکۆ بەرەو مارەکردنی کچانی بێگانەو یەکەی لێکۆڵینەوەکەی بە خوێندکارانی کچ یان کوڕ دیاریکرد، (واتا / چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەی پێویستە کۆمەڵگەی خوێندکارانی هەردوو رەگەز پێکەوەبێت).

٢- دەبێت تەواوبێت، واتا دەبێت هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەی بنچینەیی بگرێتەوە.

ئەو چوارچێوەی تەنها ناوەکانی خوێندکارانی دەگرتەوە، تەواوە ئەگەر ناوەکانی خوێندکارانی زانکۆی بە راستی هەمووی گرتبۆوە.

٣- دەبێت ئەو زانیارییانەی لەبارەی هەر یەکەیەك لە یەکەکان کۆدەکرێتەوە وردبێت، واتا/ نابێت ئەو یەکانە بگرێتەوە کە لە کۆمەڵگەدانین، بەهۆی گواستنەوە یان گەڕانەوەیان، لەبەرئەوە پێویستە چوارچێوەکە نوێبێت.

٤- نابێت ئەو ناوانەی کە لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەدا تۆماردەکرێن دووبارەبن، وەکو / ناوی ئەو کەسانەی کە ماڵەکانیان دەگوێزنەوە.

٥- واباشە ئەو چوارچێوەی لە لێکۆڵینەوەکەدا بەکاردەهێنرێت، بە رێگەیەك رێکخراوبێت، کە هەڵبژاردنی نموونەکە ئاسانبکات، وەکو / ئەوەی کە یەکەکان ژمارەی زنجیرەداریان هەڵگرتبێت.

**سێیەم / دیاریکردنی قەبارەی نموونەکە:**

دیاریکردنی قەبارەی نموونەکە لەسەر چەند بنەمایەك دەوەستێت، گرنگترینیان ئەمانەن:

١- بنەما هونەرییەکان: گرنگترین پلەی گونجاندن یان نەگونجاندنی یەکەکانی کۆمەڵگەیە، هەروەها رادەی ئەو باوەڕەیە کە لێکۆڵەر حەزدەکات پابەندبێت پێوەی، ئەگەر کۆمەڵگە بنچینەییەکە گونجاوبوو (هاوڕەگەز بوو)، دەتوانرێت قەبارەی نموونەکە بچوکبێت، بەلآم کۆمەڵگەکە ئەگەر بە شێوەیەکی ئاشکراو دژواربوون ئەوە پێویستە قەبارەی نموونەکە زیادبکرێت، بۆئەوەی رێکەوتی هەڵەکردن کەمبێتەوە، بەلآم لەبارەی رادەی باوەڕپێکردنەوە، بە ڕاستی پێویستە کە لێکۆڵەرەکە ئەو رێژەیە دیاریبکات کە هەڵەی تێدا دروستە، ئەگەر وترا چاوپۆشی لەو هەلآنە دەکرێت کە ٥٪ تێنەپەڕێت، ئەمە بۆ نموونە، ئەوکاتە پێویستە لای خواری قەبارەی نموونەکە دیاریبکرێت بۆئەوەی هەڵەکان لەو رێژەیە تێنەپەڕن.

دەتوانرێت بۆ دیاریکردنی قەبارەی پێویست بۆ نموونەکە بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی سەرژمێریو بۆ هاوکێشەی هەڵەی (معیاری). لەبەرئەوەی هەڵەی بەراوردکاری هەڵەشەیی، دەوەستێتە سەر قەبارەی هەڵەی (معیاری) لەو رێژە سەدییەی کە لە لێکۆڵینەوەکە ئەنجامدەدرێت. دەگونجێت بە شێوەیەکی پێچەوانە لە رەگی دوجای قەبارەی نموونەکەوە بێت.

٢- بنەما ناهونەرییەکان: گرنگترینیان بۆجەی پێویستو کاتی تەرخانکراو بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان، چونکە ئەوانە قەبارەی نموونەکە دیاریدەکەن، لەگەڵ چاوپۆشیکردنمان لە ئەگەری ئەو هەڵانەی کە روودەدەن.

**چوارەم / دیاریکردنی ڕێگەی هەڵبژاردنی نموونەکە:**

نموونەکان بە گوێرەی جۆری ئەو ڕێگایانەی کە پێی هەڵدەبژێردرێن دەگۆڕێن، هەرچەندە هەر هەموویان ئامانجیان ئەوەیەکە بە شێوەیەکی ڕاستی کۆمەڵگاکان بنوێنن، بە جۆرێکی وا کە هەر نموونەیەك هەموو نیشانەکانو تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای لێکۆڵینەوەکەی خۆی لەخۆگرتبێت.

گرنگترین جۆرەکانی نموونە ئەمانەن[1]:

**١-٤- نمونەی هەڵەشەیی سادە:**

واتا / بە ڕێگەیەك نموونەکە وەردەگیرێت، کە دەرفەت بۆ هەموو یەکەکانی کۆمەڵگەکە بە شێوەیەکی یەکسان دەڕەخسێنێت لە هەڵبژاردنەکەدا.

بۆ هەڵبژاردنی نموونەیەکی هەڵەشەیی، دەتوانرێت ناوو ژمارەکانی یەکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لەسەر رووی کۆمەڵە کارتێکی چونیەك لە شێوەو قەبارەو ڕەنگدا بنوسرێت. دوای ئەوە لە سندوقێکدا یان لە دەفرێکدا بە باشی تێکلبکرێتو دوای ئەوە بە گوێرەی تاکەکانی نموونەکە کارتی پێویستی لێڕادەکێشرێت، یان جاری وا هەیە خشتەی هەڵەشەیی بەکاردەهێنرێت.

بۆ ئاشکراکردنی هەڵبژاردنی نموونەکە لە ڕێگەی خشتە هەڵەشەییەکانەوە وا گریمانکەین کە ئێمە لە باری خوێندکاری بەشی کۆمەڵناسی دەکۆڵینەوە، بۆئەوەی نموونە لە خوێندکارە کچەکانی بەشی

---

[1] نوسەر ئەم دوو جۆرە نموونەیەی تەنها بۆ ڕافەو ڕوونکردنەوەی هەنگاوی چوارەم لە دیاریکردنی نموونەدا باسکردووە، ئەگینا لە سەرەتای ئەو باسەوە جۆری نموونەکانمان بۆ ڕوونبۆتەوە. — و –

کۆمەڵناسی بە ڕێگەیەکی هەڵەشەیی هەڵبژێرین، شوێن ئەم هەنگاوانە دەکەوین:

١- لیستی ناوی خوێندکارە کچەکانی بەشی کۆمەڵناسی بۆ ئەو ساڵی خوێندنەی کە دیاریمانکردووە، بەدەستدەهێنین، دوای ئەوە ژمارەی خوێندکارە کچەکان دیاریدەکەین، با (٤٠٠) خوێندکاربن.

٢- قەبارەی نموونەی پێویستئەبێت دیاریبکرێت، بەڵام با ڕێژەکەی لە ١٠٪ بێت، ئەمە واتای وایە کە قەبارەی نموونەکە یەکسانە بە

$$\frac{١٠}{١٠٠} \times ٤٠٠ = ٤٠ \text{ خوێندکاری کچ}$$

٣- خشتەی ژمارە هەڵەشەییەکان دەکرێنەوە، بۆئەوەی هەوڵبدەین (٤٠) چل خوێندکاری کچمان لێوەیان دەستبکەوێت، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە دەبێت ژمارەکان هەر یەکە دروستکراوبن لە سێ خانە، لەبەرئەوەی گەورەترین ژمارە پێکهاتووە لە سێ خانە، ئەمەش بۆ ئەوەی دەرفەت بۆ هەر تاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵگەکە مسۆگەربکەین، بۆئەوەی لە نموونەکەدا دەربکەوێت.

٤- دوای ئەوە بێئەوەی تەماشای هیچ ژمارەیەك لە ژمارە هەڵەشەییەکان بکەین، پەنجەمان لەسەر ژمارەیەك لە ژمارەکان دادەنێین، با بڵێین ژمارە (١٧٤) بوو لە کۆمەڵەی سێیەم، دێڕی سێیەم، بە ڕاستی ئەم ژمارەیە نموونەی هەیە لە دەرخستنی کۆمەڵگە ڕاستییەکەدا، لەسەر پەڕەیەك، وەکو / ناوی یەکەم لە نموونەکەدا تۆماردەکەین، دوای ئەوە ژمارەکانی دیکە بە دوایدا بە شێوەیەکی ئەستونی یان ئاسۆیی یەکە یەکە وەردەگرین، لەگەڵ ئەوەی ئەو ژمارانە دوردەخەینەوە کە لە (٤٠٠) چوارسەد زیاترن.

**٢-٤- نمونەی ڕێکخراو**

**٣-٤- نموونەی هاوڕێکار یان کۆبوونەوە:**

ئەمە لە کۆمەڵگە گەورەکاندا بەکاردەهێنرێت، ئەوکاتە کۆمەڵگەکە بۆ چەند یەکەیەکی سەرەتایی دابەشدەکرێت بە ڕێگەیەکی هەڵەشە نموونەکەی لێهەڵدەبژێردرێت، یان نموونە سەرەتاییەکە، ئەویش دابەشدەکرێت بۆ چەند یەکەیەکی ناوەنجی، ئەوجا بە هەمان ڕێگەی هەڵەشە نموونەکەی لێهەڵدەبژێردرێت.

پێویستە لەسەر توێژەر یان ڕوبەڕوو کە گوێ بۆ کەسی بەرامبەری شلبکات، وریابێت بۆ ناوەڕۆکی قسەکانی، هەستی تێبگات، هەوڵبدات، بە هەستو سۆزی هاوبەشیبکات، ئەو بایەخەی پێبدات کە شایانێتی، وەکو مرۆڤێك تەماشای بکات، لەگەڵیدا سادەبێتو زۆری لێنەکات، هەروەها خۆی لە ئاستی کەسی بەرامبەر دابنێت، دەبێت بەو شێوە زمانە قسەی لەگەڵبکات کە تێیدەگات.

ئەم ئامۆژگارییانە پاڵ بە لێکۆڵەرەوە دەنێتو پێویستدەکات لەسەری کە توێژینەوەیەکی ئەزمونگەریی پێشوەخت بکات، بەرامبەر ئەمانە هەموو پێویستە لەسەر توێژەر کە ئامانجە بنچینەییەکەو ئەو مەبەستەی کە لە پشکنینەکە هەیەتی لە بیرینەچێتەوە.

# دەروازەی سێیەم

## بەشی یەکەم

- ☐ ڕواڵەتە کۆمەڵایەتییەکان
- ☐ ئاپۆرە
- ☐ جەماوەر
- ☐ گشت
- ☐ کۆمەڵ
- ☐ گرنگیدان بە بیرۆکەی کۆمەڵ
- ☐ تیۆرەکانی ڕەفتاری ئاپۆرەیی
- ☐ مــۆدە
- ☐ قاوداخستن
- ☐ پروپاگندە
- ☐ جەنگی رامیاری

## رواڵەتە کۆمەڵایەتییەکان

گرنگیدان بە دیاردە کۆمەڵییەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا دەستییپێکرد، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە دانبنرێت بەوەدا کە سەرەتایەکی خراپی هەبوو، چونکە وای لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتی کرد لە لێکۆڵینەوەکانیدا رووکارێکی ناڕاست بگرێت.

ئەمجا بۆئەوەی لە رەفتارە کۆمەڵییەکان تێبگەین، پێویستە لە هێندێك لە دیاردە کۆمەڵییەکانی وەکو ئاپۆرەو هێندێك لە دیاردە گشتییەکان وەکو قاوداخستن‌و مۆدە بکۆڵینەوە، بەڵام پێشئەوەی لەو هۆکارانە بکۆڵینەوە کە بونەتە هۆی دەرکەوتنی ئەم دیاردانە، دەبێت جیاکاری لە نێوان ئەم ئاپۆرەیەو ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییانەی دیکەدا کە تیایاندا تاکەکانی کۆمەڵ خۆیان رێکدەخەن بکەین، ئەمانەش بریتین لە:

**یەکەم / جەماوەر** (الجمهور):

نموونەی کۆمەڵێکی جیاوازی رێکنەخراو یان کەم رێکخراو دەنوێنێت، کە نەبەستراوە بە شوێنو کاتی دیاریکراوەوە، بەڵام یەك جۆرە بیروڕایان هەیە.

**دووەم / گشت** (العموم):

جیاوازییەکی کەمتری هەیە لە جەماوەر، لەگەڵ ئەوەشدا (گشت) جوڵەی زیاترەو تایبەتمەندییەکی تایبەتی هەیە کە ئەم تایبەتمەندییەش دەگونجێت رامیاری بێت یان رۆشنبیری یان وێژەیی بێت، بۆ نموونە کە دەڵێن:

(جەماوەری یان خوێنەرانی نوسەرێکی دیاریکراو) ئەم واتایەی ئێمە دەگەیەنێت.

**سێەم / کۆمەڵ** (الجماعة):

کۆمەڵـە کەسـێکن کـە سیسـتمی ناوخۆییـان هەیـە، کـە کـاری ئەندامـەکانی دیاریـدەکاتو سـەرۆکێکیان هەیـە کـە ئیشـوکاری ئەندامەکانی ڕێکدەخات، بۆ نموونە وەکو:

دامەزراوەیـەکی بازرگـانی یـان پـارتێکی سیاسـی، رای گشـتی گرنگییـەکی تایبـەتی لایـان هەیـە، سەرۆکەکەشـیان هەوڵـدەدات ئاڕاستەیبکات بۆ بەرژەوەندی خۆیان.

**چوارەم / ئاپۆرە** (الحشود):

بریتییە لە کۆمەڵێك خەڵك، کە یەك ئارەزوو یان یەك رووکار یان یـەك سـۆزی هاوبـەش کۆیاندەکاتـەوە، ئێمـە نـاتوانین بەشـێوەیەکی کرداری جۆرەکانی ئاپۆرە دیاریبکەین، بەڵام دەتوانین بە گوێرەی حەزو رووکـاری مرۆڤانـە، تـا رادەیـەك دەستنیشـانیانبکەین. بەڕاسـتی دەروونزانـە گشتییەکانو کۆمەڵناسەکانو دەروونزانـەکانی کۆمەڵایـەتی، گرنگیـان بـە لێکۆڵینـەوەی ئاپۆرەکـانو کۆمەڵـەکان داوە، قوتابخانـەی جـەزائی ئیتـالی یەکێکـە لەوانـەی کـە پێشـەنگبوون لـە گرنگیـدان بـە کۆمەڵەوەو شیکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی.

(ئـەنریکۆ ڤێـری)[1] چـەند دانراوێکـی لـەم بارەیـەوە هەیـە وەکـو (گیـانی سیاسـەت)و (گیـانی سۆسیالیسـتی)و (گیـانی شۆڕشـەکان)و شۆڕشی فەرەنسی بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵو تایبەتمەندییەکانی.

(ئـەنریکۆ) دەڵێـت / کۆمەڵـەکان ئاسـتی رەوشـتی ئەندامـەکانیان نزمدەکەنـــەوە، زیرەکییـــان کەمدەکەنـــەوە، پاڵیـــانپێوەدەنێن بـــۆ

---

[1] ئەنریکۆ ڤێری (١٨٥٦ – ١٩٢٨)، قوتابی بەردەستی لەسرزار لەمبریزۆ، سەرۆکی خوێندنگەی وەسفی بوو لە تاوانکاریدا. - و -

سـۆزەکانیان، لەبەرئـەوە بـاوەڕی وایـە کـە تـاك لـە کۆمەڵـدا بـەوە وەسـفدەکرێت کـە بیرکردنـەوەی کەمـەو هەرچـەندە ڕەوشـتی بـەرزبێتو ڕێگـەی پـەروەردەیی جیاوازبێـت پاڵپیێوەدەنرێـت بـۆ ئارەزووەکـانیو پاڵنـەرەکانیو بەڕاسـتی توێـژەرەکانو سیاسـییەکان گرنگییـان بـەم ڕاوبۆچـوونانە داوە، لەبەرئـەوەی کـە ئـەوە ڕووندەکاتـەوە کـە جـەماوەر وەسفدەکرێت بە تایبەتمەندی دیاریکراو، کـە ئەگـەر پیاوانی سیاسەت تێبینەگـەن، ئـەو کاتـە پـاڵ بـە جـەماوەرەوە دەنـێن بـۆ ڕامـاڵینیـان لەسـەر کورسـی دەسـەلات، لەسـەر ئـەم بنچـینەیە پێویسـتە لەسـەر پیـاوانی دەسەلات، کە لە سروشتو ئارەزووەکانی کۆمەڵو میللەت بگەن.

لەبەرئەوەیـە (ئـەنریکۆ) ترسـاوە لـە پێشـەوایيکردنی جـەماوەرو دەسەلاتپەیداکردنی. چونکە زیان بە کۆمەڵگە دەگەیـەنێت، ئـەم ڕایـەی ئەو خزمەتێکی زۆری ئەو کەسانەی کردووە کە حەز بە دەسەلاتی تاکی دەکـەن. ئەمـەش دەنگدانەوەیـەکی فراوانـی دایـەوە، لـە ئـەڵمانیا و فەرەنسـادا، لـە فەرەنسـا (گۆسـتاف لۆبـۆن) دەرکـەوت کـە لـە دەروونیـی جـەماوەریی دەکۆڵییـەوە، لـە دانراوەکەیـدا (دەروونزانیـی کۆمـەڵان) کـە سـاڵی ١٨٩٥ بڵاویکـردەوە، ڕای وایـە تـاك بـە سروشـتی خـۆی چـاکەو ڕەوشـتێکی بـەرزی هەیـە، بـەڵام کـە دەچـێتە نـاو کۆمەڵـەوە دەگۆڕێتـو هەڵدەستیّ بە ناشیرینترین کردار، واتا کۆمەڵ ئاستی تاك نزمدەکاتەوە، هەرچـەندە سروشـتی ئـەو تاکانـەی کـە کۆمـەڵ پێکـدەهێنن بـاش بێـت، بێجگـە لـە تێـڕوانین لـە بـارەی لێکچـوونەکانیان یـان جیاوازییـەکانی ژیانیانو بێجگە لـە جیـاوازی پلەکانی زیرەکییـان، ئەمانە کاتێك دەچنە نـاو کۆمـەڵێکی دیـاریکراوەوە گیـانێکی نـویّ لـەلایان دەردەکـەوێت، ئەویش (گیانی کۆمەڵی)یە، ئەو گیانەی کە وەسفدەکرێت بە سیفەتی نـویّ، دەناسـرێتەوە بـە سیفاتی هـەموو تاکێـك، لـە ئەندامـەکانی ئـەو

کۆمەڵەو لەلای تاکەکان بیروبۆچوونو رەفتارو کرداری وا دەردەکەوێت کە جیاوازە لە بیروبۆچوونو رەفتارو کردارەکانی ئەو تاکانەی کە بە تەنها پێیهەڵدەستن.

کەواتە لێرەدا بەپێی رای لۆبۆن، گرۆ ئەوە نییە کە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك تاك، بەڵکو بریتییە لە یەکەیەکی سەربەخۆ کە هەموو ئەندامەکانی رەفتاری تایبەتیان هەیەو ناودەنرێت بە (رەفتاری گرۆیی). ئەو هۆکارانە کە یارمەتی دەرکەوتنی ئەو رەفتارە نوێیانە دەدەن کە جیاوازە لە رەفتاری تاکەکان ئەمانەن:

١- **هەستکردن بە هێز**: زۆری ئەندامەکانی یارمەتی دەرکەوتنی هەستێکی سەرەتایی دەدەن کە تاك دەگۆڕێت بەوەی کە بیر لە ترس یان سزا نەکاتەوەو هەست بە لێپرسینەوە نەکات، ئەمەش نزمبوونەوەی رەوشتی کۆمەڵەکەیە.

٢- **هۆکاری چاولێکەری یان (درمی هزری)**: کە ئەمیش یارمەتی ئەوەدەدات کە تاکەکان هێندێکیان چاو لە هێندێکی دیکەیان بکەن بەبێ پەیکردن یا بیرکردنەوە.

٣- **سروشی زیهنی**: وەکو هەڵفریواندنی موگناتیسی وایە، کە ئەو کەسە بیرکردنەوەی دەوەستێت و رەفتاری ملکەچدەبێت بۆ کارکردن، وەکو ئامێرێکی چاپکردنی لێدێت کە بەهۆی سۆزو ئارەزووەکانییەوە شوێن ئاپۆرەکە دەکەوێت، گۆستاف لۆبۆن باسی ئەوە دەکات کە تاکەکان بە شێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵێکی دیاریکراودا لە روویەکەوە جیاوازن، لە روویەکی دیکەوە لە یەکدەچن، لێرەدا جیاوازی نێوانیان لە رووی پەروەردەو رۆشنبیریو تایبەتمەندییە بۆماوەییە تایبەتییەکانەوەیە، بەڵام لە رووی ئەو هەستە نەستییەی کە کۆمەڵەکەی دروستکردووە، لە یەکدەچن، ئەم هۆکارە نەستییە وادادەنرێت کە ئەنجامی ئەو

کاریگەرییە بۆماوەییە گشتییانەیەکە دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاکەکان هێندێکیان لە هێندێکی دیکەیان بچن، لەبەرئەمەی کاتێك تاکەکان لەناو کۆمەڵێکدا رێکدەخرێن جیاوازییەکانی نێوانیان کەمدەبێتەوەو تایبەتمەندییە نەستییە هاوبەشەکان لە نێوانیاندا دەردەکەوێتو بەهێزدەبێت. راکانی لۆبۆنو رای یارمەتیدەرەکانی کە راکانیان وەك رای (لۆبۆن) وایە، خزمەتی بیری رەگەزییان کردووەو جیاوازییان لە نێوان گەلە جیاوازەکاندا لەسەر بنەمای ژیری کۆمەڵی کردووە.

لێرەدا چەندین گەل هەن، رەفتاریان بەرزەو هەشیانە رەفتاریان نزمەو کاریگەرییان لەسەر بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی تاکەکان هەیە، هەروەها گەلی واش هەیە کە ژیرییەکی هۆشمەندی هەیەو گەلی واش هەیە کە ناتوانێت تاکەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیانو بەرژەوەندی کۆمەڵگە بەکاربهێنن. گۆستاف لۆبۆن چاوی بڕیوەتە سەر هەر دوو کاری (دووبارەبوونەوە)و سروش، قسەکەی بڕیوەتە سەر باسی کۆمەڵ لە بەرزترین پلەکانی یەکگرتندا، ئەمەش لەسەر دوو بنەما دەوەستێ، یەکەمیان / یەك ئامانجی ژیری، دووەمیان / نەمانی هەستی تاکەکان کاتێك دەچنە کۆمەڵەکەوە، گۆستاف پێناسەی کۆمەڵی کردووە :

بەوەی کە گروپێکی نەتەوەیی گشتییە، سەرەڕای جیاوازی رەگەزییو پیشەیی تیایاندا سیفاتی وا دروستدەبێت کە زۆر جیاوازە لە سیفاتی ئەو تاکانەی کە کۆمەڵەکەیان پێکهێناوە، هەستی خود وندەبێت، هەستەکانی دیکە هەموو بە کۆمەڵ بەرەوڕووی تەنها ئامانجێك دەڕۆن، لەمەوە گیانی گشتی کاتی دروستدەبێت، ئەو کاتە کۆمەڵ چەند سیفاتێکی تەواو ئاشکرای نوێی تێدا دروستدەبێت، ئەو کاتە کۆمەڵەکە بە شێوەیەکی پێچراوەیی (لفیف) تەواو دەردەکەوێت،

لۆبۆن ناوی ناوە کۆمەڵێکی رێکخراو، یان کۆمەڵی دەروونی، واتا ملکەچدەبێت بۆ یەکەی بیریی (وحدة الفكر)و بڕیارەکانی.

باوەڕی وایە کە بۆ دروستبوونی کۆمەڵێکی دەروونی، پێویست ناکات یەك شوێنیان هەبێت یان ژمارەیان زۆربێت، بەڵکو ئەوەی گرنگە ئاڕاستەی هەستەکانی کۆمەڵەکەو سۆزەکانیانو بیروبۆچوونەکانیان، بۆ یەك ئامانج بێتو هەستی تایبەتی خودی هەیە کە لە تاکەکانی کۆمەڵەکە ونبێت، بەڵام نیشانەکانی ئەو کۆمەڵەی ئەم مەرجانەی تێدا دابینکرابێت بریتییە لە توانایان بۆ کارکردن بەبێ بیرکردنەوە، بە رێگەیەك کە جیاوازە لەو رێگەیەی کە بە تاکی تێیدا هەستیان دەکردو بیریاندەکردەوەو کاریان تێدادەکرد، کۆمەڵ بەوە دیاریدەکرێت کە کاری تێدەکرێت بەو کارتێکەرە دەرەکییانەی کە رووبەڕووی ئەندامەکانی دەبێتەوە، چونکە خۆشباوەڕە، سۆزدارو هەڵچوون بەهێزە، حەز لە زاڵبوون یان ملکەچبوون یان دەمارگیریدەکات.

## گرنگیدان بە بیرۆکەی کۆمەڵ

گرنگیدان بە بیرۆکەی کۆمەڵ دەگەڕێتەوە بۆ زانا فەرەنسییەکان، کە لۆبۆنو دورکهایمو لیڤی برهل، باوەڕیان پێی هەبووە، زیادەڕۆییانکردووە لە گشتکردنیدا، لەبەرئەوە لەسەر بنەمای ژێری کۆمەڵی جیاوازیان لە نێوان گەلاندا کردووە، هەر لەسەر ئەم بنەمایە جیاوازییان لەنێوان رەگەزەکانو بنەما مرۆییەکاندا کردووە، ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە کە فەرەنسییەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا تا سەردەمی ئێستاش دژی رەگەزپەرستی بوون، کەچی هەر خۆیان لەسەر بنەمایەکی فەلسەفی دروستیانکردەوەو تۆوەکەیان بە جیهاندا بڵاوکردووەتەوە، بەڵام دەروونزانیی کۆمەڵی ئەمڕۆ لە پۆلێنکردنی

گەلەکانو تایبەتمەندییە بیرییەکانیاندا بە گوێرەی ژینگەی جوگرافیو رەگەزی لە یەك کاتدا لایداوەو فەرامۆشیکردووە، لەبەرئەوەی تاك تەنها بە خەڵکانی دیکەو بە رۆشنبیرییە کۆمەڵییەکان کاریتێدەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاریی بە خودێتی بایۆلۆجی خۆیەوە دەکات، نەرمی کۆئەندامی دەماری کەسەکە، رادەی کاریگەرییە رەهاکەی بەو کۆمەڵەوە کە پاڵی پێوەداوە دیاریدەکات، رادەی پەیبردنی کەسەکە، دەوەستێتە سەر رێژەی زیرەکییەکەی، گومانییە لەوەدا، کە تاکو کۆمەڵ هەریەکەیان کاردەکەنە سەر ئەویدیکەیان.

لۆبۆن دەڵێت جەماوەر هەستی کەسێتی مرۆڤ وندەکاتو نەستی کەسێتی دەردەکەوێت، کە پشت دەبەستێ بە کاریگەری سروشتی لەسەر ژیرییەکانو چاولێکەری تاکەکان، هێندێکیان لەسەر هێندێکی دیکە کۆتاییدێت، بە ونبوونی ژیریی تاکو زاڵبوونی ژیری کۆمەڵ کۆتاییدێت.

بەلام (ماکدۆگڵ) جیاوازییکردووە لە نێوان جەماوەرو کۆمەڵەکانی دیکەدا، ئەوانەی ملکەچدەبن بۆ رێکخستنێکی دیاریکراو، لە نێوان سیفاتە گشتییەکانی کۆمەڵو لە نێوان سیفاتی تاکەکانی کۆمەڵ، هەروەها جیاوازییکردوە لە نێوان رەفتاری تاکیو رەفتاری ئەو تاکەی کە لە نێو ئەو کۆمەڵەی کە هەموو سیفەتە گشتییەکانی تاکەکانی پێدەناسرێتەوە، بەلای ئەوەوە گەشەدەکات ئەگەر کۆمەڵەکە پەیوەستبوو بە یەکەوە، کۆمەڵ کاتێك هەست بە خودی خۆی دەکات، ئەگەر لێکیاندا لەگەڵ کۆمەڵەکانی دیکەدا. هەروەها نەریتو دروشمو باوەکانو پێوانەکان، ژیری کۆمەڵی دیاریدەکەن، هەروەکو چۆن رێکخستن یارمەتی رێکخستنی هێزی ژیری کۆمەڵی دەدات.

ماکدۆگڵ و لۆبۆن هەردووکیان کۆکن لەسەر بوونی (ژیریی کۆمەڵی)، بەڵام لۆبۆن وایدەبینێ کە ژیریی کۆمەڵی هەستییە، بەڵام ماکدۆگڵ وایدەبینێت کە نەستییە، دەیشیکاتە بنچینە بۆ راڤەکردنی هێزی کۆمەڵ، لەکاتێکدا ژیریی کۆمەڵی بە نەریتەکانو بەها کۆمەڵایەتییەکان کاریتێدەکرێت، بەلای ماکدۆگاڵەوە ژیری کۆمەڵ لە رێکخستنیدا پشت بە پلەی رێکخستنی کارەکان لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا دەبەستێت.

بەڵام (فرۆید) جیاوازیناکات لەنێوان دەروونزانیی تاکو دەروونزانیی کۆمەڵایەتییدا، دەڵێت: ژیانی تاك بەدەر نییە لە کاریگەریی، بە نموونەیەکی دیاریکراو لە تاکەکانی دیکە، واتا / رەفتاری تاك بە تاکی جیاوازی نییە لە رەفتاری ئەو تاکە کە ئەندامبێت لە کۆمەڵێکدا.

(ئۆلبورت)[1] پشت بە فرۆید دەبەستێتو دەڵێت:

سروشتی تاکەکان بە هاتنە ناوەوەیان بۆ کۆمەڵ ناگۆڕێت، بەڵکو کۆمەڵ خۆی ئەندامەکانی هاندەدات بە هەستان بە هێندێك لەو کارانەی کە لە دەرەوەی کۆمەڵەکەدا پێیهەڵناسن، بەڵام نامۆ نییە لەوان چونکە لە ئەنجامی رێکخستنیان لە کۆمەڵدا دەستیاننەکەوتووە. بەڵێ کۆمەڵ ئامادەگییەکانی ئەندامەکانی پەرەپێدەدات، بەڵام تایبەتمەندیی نوێیان تێدا دروستناکات.

[1] گۆردون ئۆلبورت -Allpert, Gordon- (١٨٩٧-١٩٦٧): دەروونزانێکی ئەمریکی بووە، گرنگترین پەرتووکەکانی ئەمانەن: (سایکۆلۆجی رادیۆ، سایکۆلۆجی قاوداخستن، سروشتی دەمارگیریی، ... هتد. — و –

## ڕەفتاری ئاپۆرەیی

جیهان بە شێوەیەکی بەردەوام چەندین جۆری جیاواز لە ئاپۆرەییەکان بەخۆوە دەبینێت، هەروەك چەندین قەسابخانەی بێ سەروبەر لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا ڕوویانداوە، هەروەك چەندین شار لەناوچوونو چەندین حاڵەتی ترسناکو تۆقاندن لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکان، یا کارەساتەکاندا بڵاوبونەتەوە.

کۆمەڵگای عێراق چەندین جیاوازی ئاپۆری بەخۆوە بینیوە، کاتێ هۆلاکۆ هاتە سەر دانیشتوانی بەغداد، چەندەها کرداری توندڕەوی تۆقێنەری بەرپاکرد، هەروەها چەندین ئاپۆرەی خوێنگەرمی شۆڕشگێڕ لە شۆڕشی ساڵی بیستداو ڕاپەڕینی کانونی ساڵی ١٩٤٨ دا دەرکەوتن ڕاپەڕینەکانی ساڵانی ١٩٥٢ و ١٩٥٦ و سەرتاسەری عێراق حەماسو زەبروزەنگی بەخۆیەوە دی، لە شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ دا، ڕاپەڕینەکەی (٨)ی شوباتی ساڵی ١٩٦٢ دا، جەماوەر لە موسڵو کەرکوك ساڵی ١٩٥٩، کۆبوّوەو جۆرێك لە زەبروزەنگی کۆمەڵی زاڵبوو بەسەریداو پاڵییپێوەنا بۆ کوشتنو ئازاردانو دەستگیرکردن، هەروەها چەند حاڵەتێکی ترسناك دەرکەوتن، بە کاردانەوەی دابەشکردنی (تۆوی خراپ) ساڵی ١٩٧٢ هەروەها دوای ڕووداوەکانی (أبو طبر) ساڵی ١٩٧٤.

لە دوتوێی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدەدەین بگەین بەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی دەرکەوتنی ئەو ئاپۆرانە. سروشتی ئەو کارکەرانە چیبو کە بوونە هۆی شەپۆلی خوێندکارانو توندوتیژییان لە شەستەکاندا، لە جۆرەها زانکۆکانداو لە چەندەها هەرێم لە وڵاتاندا؟ چۆن بەشداریکردنی چەندەها تاکو گروپی جۆراوجۆر لەو ئاپۆرانەدا

لێکدەدیتەوە؟ ئەو هۆکارانە کامانەن کە وای لەو ئاپۆرانە کردووە کە بتوانن چەندەها نموونەی جۆراوجۆر بە خۆیانەوە بلکێنن؟ چۆن شۆڕشی خوێندکاران درێژەی کێشا لە پاریسەوە بۆ کالیفۆرنیا، لەوێوە بۆ تۆکیۆو بەیروت، بێجگە لەوان بۆ زانکۆکانی دیکە؟

بۆ گەیشتن بە دیاریکردنی ئەو کارکەرانەی کە دەبنە هۆی ئەم رەفتارە ئاپۆرەییانەو کاریانتێدەکات، پێویستە لەسەرمان گرنگترین ئەو رایانە دەرخەین کە گرنگییان بە رواڵەتە کۆییەکان داوە، هەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە تاوەکو ئێستا. ئەم راوبۆچوونانە هەرچەند هێندێك لەوان وای وەسفدەکەن کە نابابەتییەو کاردانەوەی بڕیارەکانی پێشووە (prejuge's) بەلام بە هەر شێوەیەك بێت بۆتە هۆی پەرەپێدانی رایەکی زانستی لە لێکۆڵینەوەی ئاپۆرەدا، هەروەکو چۆن بۆتە هۆیەکی بایەخدار لە لێکۆڵینەوەکانی دەروونزانیی کۆمەڵایەتییدا.

لێکۆڵینەوەکانی گۆستاف لۆبۆن هەر لە ساڵی (١٨٩١)ەوە، ئەو رایانەی کە بۆ جاری یەکەم بە زمانی فەرەنسی ساڵی (١٨٩٥) لە دانراوە بەناوبانگەکەیدا (دەروونی ئاپۆرەکان) کۆیکردوونەتەوە، یارمەتی پەرەسەندنی ئەم بابەتەیانداوەو پاڵیان بەژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵەرەوەکان ناوە بۆ ئەوەی کە گرنگیبدەن بە لێکۆڵینەوەی ئاپۆرەکانو باری دەروونێکەی.

لە ساڵی (١٩٢٠) دا، (دین مارتن) لەو ئەو دانراوەیدا کە ناونراوە بە (رەفتاری ئاپۆرەکان)، وەسفێکی (ئاپۆرەکان)ی کردووە، هەوڵیداوە لەگەڵیدا پەرە بە راکانی لۆبۆن بدات.

لە ساڵی (١٩١٤)دا، ئۆلبورت شیکارێکی بۆ رەفتاری ئاپۆرەیی لە دانراوەکەیدا (دەروونزانیی کۆمەڵایەتی) زیادکرد. بەراستی ئەم لێکۆڵینەوانە، بوونە هۆی بایەخدان بە ئاپۆرەکانو لێکۆڵینەوەکردنی بە

لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی. بەدوای ئەمدا چەند راڤەکردنێکی دیکەی ئاپۆرەکان هات، وەکو / ئەو لێکۆڵینەوانەی کە خۆیان بە لێکۆڵینەوەی کرداریی نیشاندەداو کە هەر یەکە لە مۆللەر[1] و دۆلارد ئەنجامیانداو ساڵی (١٩٤١) لە دانراوێکدا بە ناوی (فێرکردنی کۆمەڵایەتیو چاولێکەری) بڵاویانکردەوە.

ئەم رایانە هێندێکیان کاریگەری زیاتریان هەبووە لە هێندێکی دیکەیان، بەجۆرێکی ئاوەها هێندێ جار وادەردەکەوت کە بەیکداچوون، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بۆ سێ روکار پۆلێنیانبکەین:

١- **روکاری یەکەم:** گۆستاف لۆبۆن نوێنەرایەتیدەکات، تا رادەیەکیش دین مارتن، دووپاتی رۆڵی ئاپۆرە خۆی دەکاتەوە.

٢- **رووکاری دووەم:** ئۆلبورت نوێنەرایەتیدەکات، پێ لەسەر رۆڵی تاك دادەگرن لە ئاپۆرەکەدا.

٣- **روکاری سێیەم:** ئەوەیە پێ لەسەر کاردانەوەی هۆکارە دەرەکییەکان، ئەوانەی دەگەڕێنەوە بۆ سروشتی ئەندامەکانی ئاپۆرەکە دادەگرن، هەر یەك لە مۆللەرو دۆلارد نوێنەرایەتییاندەکەن.

## روکاری یەکەم /

### ئەوانەن پێ لەسەر رۆڵی ئاپۆرەکان دادەگرن:

هەڵوێستی لایەنگرەکانی ئەم رایە کۆدەبنەوەو لەسەر دووپاتکردنەوەی ئەو رۆڵەی کە ئاپۆرە بەشێوەیەکی سەرەکی

---

[1] جۆن مۆللەر Muller Jone ، یەکێکە لە ئەندامەکانی کۆمەڵەی (بیل)، سەر بە زانکۆی (بیل) لە ئەمریکا، بەو تیۆرە بەناوبانگەی کە ناوی (تیۆری هاندان)ە کە لەگەڵ جۆن دولاردا دایانرێژاوە. - و -

دەیبینێت، لە ئاراستەکردنی رەفتاری تاکدا لە ئاپۆرەکەدا بە بۆچوونی ئەوان، ئەمەش بەبێ جیاوازی لە نێوان جۆرەکانی ئاپۆرەدا. ئەم روکارە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بە نوێنەرایەتی گابریل تاردو ئەنریکۆ ڤێریو گۆستاڤ لۆبۆن دەرکەوت.

بەڕاستی ئەنریکۆ ڤێری لە ئاپۆرە، یان لە جەماوەرو رەفتارەکانی لە چەند دانراوێکدا، وەکو (گیانی سیاسەت)و (گیانی سۆشیالیست)و (گیانی شۆڕشەکان)و (شۆڕشی فەرەنسی) دەکۆڵییەوەو روونیدەکردەوە، کە کۆمەڵ ئاستی رەوشتی ئەندامەکانی نزمدەکاتەوەو زیرەکییان دەهێنێتە خوارەوەو وایانلێدەکات شوێنی سۆزو ئارەزووەکانیان بکەون.

خۆ تاک وەکو (ڤێری) بۆیدەچێت، چەندێك رەوشتی بەرزبێت، چەندێك رۆشنبیریو ئاستی زیرەکی بڵندبێتەوە، هەر ئەوەندە چووە نێو هەر جۆرە ئاپۆرەیەکەوە، بە بیرکردنەوەی ساویلکەییو بە گوژمبردنی سۆزدارییەوە دەردەکەوێت. ئەمەش لە ئەنجامی ئەو (یاسا یەکبوونە ژیری)یەی کە ئەو ناوی‌ناوە، وەدەردەکەوێت. مادام وایە بیرکردنەوەی هەموو تاکەکان لە ئەنجامی چوونە نێو ئاپۆرەکەوە دەبن بە یەکێك.

بەڵام گابریل تارد، ئەو زانایەی کە بە تیۆرەکەی (سروشو چاولێکەری) ناسراوە، بەڕاستی روونیکردۆتەوە، کە هەموو ئاپۆرەکان لە بنچینەدا لە یەکدەچن، لەبەرئەوەی کە تاکەکانی هەموویان ملکەچن بۆ یاسای (سروشو چاولێکەری)، کاتێك کە تاکەکان بەهۆی چوونەپاڵ ئاپۆرەکە، چاو لە یەکتریدەکەن، ملکەچدەبن بۆ سروش، چونکە ئەندامەکانی ئاپۆرەکە وەکو ئەو کەسانە وان کە بە شێوازی موگناتیسی نوێنراون، وەڵامی هەموو ئەمرێك دەدەنەوە کە بە گوێیاندا هەڵدەدرێت.

هەروەکو چۆن روونیکردۆتەوە، کە راکانی خەڵکو سۆزەکانیان لە ئاپۆرەدا هێندێکیان پەیوەستدەبن بە هێندێکی دیکەیانەوە، لەبەرئەوەو لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی بیرکردنەوەدا یەکدەگرن. ئەمە دژی لێکدانەوەکەی (دورکهایم)ە ئەوەی کە باوەڕی وایە، رواڵەتە کۆمەڵایەتییەکان خۆیان دەسەپێنن بەسەر تاکەکاندا. واتا (تارد) پشتی بە یاسای (چاولێکەری) بەستووە، کە تەنها بریتییە لە درمێکی فکری لە تاکێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ تاکێکی دیکە، دەبێتە هۆی یەکبوونی رەفتار بەهەموو جۆرەکانییەوە، لە خرۆشان، زەبروزەنگ، تۆقین.

ئەمە بەسەر ئەو پەرەسەندنە کۆمەڵایەتییەشدا جێبەجێدەبێت، کە لە ئەنجامی چاولێکەری خەڵکییەوە بۆ یەکتری دەردەکەوێت. باشترین نموونە بۆ ئەم رووکارە هۆشمەندی فەرەنسی گۆستاف لۆبۆنە ئەوەی کە لە دانراوەکەیدا (Psychologie desfouies) (دەروونی ئاپۆرە)، ئەوەی کە لە ساڵی ١٨٩٥ بڵاویکردەوە، هەوڵیداوە تیۆرێك لە بارەی ئەم بابەتەوە دابڕێژێت، لەبەرئەوە بە کۆمەڵێکی زۆر درێژ لە شیکاری تایبەتمەندییەکانی دەروونی کۆمەڵەوە هاتەوە، بە هەوڵدانێکی زۆرەوە بۆ ئەوەی هێزو توانای کۆمەڵ باسبکات، کە تا چ رادیەك کاردانەوەی لەسەر ئەو تاکانەی کە پێکیانهێناوە هەیە، بەڕاستی وەسفی سروشتی باری هەڵچوونی کەسی نێو ئاپۆرەی کردووە، کە چۆن باری نەستی بەسەر رەفتاریدا زاڵدەبێت. ئەمجا لەبەر گرنگیی ئەو رایانەی کە لۆبۆن هێناویێتی، هەوڵدەدەین لەمەودوا بە کورتی نیشانیانبدەین، دوای ئەوە دەگوێزینەوە بۆ نیشاندانی راکانی دین مارتن.

## تیۆرەکەی گۆستاف لۆبۆن:

لۆبۆن باوەڕی وایە، هەر ئەوەندە تاك چووە نێو ئاپۆرەوەو یان چووە پاڵ ئاپۆرە، بیرکردنەوەی لە کار دەوەستێتو وەکو (ئامرازی جولاوی) لێدێت، بای ئاپۆرەکە هەڵیدەگرێتو بە ئارەزووی خۆی دەیجولێنێت، ئاپۆرەش بەگوێرەی باوەڕی لۆبۆن، تایبەتمەندییەکانی جیاوازییان هەیە، لە تایبەتمەندییەکانی ئەندامەکانی، واتا بە (سەروی تاکی) – Suprindvi dueiie) دایدەنێت، بە بۆچوونی ئەو ئەندامەکانی ئاپۆرە لە تایبەتمەنییە بۆماوە گشتییە یەکتوخمەکاندا لە یەکدەچن، ئەوانەی لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی دیکە دەگوێزرێنەوەو دەبنە هۆی دروستبوونی ئەوەی کە ناوی دەنێن (گیانی کۆمەڵی).

ئاپۆرە وەکو لۆبۆن دەیبینێت، تەنها کۆمەڵێك لە خەڵك نییە، بەڵکو وا مەزەندە دەکرێت، کە حاڵەتێکی ژێری تایبەتی هەیە، کە ناوی ناوە گیانی کۆمەڵی. ئەم گیانە کۆمەڵییە، لەو ئارەزووە نەستیانە پێکدێت کە بەشە لە نێوان هەموو تاکەکانی یەك توخمدا، بەڵام کاتێك لە گیانی یان ژێری ئەو تاکانەی ئاپۆرەکەیان دروستکردووە، جیادەبێتەوە. توانستەکانی تاکو تایبەتمەندییەکانی کەسێتی بە شێوەیەکی کاتی دەوەستێت، بۆئەوەی ئەو کارکەرە شاراوە نەستییانە جێگەیان بگرێتەوە، لەو شتانەی کە دەبنە هۆی وەستاندنی باری ژێری تاکەکانو نەتوانینیان لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پلەیەکی بەرزی زیرەکیان پێویستە.

بەڕاستی لۆبۆن ئەم تایبەتمەندییە دەروونییانەی گرۆ (کۆمەڵ)ی شیتەڵکردووەو لە نۆ خاڵدا دیاریکردووە، بەڵام ئێمە قەدبڕی لە سێ خاڵدا کۆیاندەکەینەوە:

١- هەڤچاندن: لۆبۆن باوەڕی وایە کە بیرەکانو سۆزەکانو بەڵگەکانو ئامانجەکانو بەشدارەکان، هەر هەموویان لە ئاپۆرەکەدا، یەکدەکەون، ئەویش پشتبەستن بە یاسای (یەکبونی ژیری)، ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی چەند بیروباوەڕێکو پشتگیریکردنیو مەودانەدان بۆ گفتوگۆو بەرهەڵستیکردن، ئەو کاتە ئاپۆرەکە تەکاندەدات بۆ جێبەجێکردنی مەبەستەکانی، چونکە هەست بە توانا و هێزی سەرکەوتنی دەبێتو پاڵیپێوەدەنێت بۆ ئەوە هەست بە لێپرسینەوە بەرامبەر کردەوەکانی نەکات، هەرچەند دزێون. ئەمە وایلێدەکات گوژمبەر بێت، توندڕەو بێت، رەقبێت لە بیرکردنەوەکانیدا، نیشانە جوێکەرەوەکانی رووداوەکان پشتگوێدەخات، ئەو بڕیارانەی کە لە بارەیانەوە دەریدەکات، سنورگیرو تەواوەو کۆتایین، شت بە لایەوە یان رەشە یان سپییە رەنگی دیکەی نییە.

٢- وروژاندنو خرۆشاندن: تاك لەژێر کاریگەری خێراو کتوپڕدا، دەکەوێتە نێو ئاپۆرەوە، ئاپۆرە لە خۆشبڕوایی خۆیدا توشی توندڕەوی دەبێت. ئەمەش رێگە بۆ دروستبوونی ئەفسانەو بڵاوبوونەوەی قاوداخستن زۆر بە ئاسانی خۆشدەکات، بەڵام ئەم سۆزدارییە بە جێنەگیریو نەچەسپیوی وەسفدەکرێت، چونکە ئەو سۆزانە بۆ گۆڕانی خێراو کتوپڕ ملکەچن.

ئەمە وا لە ئاپۆرەکە دەکات، بە شێوەیەکی کوێرانە ملکەچبێت، بۆ هێز یان بۆ زاڵیو زۆردار، ئەوەی زیاتر پاڵیپێوەدەنێت بۆ وەرگرتنی پاڵنەرە سەرەتاییەکان، ملکەچبونێتی بۆ سروشو بڵاوبوونەوەی درمی لەیەکچوون لەگەڵ کەسانی دیکەدا. تاك لە ئاپۆرەکەدا وەکو خەوێنراوی موگناتیسی رەفتاردەکات، وەڵامی هەموو ئەوانە دەداتەوە کە بە گوێیدادەدرێت.

٣- ساویلکەیی: بیرکردنەوەی ئاپۆرە بە ساویلکەیی دادەنرێت، چونکە تاك لە ئاپۆرەدا ناتوانێت ئەو کارانە ئەنجامبدات کە پێویستی بە پلەیەکی بەرزی زیرەکی هەیە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەندامەکانی ناتوانن پشت بە لۆجیکو (بابەتیی – الموضوعیة) لە شیتەڵکردندا ببەستن، ئا لەبەرئەمەیە کە ئاپۆرە سەرەتاییە لە رەفتارەکانیدا.

جاری وا هەیە ئاپۆرە سەرگەرمدەبێت بە تالانوبڕۆو کوشتنو راکێشانو بڕینو روخاندنەوە، بەهۆی نەمانی هەستی رەوشتی لای ئەندامەکانی، ئەمەش بەهۆی دوچاربوونی سەرکوتکردنی پاڵنەرە خۆپەرستییەکانی، جاری واش هەیە لەپڕ دەگۆڕێنو زیادەڕەویدەکەن لە رەفتارکردنی باشدا لە هێندە کارێکی دیاریکراودا، لە رێگەی قوربانیدانو دڵسۆزی زۆرەوە، وەردەگەڕێن بە هەرەوەزییکردنو کاری پڕ بە بەزەیی. بەڵام ئەو کارکەرانەی کە رێگە بۆ دەرکەوتنی ئەم رەوشانە خۆشدەکەن لە بۆچوونی لۆبۆندا، دەتوانین کورتیانبکەینەوە لەمانەی خوارەوەدا:

١- کارکەری چاولێکەریو درمی فیکری: سۆزەکانو راکان لە ئاپۆرەدا کار لە یەك دەکەنو دەبنە هۆی گرێدانی ئەندامەکانی ئاپۆرەکە هێندێکیان بە هێندێکیانەوە، ئەمەش بەبێ بیرکردنەوەو هەستپێکردن. ئەم کار لەیەککردنەو گواستنەوەیە، بە شێوەیەکی راستەوخۆ تەواودەبێت، بە جۆرێك کە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی یاسای (هەڤچاندن).

بەڕاستی (لۆبۆن) دەیویست لەدوای ئەوەوە، پێچەوانەی ئەوە بسەلمێنێت، کە (دورکهایم) هێنابوی، کە رواڵەتە کۆمەڵایەتییەکان بەوە راڤەناکرێت کە جەخت لەسەر تاکەکان دەکات، بەڵکو لە ئەنجامی کارکەری چاولێکەری راستەوخۆ ئەو رواڵەتانە دەگوێزرێنەوەو یەکدەگرن. هەر

ئاوهاش راکانو بیروباوەڕەکانو هەموو جۆرێکی رەفتاری کۆمەڵی لە دەمارگیرییو زەبروزەنگ بڵاودەبنەوە. بەڕاستی لەم رووەوە لۆبۆن بە تاردو تیۆرەکەی (درمی ژیری) ئەوەی ساڵی ١٨٩٣ دایناوە، کاریتێکراوە.

٢- سروشی ژیریو هەڵفریواندن: بیرۆکەی کۆمەڵ لە ئاپۆرەدا بە رای لۆبۆن زاڵدەبێت، بە جۆرێك وایلێدەکات وەکو خەوێنراوی موگناتیسی لێبێت، بیرکردنەوەی بوەستێت، رەفتارەکانی بۆ ژیری کۆمەڵی ملکەچبێت، ئەندامەکانی ئاپۆرەکە وەکو ئامێری ملکەچیان لێدێت، یان وەکو / رانێکیان لێدێت، کە سۆز رایاندەکێشێت، ئالێرەدا پێویستیان بە پێشەوادەبێت.

ئاپورە لێرەدا وەکو رانێك وایە کە پێویستی بە شوان بێت. لۆبۆن باوەڕی وایە کە پێشەوا لە ئاپۆرەدا ئەویش پێش ئەوەی بچێتە ئاپۆرەکەوە، بیرکردنەوەی دەوەستێت، چونکە سەرگەرمی ئاپۆرەکە دەبێت. مەرج نییە پێشەوا زیرەك بێت، توانستێکی زیرەکی بە رادەیەکبێت کە بتوانێت پێشەنگی ئاپۆرەکە بکات، بەڵکو بۆ ئەمە دەمارگیریو داجمانو ناوبانگباشیو جێگەی متمانەی کۆمەڵایەتی (prestige) تێداهەبێت. ئەو جێگە باوەڕەیشی لە ئەنجامی سامان، یان هێزێکی خارقەوە بەدەستهێنابێت هەروەکو چۆن بووە لای ناپلیۆن، یان جاندارك، لەوانەیە ئەمانە لە ریزی پێشەوا زۆرداره کەمئەقڵەکاندا دابنرێن.

٣- هەستکردن بە هێز: بەڕاستی زۆری ئەندامانی ئاپۆرەکە یارمەتیدەدات کە هەست بە هێزی خۆیان بکەن، ئەوەش وایان لێدەکات لە سزاو بەرپرسی بیرنەکەنەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی رەوشتی ئاپۆرەکە بە رادەیەك کە جاری وا هەیە پاڵیانپێوەدەنێت بۆ ئەنجامدانی ناشیرینترین تاوان لە رووخان، کوشتن، ئەتککردن. بەڕاستی لۆبۆن

بیرۆکەکەی لەبارەی ژیری ئاپۆرەوە ئەوەندە فراوانکرد بەجۆرێك هەموو تاکەکانی گرتبوّوە، لەگەڵ چاوپۆشیکردن لە تەمەنو رەگەزیش، با رووبەڕوو لە نێو ئاپۆرەکەیشدا نەبونایە.

بەڕاستی سروش، هەروەکو چۆن لۆبن بۆی دەچوو لەنێویاندا دەگەڕێت، درمی لەیەکچونیش رایاندەماڵێت، بە جۆرێك هەمان ئەو تایبەتمەندییانەی کە لەو کۆمەڵانەدا هەن کە روبەڕوو کار لەیەکدەکەن لەوانیشدا هەن لە نێو ئاپۆرەکەدان لەمانیشدا هەن. لۆبۆن جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵە شۆڕشگێڕەکانو خۆنیشاندەرانو حاڵەتەکانی زەبروزەنگو بێجگە لەوانەش پشتگوێخستووە، هەر هەموویانی بە رواڵەتی جەماوەری شۆڕشگێڕی دەستدرێژکاری روخێنەر داناوە.

ئا ئەمە خستویّتیە هەڵەوەو تووشی رەخنەی فراوانیکردووە، بەڕاستی لۆبۆن دڵنەوایی ئەو روکارەی کردووە کە باوبووە لەو سەردەمەدا، لەبەرئەوە چونییەکی کردووە لەنێوان ئارەزووە نەستییەکانی ئەندامانی ئاپۆرەکەداو لەنێوان کەلەپوری شارستانیدا، لەوانەی کە پاڵیانپێوەناوە بۆ جیاوازیکردن لەنێوان گەلاندا لەسەر بنەمای (ژیریی کۆمەڵی)، لەبەرئەوە رونیکردۆتەوە کە گەلانێك هەن ژیری کۆمەڵییان بەرزەو گەلانێکیش هەن ژیری کۆمەڵییان نزمە.

ئەم رایانەی خزمەتێکی زۆری بە حوکمی تاکی دیکتاتۆری گەیاندووە، ئەوەش لەبەرئەوەی گومانی هەبووە لە حوکمی جەماوەردا، لەبەر چەند تێبینییەکی دیاریکراو بەسەر هەموو جەماوەرێکدا گشتاندویّتی، بەبێ لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانە، لەبەرئەوەی رای تاکی بە چاکتر زانیوە لە رای کۆمەڵ. هەروەکو چۆن خزمەتی جیاوازیی رەگەزی کردووە، لەبەرئەوەی جیاوازیکردووە لەنێوان رەگەزەکانو

گەلەکاندا، لەسەر بنەمای بوونی جیاوازی لە نێوانیاندا لە (ژێری کۆمەڵیدا). لۆبۆن ئەوەی لەبیرچووە کە گفتوگۆو دەمەتەقێی کۆمەڵی، بەگشتی زۆرینەی جار دەبێتە هۆی تەتەڵەی رایەکی زۆر رەسەن.

تێبینی ئەوە دەکرێت کە لۆبۆن لە راکانیدا بەرامبەر ئاپۆرە کارمەندبووە بە لێتۆژینەوەکانی خەواندنی موگناتیسیو ئەوانەی کە لە کاتی خۆیدا بانگەشەی بۆ دەکردن لە چەمکەکانی سروشو نەستو رەفتاری رەمەکیو رەفتاری داجمانو پاشەکشێ لە ئاستە جۆربەجۆرەکانی رەفتار.

**تیۆرکەی مارتن لە رەفتاری ئاپۆرەدا:**

یەکێك لەو زانایانەی کە بتوانین بیانخەینە ژێر ئەم روکارەوە، زانا دین مارتنە، ئەوەی لە یەککاتدا پشتی بە راکانی لۆبۆنو فرۆید بەستووە، ئەو باوەڕی وایە، هەموو کۆمەڵێك لە خەڵك، لەوانەیە بگۆڕێت بۆ ئاپۆرە، ئەگەر ئەندامەکانی هەموویان پێکەوە هۆشبدەنە کارێکی دیاریکراو.

مارتن لەگەڵ لۆبۆندا رێکدەکەون لەوەدا، کە ئاپۆرە هەڵوێستێکە دەبێتە هۆی بەرەڵابوونی ئارەزووە نەستییەکانی ئەندامەکانی، ئەمەش لەبەرئەوە روودەدات چونکە ئەندامەکانی هەستیان لەکیسدەدەن، بەڵام لەبارەی دەرکەوتنی ژێری کۆمەڵییەوە ناکۆکن، بەڵام مارتن کەڵك وەردەگرێت لەو پێشکەوتنەی کە سایکۆلۆجی فرۆید لەبارەی پاڵنەرەکانی رەفتاری ئاپۆرەوە پێیگەیشتووە، بە هەڵبژاردنی نیشانە جۆێکەرەوەکانی ئاپۆرەکە. بینا لەسەر ئەوە بەڕاستی مارتن ئاپۆرە بە بارێکی ژێری دیاریکراودادەنێت کە کاردەکاتە سەر کۆمەڵەکە، بەهۆی

لە کارکەوتنی بیرۆکە جڵەوگرەوەکانی (الافكار الضابطة) ئەندامەکان[1]، لە ئەنجامدانی فرمانەکانیدا لە ژینگە کۆمەڵایەتییە راستەوخۆکەدا، ئەوکاتە دەبێتە هۆی سەربەخۆبونو بەرەڵابوونی ورووژێنەرە ناوەکییە خەفەکراوەکاندا.

لە نموونەی ئەم بیرۆکە جڵەگرەوەدا کە هەموو ئەندامێك لە ئاپۆرەکە یەکە بەشداریتێدادەکەن، کە باوەڕبوونە بە گوناهیی ژیانی مرۆڤ بەفیڕۆدان، باوەڕبوونە بەوەی کە هەڵەیە، روخاندنی موڵکو ماڵی خەڵکی، باوەڕبونە بەوەی کە لێدانو سزادانی خەڵکی کەسێکی دەروونزمو هەتیوچە نەبێت، ئەنجامینادات، بێجگە لەوانەش لەو بیروباوەڕە جڵەوگرەوانەی ئاڕاستەیدەکەن.

مارتن بەلایەوە وایە ئاپۆرە نموونەیەکی گۆڕاوی ژینگەی کۆمەڵایەتییە، بەهۆی کاردانەوەی ئاڵوگۆڕ لەنێوان تاکەکانی ئاپۆرەدا. مارتن دان بە بوونی ئەم چاودێرە، واتا بیرۆکەی جڵەوگرەوەدا یان ئەم خودی باڵایەدا دەنێت، چونکە زاڵدەبێت بەسەر رەفتارەکانداو رۆڵی خۆیشی دەبینێت، بەڵام بە شێوەیەکی نەستیو ئافەرینی دواپینەی ئاپۆرەکەیشی بەدەستدەهێنێت. ئەمەش لە رێگەی ئەو پێشەوایەی کە ئارەزوو سۆزەکانی ئەندامەکانی ئاپۆرەکە دەورووژێنێتو ئاڕاستەیدەکات بۆ ئەوەی تەنها گرنگی بدرێت بە پێوانەی رەوشتی گشتی رووت، گۆڕانی ژینگە کۆمەڵایەتییەکە بەهۆی کاردانەوەی ئاڵوگۆڕی نێوان تاکەکان پەیدادەبێت.

---

[1] بیرۆکەی جڵەوگرەوەی ئەندامەکان، بریتییە لە کۆئەندامی دەمار، چونکە ئەو لە کاتی داجمانی ئەندامانی ئاپۆرەکەدا لەکاردەوەستێت، کە ئەندامانی کۆمەڵەکە لە یەك جودابوونەوەو هەر یەك بە لایەکدا رۆیشتن ئەوکاتە دەستدەکاتەوە بەکار. — و –

مارتن لەم بارەیەوە دەڵێت:

هەر ئەوەندە تاك چووە پاڵ ئاپۆرەكە، بەربەرەكانییەكی بنچینەیی لەنێوان رەفتارە ئاساییە پەسەنكراوەكانی تاكدا لەلایەن كۆمەڵەوە، لەنێوان ئارەزووە سەرەتاییە نامرۆڤانەكانیدا هەڵدەگرسێت" ئەم بەربەرەكانییە دەبێتە هۆی توشبوونی حاڵەتی وڕێنە[1]، چونكە تاكەكان رێگەیەكی گۆشەگیر دەگرن بۆ چارەسەری هەڵوێستەكە. هەڵوێستی ئاپۆرەكە گۆڕانێكی نەستی لەسەر واتای پێوانە كۆمەڵایەتییەكان لەنێو ئاپۆرەكەدا زیاددەكات. ئەو رەفتارانەی كە لە حاڵەتی ئاساییدا خەڵكی بە ناشیرینیان دادەنێن لەڕاستیشدا ناشیرینن، هەڵوێستی ئاپۆرەكە بە رەفتاری باش رەنگیاندەكات بۆ ئەندامەكانی.

مارتن لە لێكۆڵینەوەكەیدا بۆ ئاپۆرە، جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە، كە پاڵنەرە راستییە مرۆڤایەتییەكان بە متیو نەناسراوی دەمێننەوە، جاری وا هەیە ئەو پاڵنەرانە بە روپۆشی رەوا روپۆشكراون، یان بە مەبەستی راستو پیرۆز داپۆشراون، ئەو مەبەستەیەكە وا لە مرۆڤ دەكات بۆ ئەنجامدانی پەنابەرێت بۆ بەكارهێنانی جۆرەها ئامێری گونجاو. ئەندامەكانی ئاپۆرەكە توانای جیاكردنەوەیان لەنێوان راستو گوماندا لە دەستدەدەن، بە تایبەتی لە لوتكەی خرۆشانو داجمانی شێتانەیاندا.

رەفتاری ئاپۆرەكە بریتییە لە كۆششێكی كۆمەڵی بۆ خۆدورگرتن لە راستیو راكردن لێی. ئالێرەدا نیشانەو نموونە بالاكانی هەموو

---

[1] حاڵەتی وڕێنە، یان بەربەرەكانی وڕێنە (war-psychosis) ، جۆری زۆرە، ئەو جۆرەی بۆ ئەمە دەگونجێت ئەوەیە كەوا لەو كۆمەڵە دەكات، بخرۆشێنو حەز بە كوشتنو بڕینبكەن، چونكە باوەڕێكی وایان بۆ دروستدەبێت، كە شەڕ گونجاوترین رێگەیە بۆ چارەسەر. - و -

ئاپۆرەیەك وەدەردەکەوێت، کە هەمووی خەیاڵو تامۆراییە، لە نیشانەو نموونە باڵاکانی ئەو کەسانە دەچن کە توشی شێتی گەورە درۆیینە[1] بوون. بۆ نموونە / لە کاتی ئاهەنگکردنی ئاینییدا، ئەو قومارچیو سەرخۆشو دەستبڕو تاوانکارو فاشلانەی کە بەشداریدەکەن بە خەیاڵی خۆیان ئارەزووشکێن، جێگەی شانازی خواوەندبن. ئەمجا لە ئاپۆرەیشدا، پێشەواکانی خۆیان بە پاڵەوانی دڵسۆزو خاوەن هێزێکی نهێنی نادیار دادەنێن، کە ئەندامەکانی ئاپۆرەکەش بە ڕێگەیەکی نەستی بەشدارن لەگەڵیاندا. کۆمەڵی (ئاپورە)تەنها بە شێتیی گەورە درۆزنە ناناسرێتەوە، بەڵکو بە شێتیی چەوساندنەوەش هەر دەناسرێتەوە.

لەبەرئەوەی ئەم ئاپورەیە لەسەر رقوکینەی خەفەکراو راهاتووە، تاکەکانی لە توندڕەویو دڵڕەقیوچەوسانەوەو ئازاردانەوە دەستپێدەکەنو هێرشدەبەن.

بەڕاستی مارتن لە چارەسەرکردنی ئاپۆرەکاندا لەلایەن فرۆیدو قوتابخانەی دەروون شیتەڵیەوە کاریتێکراوە، بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە جەختکردن لەسەر کاریگەری ئاپۆرە وە لەسەر نەستی تاکو ئارەزووە خۆویستە کپکراوەکانی ئەوانەی بە کاریگەری راگرتنی کۆمەڵایەتیو هۆکارەکانی دادەنرین وەکو نەریتەکانو دابەکانو ئاینو یاساو رەوشت کپکراوون. ئەم ترسە لای کەسەکە چووە ئاپۆرەکەوە، لەلایەکەوە زیاتر پاڵیپێوەدەنێت، لەلایەکی دیکەوە ئەبێتە

---

[1] شێتی گەورە درۆیینە (المصاب بجنون حبّ العظمة)، بەو کەسە دەوترێت خۆی بە گەورە، یان بە باش دادەنێت، کەچی وانییە، هێندێك زانا پێیدەڵێن: شێتی گەورەی مەزن. - و -

هۆی ڕاڕاییو نائارامی، ئەمەش دەبێتە هۆی هەواداری بۆ بیروبۆچوونە نموونەییە ڕووتەکانی.

ئەو ڕەخنانەی لە شیکارەکانی (مارتن) دەگیرێن، ئەوەیە:-

کە زیاتر جەختی لەسەر پاڵنەرە نەستییەکانی نێو ئاپۆرەکە کردۆتەوە، بەڵام باسکردنی ئاپۆرەکەو ئەو دەوروبەرەی کە دروستیکردووە، پشتگوێ خستووە، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەوە لەکاتی ڕاقەکردنی چۆنێتی ملکەچبونی ئەندامەکانی، بۆپێوانە نوێکان، تەنها گرنگی بە بنەما ڕووتەکان داوە.

هەروەها ئەوەشی لێکداوەتەوە، کە چۆن چۆنی ئەندامەکانی ئاپۆرەکە بەشێوەیەکی نەستی ئارەزووکانو پاڵنەرەکانی ئەندامەکانی دیکە دەزانن، ئەوانەی کە لە پاڵنەرە ئارەزووکانی ئەمان دەچن.

## ڕوکاری دووەم:

ئەوانەن کە جەخت لەسەر ڕۆڵی تاك دەکەنەوە:- کۆمەڵێکی دیکە لە زانایانی دەروونزانیی کۆمەڵایەتی جەخت لەسەر ڕۆڵی تاك دەکەنەوە لەناو ئاپۆرەکەدا، بەو مانایەی کە ئەم ڕۆڵە تەنها بالادەستە بەسەر ڕەفتاری ئاپۆرەکەدا بە تەواوەتی، (ئەلبورت) بە ناسراوترینی ئەم زانایانە دادەنرێت.

ئاپۆرە لە تێڕوانینی ئەلبورتدا، بریتییە لە کۆمەڵە تاکێك، کە هەوڵدەدەن بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی هاوبەش کە لە بارودۆخی ئاساییدا نەیانتوانیوە ئارەزووەکانیان جێبەجێبکەن، هەر بۆیە پاڵنەری سەرەکیی لێرەدا پاڵپێوەناون بۆ ڕەفتاری دەستدرێژیکردن بە شێوەیەکی هەستیو نەستی، ئەم ڕەفتاری دەستدرێژیکردنەش لە ژێرییەکی کۆمەڵییەوە دەرناچێت کە زاڵدەبێت بەسەر تاکەکاندا وەکو(لۆبۆن) بۆیدەچێت، بەڵکو ئەم ڕەفتارە لەئەنجامی

بەرەوپێشەوەچوونی تاکەکانو بەپەرۆشییان، بۆ تێرکردنی ئارەزووە بنچینەییەکانیان، بەشێوەیەکی کۆمەڵی دەردەچێت.

وەکو رەفتاری ئاپۆرە لە بنچینەدا وێنەیەکی هەڵاوساوو چەندانەکراوە، لە رەفتاری تاك، تاك لە ئاپۆرەدا ژیریی کۆمەڵی بەسەریدا زاڵنابێت، هەر وەك ( لۆبۆن دەبینێ)، بەڵکو ئەم ژیرییە بە رێگەیەکی نائاشکرا لە کەسێکی رێکوپێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی دیکە وەکو درندەیەك رەفتار دەنوێنێت، ئەگەر هاتو بە تەنها بێت، بەلام بە شێوەیەکی گەورەکراو رەفتاردەکات کاتێ کە لەئاپۆرەکەدا هەیە.

ئەو کۆمەڵە ئاپۆرانەی کەوا هێرشیانکردە سەر قەڵای باستیل لەکاتی شۆرشی فەرەنسیدا کەسانی وای تێدا بوو کە ستەمیانلێکرابوو یان خزمو هاورێکانیان تێدا بەندکرابوون.

ئەم هێرشکەرانە ئەوەیان روونکردەوە کە ئارەزوویان لەبەرەوپێشەوە چووندا هەبووە بۆ قەڵاکە.

(ئەلبورت) جەخت لەسەر رۆڵی پێشەواو گرنگییەکەی لە کرداری ئاسانکردنی کۆمەڵایەتییدا لە ئاپورەکەدا دەکاتەوە، دەریدەخات پێشەوایەکی لێهاتوو ئاستی گرنگی رەفتاری دەربڕ دەزانێتو بەدەستی ئەنقەست هەڵچوونو پەرۆشبوونی جەماوەرەکە دەورووژێنێتو لە ئەنجامی ئەمەدا بەچەند وەڵامێکی ئاشکرا دەگات، وەکو چەپڵە لێدانو هوتافکێشانو گۆرانیوتن، پێشەوا وادادەنرێت کە هۆکارێکی گرنگە لە خاوکردنەوەی بەها کۆمەڵایەتیەکانداو لە یەکریزی تاکەکانی ئاپۆرەکەدا، نەك تەنها لەرووی دەروونییەوە بەڵکو لە رووی جەستەییشەوە. واتای وایە بوونی تاك لەگەڵ کەسانی دیکە واتا: ئەوانەی کە هەستاون بەهەمان کار، بەپەرۆشبوونی تاك زیاتر دەکاتو وەلامەکانیشی توندو تیژ دەکات، هەرچەند تاك زیاتر زەبری تیادابێتو

بەرەوپێشەوە بڕوات لە چەپڵە لێدانو هوتافکێشاندا، زیاتر کەسانی دیکەی دەوروبەری دەوروژێنێتو زیاتر کاردەکاتە سەر کەسەکان، لە هێرشـپێبردنیاندا. (ئەلبورت) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئامادەبوونی لەشیی لای تاکەکان ئەوانەی کە وەڵام بۆ یەك بیرۆکە دەدەنەوە، هەستێك لای تاکەکانی ئاپۆرەکە دروستدەکەن، بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئەم بیرۆکەیەوە لای هەمووان.

دەربڕینی پێشەوا بۆ پەسەندکردنی بیرۆکەیەك، ئەندامەکانی کۆمەڵەکە قایلدەکات لەسەر ئەوەی رازییاندەکات کە بیرۆکەکە رای هەموو ئەندامانی کۆمەڵەکەیە، هەروەها (ئەلبورت) دەڵێت:

ئەو وروژاندنەی کە تاك دەیقۆزێتەوە بە ئامادەبوونی هەموو ئەندامانی ئاپۆرەکە، پاڵیانپێوەدەنێت بۆ زیادبوونی چالاکی بە ئاشکرا.

لە کۆتاییدا ئاپۆرە بوارێکی فراوان دەڕەخسێنێت بۆ چارەسەری ململانێ دەروونییەکان لەلای ئەندامەکانی، ئەمەش لەئەنجامی لاوازیو خاوبوونەوەی راگرە کۆمەڵایەتیەکانەوەیە، هەروەك مارتن ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە.

لەراستیدا نازییەکان بە کارامەیی ئەم رایەیان قۆستەوە، ئەو کەسانەی کە پەسەندی دڕندایەتیو هێزی گەورەیی ئەوانی دەکرد، بە پاڵەوانیان دادەنا، سەرەڕای ئەوەش (ئەلبورتو لۆبۆن) هەردووکیان رازیمەندن لەبارەی کارتێکردنی تاکەوە لەلایەن کەسانی دیکەی ئەندامانی ئاپۆرەکەوە، بەڵام لەلایەکی دیکەوە جیاوازن لەبارەی ئەوشتەی کە پێیدەوترێت گیانی کۆمەڵی. ئەگەر بەراووردمانکرد لەنێوان رەفتاری دوو ئاپۆرەی جیاوازدا، کە هەریەکێکیان پێکهاتبێت لە کۆمەڵە تاکێکی جیاواز، دەبینین جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوانیاندا، بەهۆی جیاوازی سروشتی تاکەکانەوە. تاکەکان تایبەتمەندیەکانیان ونناکەن

لە ئاپۆرەدا، هەتا سۆزیان بەهێزبێتو ملکەچبن بۆ لاساییکردنەوەی هێندێکیان بۆ هێندێکی دیکەیان، ئەم رایە ئەو لێکۆڵینەوەیە دووپاتدەکاتەوە کە هەر یەکە لە( کانتورلو کودیەو هیرتزوك) پێیهەستان، بۆ بەرنامەیەکی رادیۆیی کە رۆماننووس (وێلز) پێشکەشیکرد لەبارەی جەنگی ئەو خەڵکانەی کە لە مەریخەوە دابەزیوونەتە سەر هەرێمی نیوجەرسی لە ١٩٣٨/١٠/٣٠داو گوێگرەکان ئەمەیان بە هەواڵ زانی، لەگەڵ ئەوەشدا لەبارەی ئەم هەواڵەوە ملکەچنەبوون بۆ رەفتاری کۆیی تەنها ملیۆنێك کەسی ئەمریکی نەبێت لە تێکڕای شەش ملیۆن کەس. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ملکەچبوون بۆ رەفتاری کۆیی دەوەستێتە سەر کەسێتی تاك، وەکو هەستکردنی تاکەکە بە راڕاییو پەشێوی دەروونیی.

**روکاری سێیەم:**

ئەوانەی کە جەخت لەسەر رۆڵی هۆکارە دەروونیەکان دەکەنەوە لەسەر تاکو ئاپۆرە:- یارمەتیدەرائی ئەم رایە لە کاتێکدا گرنگیدەدەن بە لێکۆڵینەوەی رەفتاری تاك لە ئاپۆرەدا، چاودەبڕنە سەر ئەو هۆکارە دەرەکییانەی کە لە ویستی تاکو لەسەر رۆڵی کۆ بەدەرن، ئەو هۆکارە کاریگەرانەی لەسەر رەفتاری تاكو ئاپورە دەیگەڕێننەوە بۆ هۆکارە ئابووریيو کۆمەڵایەتیەکان کە چەند هۆکارێکی کاتیی دەیانجوڵێنن.

لەڕاستیدا ئەم رووکارە لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لە کۆتاییەکانی نیوەی سەدەی رابردوودا سەریهەڵدا، ئەو لێکۆڵینەوەی کە (میلەرو دولارد) پێکەوە لە ساڵی ١٩٤١ ئەنجامیاندا ناسراوترین لێکۆڵینەوەیە لەم رووەوە.

ئەم دوو زانایە وایدەبینن کە سێ هۆکار هەن کاردەکەنە سەر دروستبوونی (ئاپورەی لەنشی)[1] ئەوانەش بریتین لە:-
هۆکارە ئابوورییەکان، هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان، هۆکارە لاوەکییەکان، لەماوەی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە ئەم دوو توێژەرە ساڵی ١٩٤١دا بۆ رواڵەتە لەنشییەکان کردیان، گەیشتن بەوەی کە ئەم کارە لەکاتی تەنگژە ئابوورییەکاندا روودەدات.
بۆ نموونە ئەو ساڵانەی کە بەشێوەیەکی گەورە نرخی لۆکەی تێدا دابەزی لە بازارە ئابوورییەکاندا، زنجییەکان لە بازاڕی کاری ئەمریکیدا بوونە موونافیسی سپی پێستەکان، ئەمانە واتە زنجییەکان بوونە قوربانی ئەم نرخدابەزینە، بەهۆی دابەزینی نرخی لۆکەوە لە بازاڕەکاندا، بەڵام هۆکاری کۆمەڵایەتی بەپێی ڕای ئەم دوو زانایە لە ولایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا بەشێوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوێت، بەپێی رای ئەم دوو زانایە کاتێ پیاوێکی سپی پێست لەگەڵ پیاوێکی رەشپێست لەیەك شوێندا پێکەوەبن، ئەوا هەستی سپی پێستەکە وادەجوڵێت کەوا پلەوپایە کۆمەڵایەتییەکەی لە رەشپێستەکە بەرزترە، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی هۆکاری پێکدادانو زەبروزەنگو زۆرەملێ.
هەروەها ئەم هۆکارە ئابوورییە کۆمەڵایەتییە هاوبەشە، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی پاڵنەری دەروونیی، هەر رووداوێك کە پلەیەکی گرنگی هەبووبێو پەیوەندییەکی بەهێزی هەبووبێ بەو بابەتەوە کە هۆکاری

---

[1] ئەم جۆرە (ئاپورە) یە بەناوی پێشەوا (تشارلی لەنش) ەوە ١٧٣٦-١٧٩٦ز کە یەکێك بوو لە پێشەواکانی شۆڕش لە (فەرجینیا) ناونراوە، کە سستمێکی خێرای داناوە بۆ دادگاییکردنی دوژمنانی گەل، کە ئەوانیش (گەل) بەشداری سزادانەکانیان دەکردو جێبەجێیاندەکردن — ن —

هێرشبردنو زەبروزەنگەکە بووە، ئەم جۆرە پەیکردنە دەبێتە هۆی وروژاندنی ئاپۆرەکە تەنها بەدەرکەوتنی پێشەواکە، بەرامبەر ئاپۆرەکە، کۆبونەوەی ئەم توخمانە (هۆکاری ئابووریی کۆمەڵایەتییو رووداوی لاوەکییو دەرکەوتنی پێشەوا) دەبنە هۆی!

١-دەرکەوتنی زەبروزەنگو سەرهەڵدانی هاریکاری کۆمەڵ.

٢-یەکخستنو رێکخستنی ئەم توندڕەوییە بەشێوەیەك لەگەڵ شارستانیەتی ئەو کۆمەڵگایەدا بگونجێت.

٣-دابەشکردنی رۆڵەکان بەسەر تاکەکاندا هەریەکەیان بەپێی کەسێتیی،یا تایبەتمەندییان، هەروەها تاکەکان بەگوێرەی ئەو پلەوپایە ئابوورییو کۆمەڵایەتییە خراپەی کە تێیدان، رۆڵدەبینن بەشێوەیەکی راستەوانەو بە زەبروزەنگیشەوە بەرەو پێشەوە دەڕون، بەڵام ئەو تاکانەی کە لە پلەوپایەکی کۆمەڵایەتیو ئابوریی مامناوەندیدان، ئەوا بەشداریدەکەن لەگەڵ رەفتاری ئاپۆرەکەدا، بەڵام تاکەکان لە چینە بەرزەکاندا بەشداریناکەن لە رەفتاری ئاپۆرەکەداو بەرەنگاریشی ناوەستنەوە.

٤-دەرکەوتنی توخمی فیشاڵکردن ( زیادەڕەوی) لە حاڵەتی تۆقاندنو زەبروزەنگی کۆمەڵییدا، ئەمە هۆیەکەی دەدرێتەپاڵ ئەم تۆقیوو زەبروزەنگە، لەگەڵ سەرهەڵدانی (سادیزمە گریێو ماسۆشیزمە گریێ)دا، واتا حەزکردن بە ئازاردانی خەڵکیو ئازاردانی خۆ، لێرەدا چێژێکی ئازاردان هەیە لە ئاپۆرەکەدا ئەویش چێژی رووخاندن، یان ئازاردانی دەروونە.

٥-تۆقینی کۆمەڵیی پەیدادەبێتو سەرهەڵدەدات کاتێ، کە ماوەیەکی کاتیی کورت هەبێت لەنێوان هۆکارو رووداوەکەدا، یان ئەوکارەساتەی کە بووەتە هۆی ئەم تۆقینە، بەجۆرێك کە بوار ناڕەخسێت بۆ

بیرکردنەوە، بەشێوەیەکی بابەتی، بەڵام ئەگەر ڕووداوەکە کتوپڕ بوو یان دەبوو هەر ڕووبدات ئەو تۆقاندنی کۆمەڵییە تێیدا ڕوونادات ئەمەش پاڵمانپێوەدەنێت بۆ بیرکردنەوە لەسەر بازگەکانی بەندکردن، لە ئەڵمانیادا کە جەماوەرەکە لە سەرەتادا بە هێمنیو لەسەرخۆ دەڕۆیشتن بەرەورووی فڕنەکانی سووتاندن، هەروەها تۆقین ڕوونادات ئەگەر ماوەیەکی کاتیی درێژخایەن بەدیبکرێت لەنێوان هۆکارو ڕووداوەکەدا، یان کارەساتەکەدا، بەجۆرێك بواربدرێت بۆ ڕێگەدۆزینەوەی ڕاست، بۆ دەربازبوون لە مەترسیو بیرکردنەوە، بەشێوەیەکی بابەتی، بۆ گرتنو دابینکردنی ئەو شتانەی کە پێویستن، وەکو دابەشکردنی ڕۆڵ ( الأدوار) بەسەر خەڵکەکەدا، با بەشێوەیەکی ساکاریش بێت وەکو حاڵاتی ئاگادارکردنەوە لە ڕووداوە ترسناکەکان لە فڕۆکەکاندا، یان لەو پاپۆڕە دەریاییانەی کە ڕووبەڕووی مەترسییەکی گەورەدەبنەوە.

٦-جیاوازی دژەکرداری لەلایەن تاکەکانەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە یان لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە بەگوێرەی سروشتی تاکەکان، ئەمەش ڕێکدەکەوێت لەگەڵ ئەو ڕایەی کە ( ئۆلبورت) دووپاتیدەکاتەوە کە دەڵێت: ڕەفتاری ئاپۆرەکان جیاوازە، بە جیاوازی ئەو تاکانەی کە (ئاپۆرە)کەیان پێکهێناوە. بۆ نموونە خۆبەختکردن چەند پلەیەکی هەیە، ئەگەر نموونە بە دایك بهێنینەوە، دەبینین دایکی وا هەیە قوربانی بەخۆی دەدات بۆ ڕزگارکردنی منداڵەکەی لە مەترسییەك، کەچی دایکێکی دیکە هەیە کە منداڵەکانی بە قوربانی خۆی دەکات لە پێناوی ڕزگاربوونی خۆیدا.

هەروەها ڕەفتاری ئاپۆرەیی ملکەچدەبێت بۆ جۆرێك لە ڕێکخستن بەگوێرەی سروشتی هۆکارەکانو سروشتی تاکەکان دیاریدەکرێت، ملکەچنابێت بۆ ( ستیریۆتیب) یان کۆمەڵە بیرۆکە کۆمەڵایەتیەکان، ئەمە

دژی ئەو بیروڕایانەیە کە لە کۆتایی سەدەی (نوزدە)هەمدا لای (لۆبۆن)و چاولێکەرەکانی پەیدابوون.
لەڕاستیدا (دۆلارد) لە کتێبەکەیاندا﴿ فێربوونی کۆمەڵایەتییو چاولێکەری﴾ کە ساڵی ١٩٤١ بڵاویانکردەوە تێیدا، هەوڵیاندا راڤەکردنێکی زانستی ببەخشێتە دیاردەی چاولێکەری هەروەك باوەڕیان بەبوونی سێ جۆر لەچاولێکەری هەبوو کە پەیوەندییان بە فێربوونی کۆمەڵایەتیەوە هەیە ئەوانیش:-

١/رەفتاری لەیەکچوو(السلوك المتشابه): وەکو:- ئەو تاکانەی کە لەپاسگەیەکدا چاوەڕوانی پاس دەکەن، لەم کاتەدا هەموویان بە شێوەیەکی راستەوخۆ دەستیان بۆ وەستانی پاسەکە بەرزدەکەنەوە، بۆئەوەی سواربن، ئەم تاکانە فێری وەڵامدانەوەی مەرجی بووون، کە ( بەرزکردنەوەی دەست)ە بۆ کارتێکەرە مەرجییەکە، کە (پاسەکەیە) لەم حاڵەتەدا.

٢/رەفتاری وەرگیراو (المقتبس): ئەو رەفتارە چاولێگیراوەیە کە پێشینەی کۆمەڵایەتی بۆتە هۆکاری، چونکە تاکەکان هێندێکیان چاو لە هێندێکی دیکەیان دەکەنەوە لە رەفتارەکەدا، ئەنجامی چاولێکردنەش، ئەگەر راستەوانەبێت ئەوا پلەی پەسەندوەردەکرێت، ئەکەر چەپەوانەش بێت، بە ناڕەزاییو گاڵتەپێکردن پێشوازیلێدەکرێت.

٣/رەفتاری تێهەڵکێش( المزدوج): بریتییە لەلاساییکردنەوەی کەسانی دیکە، ئەگەر لەلایەن خەڵکەوە پەسەندکرا، ئەمیش ئەو لاساییەدەکاتەوە ئەگینا نەء، بۆ نموونە ئەکەر لەماڵێکدا دوو منداڵ هەبێت، بچوکەکەیان چاو لە گەورەکەیان دەکات، ئەگەر کەسانێکی دیکە، وەکو: دایکوو باوك (تأیید)یان بکات، بۆ نمونە ئەگەر وامان دانا

لەم نموونەیەدا، کە یەکێ لەبراکان لە تەمەنی(٥)ساڵیدابێتو ئەویتریان لە تەمەنی (٨) ساڵیدابێت، لەکاتێکدا مناڵی یەکەمیان گوێی لە دەنگی هەنگاوەکانی باوکی دەبێو پێشوازیلێدەکاتو ئەملاو ئەولای ماچدەکات، باوکیشی شیرینی دەداتێو ماچیدەکات، لێرەدا دەبینین مناڵی دووەمیش چاوی لێدەکاتو هەمان رەفتاردەکات.

دەبێت ئەوە بزانین کە لاساییکردنەوە رەمەك، (غریزة) نییە، بەڵکو لە رێگەی فێربوونی کۆمەڵایەتییەوە بەدەستهێنراوە (جان بیاجە)ش باوەڕی وایە کە لاساییکردنەوە رەمەك نییە، بەڵکو قۆناغێکە لە قۆناغەکانی پەرەسەندن، (میلرو دۆلارد) وای دەبینن کە سێ بنەما هەیە بۆ فێربوون، بریتین لە: هاندەریی. ناوەکیی هاندەرو وەڵامدانەوە (الإستجابة).

ئەم تەرزی سێیەمی لاساییکردنەوەیە، زیاتر بڵاوە، لەبەرئەوەی زۆر ئاسانە رەفتاری کەسانی دیکە دیاریبکرێو لاساییکردنەوەشیان دیاریبکرێت، ئەم جۆرە لاساییکردنەوەیە جۆرێکی باشە، لەبەرئەوەی بنەمایەکە بۆ راڤەکردنی رەفتاری تاکەکان لە ئاپۆرەکاندا.

لەڕاستیدا( مۆللەرو دۆلارد) هەستان بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەك، لەسەر گۆڕاوە سەربەخۆکان (المتغیرات المستقلة)و هەڵوێستە دواکەوتەکانو وەڵامدانەوەکانو ئەنجامەکە بەم شێوەیە بوو:-

١-هاندەری ناوەکی(الباعث): ئەگەر هاندەرەکە لاوازبوو ئەوا وەڵامدانەوەکەش لاوازدەبێت وە بەپێچەوانەشەوە، راستە.

٢-هاندەری تێکهەڵکیش: ئەگەر کەسێك دوو کەسی بینی بەخێرایی رادەکەن لەبەرئەوە بەخێرایی لاساییاندەکاتەوە، لەبەرئەوەی ئەم رەفتارە ( پێشبڕکێ)یە هەر لە منداڵییەوە فێربووە.

(مۆڵلەرو دۆلارد) بۆ زەبروزەنگی کۆمەلێی پشتیان بەم هاندەرە بەستووە لە شیکردنەوەکەیاندا.

٣-فرەبوون: (مۆڵلەرو دۆلارد) لەگەڵ فرۆیدا کۆکبون لەسەرئەوەی کە ژمارە زۆریی، یارمەتیدەدات بۆ دەرکەوتنی یان بۆ بوونی ئەو تاکانەی کە هاندەری ناوەکییان تێداهەیە بۆ ئازاردانی خەڵکی (سادیزم) لەبەرئەوە وەلامدانەوەیەکی تونددەدەنەوە، کە هاندەر لەلای تاکەکانی دیکە لە ئاپۆرەکەدا بەهێزدەکات.

٤- هاوبەشییکردن: هاوبەشییکردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا لە کارێکی هاوبەشدا یارمەتیدەدات بۆ نەمانی هەستکردن بە بەرپرسیی تاکیی، دەبێتەهۆی دەرکەوتنی رەفتاری ئاپۆرەیی.

٥- دووبارەکردنەوە: دووبارەکردنەوەی هاندەر بەشێوەیەکی رێکخراو، بۆ نموونە وەکو( هوتافکێشان) لە کۆمەڵە سیاسیەکاندا دەبێتەهۆی دروستبوونی رەفتاری ئاپۆرەیی.

لێرەدا ئەم دوو توێژەرە لەگەڵ( لۆبۆن)دا، لەسەرئەوەی کە دووبارەکردنەوە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی پاڵنەرە تایبەتییەکان، کۆکن بۆ نمونە:- کاتێك کە سەرۆکی ئاپۆرەکە، ئەوامرەکانی دووبارەکردەوە، بێگومان بابەتەکە زیاتر لە دەروونی جەماوەرەکەدا دەچەسپێتو هەست بەلێپرسینەوە لە دەروونیاندا زیاتردەبێتەوە.

بەلام گۆڕانە شوێنکەوتووەکان ( المتغیرات التابعة) بەم شێوەیە رووندەکرێتەوە:

١- شیاونییە بۆ هیچ تاکێك کە بەشداری لە رەفتاری ئاپۆرەکەدا بکات ئەگەر وەلامدانەوەیەکی پێشووی نەبێت، لەبەرئەوە هۆکارەکان هێندێکیان بەستراونەتەوە بە هێندێکی دیکەیانەوە.

٢- وەڵامدانەوەکە بەهێزتردەبێت، ئەگەر هۆکارەکە بنچینەیی بوو، ئەو تاکانەی کە پلەوپایەی کۆمەڵایەتییان لاوازە، بۆ نموونە پاڵنەری شەڕەنگێزییان تێدایە، چونکە هەستکردن بە هەژاری زیاتر وایان لێدەکات کە لەگەڵ ئاپۆڕەکەدا تێکەڵبێتو وەڵامبدەنەوە، بەڵام ئەوانی دیکە هێماکانی گروپی یەکەم وەردەگرن، هەروەك لە حاڵەتی سێیەمدا بۆ فێربوون لەپێشەوە باسکرا.

٣- گشتیکردنە بیریو کۆمەڵایەتییەکان، یان وەك دەروونزانی کۆمەڵایەتی پێیدەڵێت: ( ستیریوتایب) لەکاتێکدا کە سپی پێستە ئەمریکییەکان لەبیری خۆیاندا وێنەی ناشیرینیان دروستکردبوو، لەسەر ڕەشپێستەکان، ئەم کارە دەبووە هۆی جیابوونەوە لە نێوان ئەم دوو کۆمەڵەداو یارمەتیدەدات بۆ دەرکەوتنی زەبروزەنگی کۆمەڵیی،یان کاری تۆڵەسەندن[Iynchages].

لە ڕاستیدا( لۆبۆن) لە باسەکانیدا بە گشتی دوورکەوتۆتەوە لە شێوازی زانستیی، بە ئەندازەیەك کە جیاوازینەکردووە لە نێوان ڕەفتاری گێلەکانو ڕەفتاری زانایاندا، لەوانەی لە توێژێکی هاوبەشبون، هەروەها جەخت لەسەر نەبوونی هەر کاریگەرییەکی کۆمەڵایەتیو دەروونیی دەکاتەوە، لەسەر ڕەفتاری تاکەکان، لە ئاپۆڕەکەدا.

بەڵام لەراستیدا ئەمە پێچەوانەی ئەو راستییە دەبێتەوە هەروەك لێکۆڵینەوە زەبروزەنگییە کۆمەڵایەتییەکان سەلماندویانە، ڕەفتاری تاکەکان لە ئاپۆرەدا بە گوزارشتە کۆمەڵایەتیو دەروونییەکان دیاریدەکرێت، نموونەیش بۆ ئەوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەمە، دەتوانین ئەو لێکۆڵینەوانە باسبکەین کە لەبارەی زەبروزەنگی کۆمەڵایەتییەوە کراوون.

هەریەکە لە(موللەرو دۆلارد) ئەم لێکۆڵینەوانەیان ئەنجامداوە بۆ ئەم ڕووداوانەی خوارەوە:-

منداڵێکی کچ لە تەمەنی حەوتساڵیدا، کچی جوتیارێکی توتن بوو، ڕۆژێکیان هات بۆ کێڵگەکە بۆ لای باوکی، ئینجا گریا کە گوایا خزمەتکارە ڕەشپێستەکە لە گەوری ئاژەڵەکاندا دەستدرێژی کردۆتە سەر، باوکەکەی ئەمەی بە دەستدرێژی توخمی لە قەڵەمدا، بەهۆی ئەمەوە ڕەشپێستەکە لەترسا رایکرد، بەڵام لەدوایدا گەڕان بەشوێنیدا، توانرا دەستگیربکرێ، لە ڕۆژی دواییدا ئاپۆرەیەکی ڕێکخراو لە خەڵکی گوندەکە چوون بۆ دەرهێنانی زنجییەکە لە بەندیخانەکەداو بردیانەوە بۆ هەمان گەوڕی ئاژەڵەکان و لەوێ بە دەمانچە کوشتیان.

لەحاڵەتێکی دیکەدا خزمەتکارێکی ڕەشپێست لە شاری( لیڤیل) ڕۆیشت بۆلای خانمەکەی، دواتر داوای شەش دۆلاری لێکرد، ئەمە لەکاتێکدا بوو،کە مێردی ژنەکە لە ماڵ نەبوو بەڵکو تەنها خزمەتکارەکەی لێبوو، ژنەکە دواتر هەڵیبەستو وتی کە خزمەتکارە زنجییەکە، هەوڵیداوە دەستدرێژی سێکسی بکاتە سەری، لەبەرئەوە داوایکرد بدرێتە دادگا، سەرلە بەیانی ڕۆژی دادگاکردنەکەی، جەماوەرە سپیپێستەکان داوای تاوانبارەکەیان کرد، بە مەبەستی ئەوەی کە خۆیان سزای بدەن.

سەرەڕای ئەوەی کە دادگا وەڵامی داواکەیانی نەدایەوە، زنجیەکەی لە هۆڵەکاندا پاراست، ئەمە وای لە جەماوەرەکە کرد، کە ئاگر لە هۆڵەکە بەردەنو هۆڵەکە بە نارنجۆك بڕوخێنن ئازاری پۆلیسەکان بدەن. ئەم هێرشبردنەی جەماوەر لەم سنوورەدا نەوەستا بەڵکو دەستدرێژی کرایە سەر گەڕەکەکانی ڕەشپێستەکانو ماڵەکانیان سووتاندن، دواتر

بارخانەو کتێبخانەو ماڵەکانیان داگیرکردن، رەشپێستەکانیان لە شارەکە دەرکرد.

ئەم کارە کۆتایی پێنەهات هەتا هێزە چەکدارەکان، بەشدارییان تیاداکرد، دوای ئەمە کاری توندوتیژی بەردەوامبوو بڕیارەکانی زەبروزەنگ بلاوکرایەوە.

ئەم نموونانە روونیدەکەنەوە کە رەفتاری کۆ لە ئەنجامی( پێکەر)ەوە نییە بەڵکو بەهۆی کەڵەکەبوونی هەستی جیاکردنەوەی رەگەزیی، لەنێوان پیاوی سپیو پیاوی رەنگاوڕەنگدا هاتووە، لە سەردەمانێکی دوورو درێژەوە ئەم هەستە دروستبووە، کاتێك کە یەکەم بە چاوی سوکەوە تەماشای دووەمی کردووە، ئەم کارە لەلای سپیپێست هەستی رقلێبوونەوەی بەرامبەر بەڕەشپێست دروستکردووە، ئەم هەستەش یەکەم بواری رەخساندووە بۆ وەرگرتنی سروشتی زەبروزەنگو رووخاندن ئەمەش لەسەر شێوەی زەبروزەنگی کۆمەڵیی ئەبێت کە زۆرینەی خەڵکی تێیدا بەشداریدەکەن، هەروەك لە نموونەکانی پێشوودا دەرکەوتن.

لەڕاستیدا رەفتاری ئاپۆرەیی لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی ئەو هۆکارانەی کە دەرئەنجامی ئەو ستەمە بەردەوامە بوو گەشەیکرد، کە لەلایەن کەسێکی دیاریکراوەوە ئەنجامدرا، دەرهەق بە کۆمەڵێك ئەم کۆمەڵە هەر جارێك بۆیان رێککەوتبێ لە هەربوارێکدا زیانیانداوە لەوسەرۆکە.

لێرەدا هەڵسوکەوتی کۆمەڵ پەیوەندی نییە بەهۆکاری غەریزەوە (پێکەر)، یان تەنها بەبێ هۆشی ملکەچبێت بۆ کاری کۆمەڵیی، بەڵکو ئەم کارە ئەنجامی هەستکردنە بە چەوساندنەوە.

بۆنمونە:- جەماوەر لە شۆڕشی ١٤ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨دا لەعێراق هەستان بە کوشتنی نوری سەعیدو سوکایەتیکردن، بەلاشەکەیەوەو

بەسەر شەقامەکاندا رایانکێشا، ئەمە ناگەڕێتەوە بۆ هۆکاری غەریزە( پێکەر) بەڵکو هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری سیاسیی، کە لەوەو پێشتر نوری سەعید لە خەڵکەکەی داوەو ستەمی نواندووە لەگەڵیاندا لە ماوەی فەرمانڕەواییەکەیدا، ئەمە بۆتە هۆی دروستبوونی ئەم کارە.

هەروەها ئەو خۆپیشاندانو هێرشبردنانەی کە لە شارەکانی عێراقدا روویاندا، لە ماوەی شۆڕشدا، ئەمانە گوزارشتیان لە رەفتاری ئاپۆرەیی دەکرد هۆکانیان دەگەڕایەوە بۆ هەستکردن بە رزگاربوون لە ستەمو ئەو شۆڕشە گەورانەی کە لە مێژوودا روویانداوە، وەکو شۆڕشی فەرەنسیو شۆڕشی ئۆکتۆبەری رووسیو شۆڕشی چینی، ئەمانە تەنها رەنگدانەوەی ئەو رەفتارە ئاپۆرەییانەبوون کە هۆکەی دەگەڕایەوە بۆ هۆکارە رامیاریو ئابوورییيە ئاشکراکان.

زەبروزەنگی کۆمەڵیی، مانای خۆی هەیەو ئەرکی کۆمەڵایەتی خۆی هەیەو دەرئەنجامی رەمەکی هەڵەشە نییە بە هیچ کلۆجێك، هەروەك ( لۆبۆن) بانگەشەی بۆ کردووە، ئەم رایە لەگەڵ رایەکەی (ئەلبورت) رێکدەکەوێت کە دەڵێت: تاك لە ئاپۆرەدا هەردەم ئارەزووی ئەنجامدانی کارێکدەکات کە لەوەوپێشتر ئارەزووی بۆ خواستووە.

هەروەك لە نموونەکانی پێشوودا باسمانکردن تاك دەربڕینیی هەستەکانی لە رێگەی زەبروزەنگ، یان هێرشبردنەوە، دەردەبڕێت ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ رەخساندنی بواری گونجاو بۆ تاکەکە، ئەمە بەهۆی پێکەرە خەفەکراوەکانەوە نییە.

لۆبۆن بانگەشەی ئەوە دەکات کە گواستنەوەی بیرۆکە لە تاکەکانی ئاپۆرەدا بریتییە لە دیاردەیەك کە هەر روودەدات، واتە رەفتار بەپێی راکەی لۆبۆن لە نێوان ئاپۆرەدا لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە دەگوێزرێتەوە، ئەم رایە بەسەر راستی زانستیدا جێبەجێنابێت، چونکە

تاك بە گوێرەی پێوانە کۆمەڵایەتییو ئابوورییەکان، لەنێو ئاپورەکەدا هەڵسوکەوتدەکات، هەروەها لەرووی دەروونییەوە، رەفتاری تاکەکان جیاوازە، بەگوێرەی خۆپاڵدانە چینایەتییەکانیانە، هەژارەکان زیاتر پاڵدەنێنو زەبروزەنگ دەنوێنن، بەهۆی بارودۆخی خراپی ئابووریو کۆمەڵایەتییانەوە.

لە نموونەکانی پێشوودا لەسەر شاری (لیڤیل) دەرکەوت کە ئەو کۆمەڵەی هەستان بە کاروباری
زەبروزەنگ پێکهاتبوون لە (٥٨) کەس، کە بەم شێوەیەی لای خوارەوە دابەشدەبن:-

(١٩) کەسیان بێکاربوون، (١٢) کەسیان کرێکاری دەستیی بوون،(٨) کەسیان کرێکاری هونەری بوون، (٨) کەسیان جوتیار بوون، (٤) کەسیان دارتاش بوون، (٣) کەسیان کارگوزاربوون، (٣) کەسەکەی دیکە کاری جۆربەجۆریان هەبوو، سەرۆکەکەشیان نەخوێندەواربوو کە تەمەنی(٤٠ ) ساڵ بوو هەمیشە سەرخۆشبوو لەسەر کاری ژنەکەی دەژیا، کە ئەویش کاری جلشۆری ماڵانی دەکرد.

کۆمەڵێك کارکەری دەروونی هەیە کە تایبەتن بە تاکەکەوە، وەکو: ئاستی ژیریو رۆشنبیریو ئەندازەی باوەڕبەخۆبوونو هەستکردن بە دڵئارامی، ئەمانە کاریگەرییان لە دیاریکردنی رۆڵی تاك لە ئاپۆرەدا هەیە.

دەروون لاوازەکانو کەم رۆشنبیرەکان، زیاتر کاریان تێدەکرێت بە رەفتاری ئاپۆرەکە، لەو کەسانەی کە ئاستی رۆشنبیرییان بەرزەو باردۆخی دەروونیان باشە، هەروەها هەڵوێستی تاکەکان لە ئاپۆرەدا، لە ڕووداوێکەوە بۆ ڕووداوێکی دیکە دەگۆڕێت، لە ڕاستیدا جاری وا هەیە تاك بەشێوەیەکی دیاریکراو بەرەوڕووی هەڵوێستێکی دیاریکراو

دەبێتەوە، هەمان تاك هەڵسوکەوتێکی جیاواز دەنوێنێت بەرامبەر کێشەیەکی دیکە.

هەروەها باردۆخی تایبەتی تاکەکە کاریگەری هەیە لەسەر رەفتار کردنی ئاپۆرەکەدا. بێجگە لەوەش حاڵەتی ئەو تۆقینەی کە بەسەر شاری( بەغدا)دا هات یان ئەو رووداوەی کەنا و نراوە بەرووداوی-ابو طبر- بەڵکو ئەمە تەنها نموونەیەکە بۆ پشتگیری باسەکەمان)، لەڕاستیدا دژدانەوەی دانیشتوانی بەغدا لە گەڕەکێکەوە بۆ گەڕەکێکی دیکە جیاوازبوو، تۆقینەکە لە گەڕەکە دەوڵەمەندەکاندا زیاتر بەهێزبوو، ئەوانەی کە نزیکبوون لە ناوچەکانی، روداوەکەوە وەکو(منصور)، زیاتر لە گەڕەکە هەژارەکانەوە ئەوانەی کە دوربون ( مدينة الثورة) هەروەها کاریگەری ئەم رووداوانە جیاوازە لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە با لە یەك گەڕەکیشدا نیشتەجێبن.

بەڵکو هێندێك کەس لەوانە موبالەغەیانکردووەو بەشێوەیەکی سەیر خۆیان پاراستووە، بەجۆری کە چەند خێزانێك لە یەك خانوودا، لە ترسانا کۆبوونەتەوە، بەڵام هێندێکی دیکە لە دانیشتوانەکە هەرگیز خۆیان نەشڵەژاندووەو رەفتاری خۆیان نەگۆڕیو، بەئەندازەیەکی دیاریکراو نەبێت، هۆی زاڵبوونی ئەو تۆقێنە کۆمەڵییە بەسەر شاری بەغداداهات، نادیاریو شاراوەیی ئەو رووداوانەی پێشوو بوو کە بەسەریاندا هاتبوو، کە ئەمە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی قاوداخستنەکان بەشێوەیەکی سەیر، جگە لەوەش ئەم رووداوانە بە شێوەیەکی راستەوخۆ هەڕەشەی لە ژیانو ناموسو کەلوپەلەکانی تاکەکان دەکرد.

بەڵام توندوتیژی باری تۆقینەکە لەهەندێ لەگەڕەکەکاندا جگە لە گەڕەکەکانی دیکە زیاتر بوو، ئەمە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی ئەو گەڕەکانە لەناوچەی رووداوەکانەوە ئەمە لەلایەکەوە، ئەگەری

تووشبوونی بەهۆی ئابوورییەوە لەلایەکی دیکەوە، ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ رەخساندنی باردۆخو هۆکارەکان کە دەبنەهۆی دروستبوونی دڵەراوکێو جێنەگیری، ئەمانە هەموو پاڵیاندەنا بۆ زیادبوونی توندوتیژیو باری تۆقاندنەکە لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییەکان لە نێوان تاکەکانو تێژەکاندا لەم رەفتارەدا دەرکەوت.

هەروەها ئەو رووداوانەی کە لە ساڵی١٩٥٩دا لە هەردوو شاری ( کەرکووكو موصل) روویاندا نموونەیەکی ترمان دەدەنێ لەسەر جیاوازی شوێنی تاکەکان لەیەك کودا بەگوێرەی باردۆخی ئابووریو کۆمەڵایەتییان لە ئاپۆرەدا، هەروەها روداوەکانی خوێندکاران کە لە شەستەکاندا لە ژمارەیەك لە شارەکانی جیهان روویاندا، وەکو پاریس و کالیفۆرنیا و تۆکیۆو بێروت، بە ئاشکرا ئەندازەی جیاوازییەکان لەرووی شوێنەکانیانەوە دەردەکەوێت، ئەمەش لەبەرهۆی کۆمەڵایەتییو ئابووریو رۆشنبیرییە، مادام وایە بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە ملکەچبوونی تاکەکانی ئاپۆرە، بۆ کاردانەوەی بۆچونێ کە پشت بە بنەماکانی راستی نابەستێت.

ئەمە واتای وانییە کە کە تیۆرەکەی لۆبۆن شتێکی بە کەڵکو ئیجابی نەهێناوە بەڵکو بەپێچەوانەوە (لۆبۆن) یەکەم کەس بووە لە دەروونزانی کۆمەڵایەتیدا کەئەم دەرگایەی کردۆتەوە لەدەروونزانی کومەلایەتێدا، تیۆرێکی تەواو لەسەر دەستی ئەم زانایە پەرەی سەند، ئەگەرچی لەرووی بابەتیو بەڵگە زانستییەکانەوە کەموکوڕی هەیە.

لەڕاستیدا( لۆبۆن) لەم بوارەدا هەوڵەکانی خستۆتە گڕ بۆ بەردەوام بوونی لێکۆڵینەوەکان لەبابەتی ئاپورەکانو رەفتاری کۆمەڵیو پەرەسەندنی ئەم بوارە، کەیەکێکە لەبوارەکانی زانستی مرۆڤایەتی، هەروەها جێبەجێکردنی شێوازە زانستییەکان لەلێکۆڵینەوەوچا و

دێریدا، لەگەڵ ئەوەشدا بێگومانین کەتیۆرەکەی( لۆبۆن) راڤەکردنێکی پەسەندمان بۆهەندێ لەدیاردەکانی رەفتارە کۆمەڵییەکانی دەداتێو بڵاوبوونەوەی هێندێك لەدابونەریتە کۆمەڵایەتییە خراپەکان، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لە سروشو لاساییکردنەوە، ئەو سروشەی کە دەبێتە هۆی ئەنجامدانی هەڵەیەکی راستەقینە، یان (خەیاڵی)کە دەبێتە هۆی هەستکردن بە پەشیمانیو ئەنجامدانی هێندێك کاری ماسۆشیزمانە (خۆ ئازاردان) بۆ نموونە وەکو ئەوەی هەمیشە زنجیری ئاسنینو پۆڵا لە لێداندا بەکاردەهێنێتو تیماریشیدەکات.

**دووەم: مۆدە**[1] : مۆدە بریتییە لە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی-دەروونیی، کە پشت بە کارکەریی ئابووریی دەبەستێتو پاشان بە پروپاگندە، چونکە هەستی دەروونی بە پێویستییو ئارەزوبوونی لای تاکەکان دروستدەکات.

تاکەکان بە پاڵنەری لاساییکردنەوەی چینایەتی، یان ئەو کۆمەڵەی کە پاڵییپێوەدەدەن، گەرچی سەرزاریش بێت، پاڵیانپێوەدەنێت بە شێوەیەکی هەڵەشانە بۆ لاساییکردنەوەی کۆمەڵەکە. مۆدە وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، رەفتارە کۆمەڵایەتییەکانمان وەدەردەخات. ئەو رەفتارەمان بۆ دەپشکنێ کە رووندەبێتەوە، بۆ نموونە جلوبەرگی باش لە کۆمەڵێکی دیاریکراودا لە کاتو شوێنێکی دیاریکراودا پەسندەو مۆدەی دوێنێ کۆمەلگەی ئەمڕۆو خەڵکی ئارەزوی ناکەن، مودەی سبەینش ئەمڕۆ بە شێوەیەکی ناکرداری سەیردەکرێت،

---

(١) لەبەرئەوە (مۆدە)مان بە دووەم روالەتی کۆمەڵایەتی دانا، چونکە ئاپورە، جەماوەر، گشت، کۆمەل، کەلەپیشەوە باسمان کردن و هەرچواریان واتاکانیان لەیەکەوەنیزیکن. — و -

زەحمەتە جێبەجێشبکرێت، (مۆدە) شتێکی جێگیرنییە، بەڵکو بە بەردەوامی دەگۆڕێت، نەك بە کاریگەری هۆکارە دەرەکیەکان، یان ناوەکییەکان، وەکو هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە، بەڵکو گۆڕان روودەدات لە ئەنجامی حەزکردن بە گۆڕانکاری، خەڵکی لەبەر دوو هۆکار دوای مۆدە دەکەون، یەکەمیان بۆئەوەی سەرنجی کەسانی دیکە راکێشنو گوزارشت لە کەسێتی خۆیان بکەن، دووەمیان مۆدە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییو دەروونی دوولایەنەیە، ئامانجی تاك تێیدا بەدەستهێنانە، خۆ بەچاکزانینە لەبەردەم تاکەکانی کۆمەڵگادا ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەوە، بۆ خۆجیاکردنەوە، ئەویش بە پەسەندکراویو داهێنانەوە، (مۆدە) وادەدەنرێت کە جۆریکە لە جۆرەکانی بەربەرەکانیی لاساییکردنەوەی ئەو کۆمەڵەی کە کەمتر دەوڵەمەندە، هەوڵدەدات بۆلاساییکردنەوەو خۆچواندن بەو کۆمەڵەی کە زیاتر دەوڵەمەندە، ئەم کارە دەبێتە هۆی پاڵنانی چینی دووەم بۆ گۆڕانکاریو تازەگەریی، بەم جۆرە مۆدە لە راوبۆچوونەکانی ئەو سەردەمەو گیانی کۆمەڵەکە گوزارشتدەکات، لە مۆدەدا سروشتی شارستانیو کۆمەڵایەتی باو دەردەکەوێتو هەنگاوە گشتییەکەی لە ماوە درێژەکاندا هەر پەنجا ساڵ جارێك دەگۆڕێت، بەڵام لە ماوە کورتەکاندا ئەوا لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی دیکە دەگۆڕێت، بۆ نموونە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پیاوان زیاتر لاسایی ژنانیان دەکردەوەو دوای ئەوەش گرنگییان بە جلوبەرگی ژنانە دەدا. بۆ نموونە جلوبەرگەکان درێژو فراوان دروستدەکران، بەڵام جلی ژنان ئەمڕۆ کورتو تەسکن.

بەڵام داهێنان ( بدعة) بریتیە لە مۆدەیەکی کاتیی کە بۆ ماوەیەکی کورت دەمێنێتەوە. لەوانەیە دواتر وەکو مۆدەیەك دەرکەوێت، یان وەکو لاساییکردنەوەی کۆمەڵایەتیی لێدێت. لاساییکردنەوە بە تەرزێك لە

ڕەفتاری کۆمەڵایەتیی دەووترێت، کە وەسفدەکرێت بە جێگیریی، بەڵام مۆدە بەکارهێنانێکە، دێتە کایەوە بۆ دیاردەیەك، لە کاتی دیاریکراودا، یان لە تەرزێکی ڕەفتاری کاتییدا، واتا: جێگیرنییە.

## هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی مۆدەو پوکانەوەی

مۆدە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕەفتاری کۆمەڵییو ئەمەش باری کۆمەڵایەتیی لە ڕەفتارماندا دەردەخات، لە کاتێکدا لە ڕێگەی ڕەفتاری پەسەندکراوو چاکەوە دەردەکەوێت، مۆدەش لە ئەنجامی ئارەزوبوونی ئەو چینانەی کە پلەیەکی نزمتریان هەیە لەچاو چینە بەرزەکانی دیکەدا بڵاودەبێتەوە، ئەمەش بریتیە لە ( چاولێکەرییو بەربەرەکانی) کە دەبێتە هۆی بەرامبەربوونو لەیەکچوون لە ڕووکارو ڕەفتاردا، بەم جۆرە دیاردە کۆمەڵایەتیەکان بەرەو ڕووی گۆڕان دەبنەوە بەهۆی هۆکاری ناوەکییو دەرەکییەوە، بە مەبەستی پەرەسەندن، مۆدەش وەکو دیاردەیەك، لە دیاردە کۆمەڵایەتیەکانی دیکە دەچێت، لە ڕوویەکەوە ئارەزووی گۆڕانکارییو پەرەسەندندەکات، لە ڕوویەکی دیکەوە، گۆڕانی مۆدە هۆیەکەی تەنها بەهۆی گۆڕانەوەیە، پڕوپاگەندەش ڕۆڵێکی بنچینەیی دەبینێت، لە ئاڕاستەکردنی سەرسوڕهێناندا، بەرامبەر بە کەسێتییەکەوە.

لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی گرنگیدان بە مۆدە:-

١-بۆشاییو هەستکردن بەبێزاربوون، لەبەرئەوە مۆدە لەنێو ئەو چینانەدا بڵاودەبێتەوە کە کاتی بۆشاییان زیاترە.

٢-هەروەها مۆدە پەیوەندی هەیە بە باری ئابوورییەوە لەبەرئەوە لەنێو چینە دەوڵەمەندەکانو گوزەرانە ئابوورییە باشەکاندا، زیاتر بڵاودەبێتەوە، وەك لە چینە ناوەندییەکانو هەژارەکاندا، کە ئارەزوودەکەن بۆ خۆجیاکردنەوەو دەرکەوتنیان بە ڕووکاری پەسەند،

ئـەم هۆکارانـــە لەلایـــەن خـــاوەن بەرژەوەندییـــە ئابوورییەکانـــەوە دەگوێزرێتـەوە، بێجگـە لەوانـە دوو هۆکـاری دیکـە هـەن بـۆ دەرکـەوتنی مۆدە:-

١/بـەهۆی ئـەوەی کـە تـاك دەیـەوێت خـۆی لـە تاکـەکانی دیکـەی کۆمـەڵو کۆمەڵگە جیابکاتەوە.

٢/هۆکـاری دەروونـی پـاڵ بـە تاکەکـەوە دەنێـت بۆئەوەی خـۆی لـەوانی دیکـە جیابکاتـەوە، کـەواتا: ئەمـەش بەربـەرەکانیی کۆمەڵایەتییـە ( لاسـاییکردنەوەو تێکـەڵاویی + رەسـەنییو چێـژێکی بـێ وێنـە) مـۆدە، کاریتێـدەکرێت بـە تـەرزی بیرکردنـەوەی بـاوەوە، گـوزارش لـە گیـانی سـەردەمەکە دەکـات، یەکـەمجار لـە شـارەکاندا بڵاودەبێتـەوە، پاشـان لـە لادێکاندا، هەروەها لـە وولاتـە ئابوورییـە پەرەسـەندووەکاندا، یەکـەمجار بڵاودەبێتەوە بـۆ ئـەوەی بگوێزرێتـەوە بـۆ وولاتـە تازە پێگەیشتووەکان، ئەمـەش لەبەرئـەوەی کـە تـاك حـەزی بـە خۆپاڵدانـە، بـۆ ئـەو کۆمەڵـەی کەپێیسەرسـام بـووە، خۆپاڵدانەکـەش لـە رێگـەی لاسـاییکردنەوەوە دەردەکەوێت، کە تیایدا دیاردەی مۆدەو دیاردەی دیکەش دەردەکەون.

**سێیەم: قاوداخستن:**

دیاردەیـــەکی کۆمەڵایەتییـــە بـــەوە دەناســـرێتەوە کـــە بـــەخێرایی بڵاودەبێتـەوە، واتـای ئـەو رووداوە گرنگـە دەگمەنانـە دەبەخشـێت کـە شـاراوەییو نادیاریـان تێدایـە، هۆکارەکـانی دروسـتبوونی قاوداخسـتن بەستراوەتەوە بە پەیوەندییەکی بیرکارییەوە، کە دەتوانین بەم شێوەیە دایبرێژین: ( بـەهێزی بڵاوبوونـەوەی قاوداخسـتن = گرنگییـو نادیاریی) ئەگـەر یـەکێك لـەم دوو کارکەرانـە نـەمان، ئـەوا گرنگییەکـەی یـان

نادیارییەکەی نامێنێتو قاوداخستنەکە پەرتدەبێت، هەرچەندە بنەمای تریشی هەبێت، قاوداخستن بەوە دەناسرێتەوە کە:

١)ملکەچی گۆڕانکاری دەبێت بەگوێرەی گرنگییەکەی لای تاكو سەرنجراکێشانی تاك، واتا: وەکو شایەتی وایە لەم بارەدا.

٢)قاوداخستن بۆ پڕکردنەوەی پێویستی دەروونیی تاکەکان دەردەکەوێت، واتا: بەشێوەیەکی راستەقینە دەردەکەوێت بەمەبەستی چارەسەری راڕایی ژیان.

٣)لەراستیدا رووداوە دیاریکراوەکان دەبنەهۆی بڵاوبوونەوەی قاوداخستنە جیاوازەکان لە کۆمەڵگەیەکی تایبەتیدا، نەك کۆمەڵگەیەکی دیکە، ئەمەش بەگوێرەی سروشتی بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکانو ئەوانەی کە کۆمەڵگە لەسەری راهاتووە.

بۆنموونە: رووداوەکانی ساڵی ١٩٧٣ کە لە شاری بەغدا روویاندا بوونەهۆی بڵاوبوونەوەی دەیان قاوداخستن لەبارەی ئەو رووداوانەوە، بەهۆی نەزانینی جەماوەر، لەبارەی ئەم رووداوانەوە، لەوەوپێشتر، سەرباری ئەوەش ئەم رووداوانە بە مەترسییەکی گەورە، هەڕەشەیانی لێدەکرد ئەو هەڕەشانەی کە پەیوەندییان هەبوو بە گیانو کەلوپەلەکانیانەوە، سەرباری ئەو نادیارییەی کە دەوری ئەم رووداوانەی دابوو، نەبوونی زانیاری لەسەر پێناسەی ئەو لایەنانەی کە قاوداخستنەکانیان پێکدەهێنا لەگەڵ سروشتی پاڵنەرەکانیان.

٤) قاوداخستنەکان بۆ دەرخستنی پێویستییە بەسوودەکان لای جەماوەر بڵاودەبنەوە، واتە ئەم قاوداخستنانە راستی دەنوێنن بەمەبەستی چارەسەری پەشێوی ژیان، ئەمە ناودەنرێت بە قاوداخستنی سپی.

ئەم جۆرە قاوداخستنانە بە شێوەیەکی ئاشکرا بڵاودەکرێنەوە لەو سەرچاوانەی کە ئەو زانیاریانەی لێوەردەگرین، ئەمەش، بەکاردەهێنرێت لەلایەن دەسەلاتو رامیاری رەسمی لەلایەن دەوڵەتەوە. بەڵام جۆری دووەم لە قاوداخستن بریتییە لە قاوداخستنی (بۆر)، کە نیوە ئاشکرایە لەم جۆرە قاوداخستنانەدا زانیارییەکان لە سەرچاوەیەکەوە وەردەگرین کە نازانین چ سەرچاوەیەکە.

بەڵام جۆری سێیەم، بریتییە لە قاوداخستنی رەش، (نهێنیە) ئەم جۆرە قاوداخستنانە لە کاتەکانی پەشێویدا دەردەکەون سەرچاوەکەیشی دیارینەکرێت، بۆ نموونە ویستگەکانی رادیۆ نهێنیەکان کە ئاماژە بەوەدەکەن، گوایە لە زەوی دوژمنەکەیاندا دامەزراونو پەخش بڵاودەکەنەوە، زانیاریش لە رێگەی رێکخستنەکانیەوە وەردەگرن ئەمەش بۆئەوەی دەسەلاتدارانی ولاتەکە پێیاننا خۆش بێت.

**چوارەم: پڕوپاگندە:**

وشەی پاگەندە دەگەڕێتەوە بۆ هەمان خێزانی ئەم وشەی (Propagare ) کە بەزمانی لاتینی واتای ناشتنی قەڵەم دەگەیەنێت، بە مەبەستی گەشەکردنیو زۆرکردنی، پڕوپاگەندە بە واتای شتێك نایەت کە لەخۆیەوە سەریهەڵدابێت، یان لە هیچەوە دروست بوبێت، بەڵکو واتا: هەڵئاوسانو گەورەکردنی شتێکە، یان بڵاوکردنەوەی بیرێك، یان رایەك، یان ئاڕاستەیەکی دیاریکراو، هەروەك (دوب) دەڵێت: پڕوپاگەندە واتا: هەوڵدانە بۆ زاڵبوون بەسەر ئاڕاستەکاندا، بەلای کۆمەلێکی دیاریکراوەوە، بەشێوەیەکی رێکخراو، ئەمەش بۆ ئاگادارکردنەوەو زاڵبوون بەسەر رەفتارو کردارەکانی ئەو کۆمەڵەداو بەجۆرێکی دیکە ئاڕاستە بکرێن.

لە کۆندا خەڵك بڕوایان وابووە کە مەبەست بە پاگندە فریودانی خەڵکە، بەڵام دوای ئەوە گرنگییەکەی زیادیکردووە، وایلیٚهات وەزیری بۆ دانرا، پیٚویستە جیاوازیبکەین لەنیٚوان پاگندەو ڕۆشنبیریدا، ڕۆشنبیری واتا: چاندنی ڕاستییە زانستییەکان لە میٚشکی مرۆڤدا، بەڵام پاگندە دەگونجیٚت ڕاستبیٚت، یان هەڵبەستراوبیٚت، هۆکارەکانی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگندە بریتییە لە ئامادەگی دەروونیی لای تاکەکان، ئامیٚرەکانیش بریتین لە چاپکراوەکانو قسەکردنو ویٚنەو پیٚشانگاو سینەماو شانۆ...هتد

لەبەرئەوە پاگندە شتیٚك نییە بەشیٚوەیەکی ڕاستەوخۆ هەر لەخۆوە دەرکەویٚت، بەڵکو گەورەکردنی شتیٚکو هەڵئاوسانی ئەو شتە دەگریٚتەوە، بەو مانایەی بیریٚکە، یان ڕایەکە، یان ئاڕاستەیەکی دیاریکراوە، بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی ڕاکان، یان ئاڕاستەی کۆمەڵە دیاریکراوەکان، بە شیٚوەیەکی ڕیٚکخراو، ئەمەش بۆ ئاڕاستەکردنی ڕای گشتییو ڕەفتاری خەڵکیی.

سەرەڕای ئەوەی پیٚویستە جیاوازیبکەین لە نیٚوان پاگندەو ڕۆشنبیریدا، پاگندە هەوڵدەدات کە کاربکاتە سەر ڕوکارەکانو ڕاکانو یەك گرتنیان، لە ڕیٚگەی پیٚشکەشکردنی ڕاستییەکانەوە یان خەیاڵییەکانەوە، ئەمەش بۆ نموونە ئەو پاگەندە خەیاڵییەی کە زایۆنیزمەکان لە ئەورووپا بڵاویانکردەوە کاریگەری هەبوو لەسەر ڕای گشتیی ئەورووپا پیٚش جەنگی( ٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧) لە کاتیٚکدا هەوڵیاندا کە جەماوەرەکە بخەنە خەیاڵەوە بەوەی کە جولەکەکان ئازاریٚکی زۆر لەسەر دەستی عەرەب دەچیٚژن هەروەکو چۆن لەمەوبەر ئازاریٚکی زۆریان چەشتووە لەسەر دەستیان، ئەمەش لەڕیٚگەی شیٚواندنی ڕاستییەکانو بەسەردا بڕینیان بەسەر عەرەبدا، بەڵام ڕۆشنبیریی بریتییە

لە چاندنی راستییە زانستییەکان، دروستکردنی روکارە نوێکان، لە لایەکی دیکەشەوە کاریگەریی پاگندە کۆتاییدێت، واتا: کاریگەرییەکەی بەردەوام نییە، هێندێ جار پاگندە لەگەڵ رۆشنبیریدا تێکەڵاو دەبێت لە کاتێکدا کە پاگندەکە هەر لە منداڵییەوە لە مرۆڤەکەدا بچێنرێت، ئەویش لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا، بە تایبەتی خێزانو دامەزراوە پەروەردەییەکان، زۆرجار خێزان بڕیاردانی پێش وەختو هێندێ چوارچێوەی بیری (هەرەخراپ) فێری منداڵدەکات، هەروەها خوێندگا لە رێگەی ئەو نموونانەی کە پێشکەشی خوێندکارەکانی دەکات وەکو لە بابەتەکانی بیرکاریو وانەکانی خوێندنەوە، کە بنەماکانی ئابووریی فێری خوێندکارانی تەمەن بچوك دەکات.

جیاوازی نێوان پاگندەو راستی:-

لە راستیدا لە هێندێ کاتدا زۆر قورسە کە جیاوازیبکەین لە نێوان پاگندەو باوەڕی راستیدا، بۆ نموونە زانینی ئەو پاڵنەرە راستەقینەیە لە پێشکەشکردنی یارمەتی لەلایەن دەوڵەتە گەورە پێشکەوتووە پیشەسازییەکانەوە، بۆ دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکان. پاڵنەرەکە لێرەدا بە مەبەستی پاگندەیە؟ یان کۆنترۆڵکردنە؟ ئەمجا لەبەرئەوە باش وایە، پێش ئەوەی لە ناوچەیەکدا پاگندە بەرپاکرێت، لێکۆڵینەوەیەکی دەروونییو کۆمەڵایەتی لە ناوچەکەدا ئەنجامبدرێت لەبەرئەوەی دانیشتوانی هەر ناوچەیەك جۆرە پاگندەیەك کاریانتێدەکات، بۆ نموونە: ئەو پاگندەیەی کار لە دانیشتوانی گوندان دەکات، کەمتر کار لە دانیشتوانی شار دەکات، هەروەها ئەوەی کاردانەوەی لەسەر لاوان زۆرە، کاردانەوەی لەسەر پیران کەمە.

گرنگترین ئەو بنچینانەی کە پڕوپاگندە پشتییپێدەبەستێت یەکێکیان سەرنجڕاکێشانی جەماوەرەکەیە، دووەمیان دووبارەکردنەوەیە، بۆ ئەوەی بیرۆکەکە لە مێشکی جەماوەردا بچەسپێت.

جاری وا هەیە پاگندە هەستێك بە پێویستیی لە جەماوەردا دروستدەکات دوای ئەوە پاگندەکە بڵاودەبێتەوە، چونکە پاگندەی بەهێز لە پێویستی جەماوەرەکەوە هەڵدەقوڵێتو پەیوەندی پێوەدەبەستێت، ئەمجا تۆمار دەکرێت، بۆ نموونە: بۆئەوەی لاوەکان لە ریزی سوپادا تۆمارکەین، دەبێت لەپێشدا هەستی نەتەوەییو نیشتمانپەرەوەرییان بجوڵێنین، ئەمە پێیدەڵێن پاگندەی ناڕاستەخۆ، یان پاگەندەی روپۆش، ئەوکاتە ئامانجی سەرەکیی دەرناکەوێت دوای ماوەیەکی کاتی نەبێت.

پاگندە ناتوانێت ئامانجەکەی خۆی بپێکێت مادام دەوروبەرێکی بۆ دروستنەکەین، بۆ ئەوەی سەرکەوێت، یەکێ لەوانە ئامادەکردنی جەماوەرە لەبارەی دەروونییەوە.

یەکێکی دیکە لەو کارکەرانەی کەوا پاگندە سەردەخەن پیشاندانی، بابەتەکانە لە چەند رستەیەکی کورتو ئاشکرادا، وەکو ئەوانەی کە بە دروشم یان بە بڕیار، یان بە ئەمر، نووسراون، جاری وا هەیە مەبەست لە پاگندەی دوژمنکاریی لایەنێکی دیاریکراوە، یان کەسێکی دیاریکراوە، چونکە رووبەڕووبوونەوەی تەنها کەسێك ئاسانترە لە رووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵێك، جاری وا هەیە پاگندە لە چەند دیمەنێکی (بەسەردابڕیندا)، ئاسانەکرێت، وەکو هێتلەرو نازییەکان دەیانکرد، وەکو زایۆنیزمو یارمەتیدەرەکانیان دەیانکرد، بەجۆرێك کە هەڵەو دڵڕەقیی خۆیان دەدایە پاڵ دوژمنەکانیان لەگەڵ ئەو هەڵانەی کە خۆیان

دەیانکرد، هیتلەر دەیویست قۆچی قوربانی[1] لەگەڵ بدات، ئەو کاتە هەموو ڕقو دوژمنکارییەکی ئاڕاستەدەکرد، ئەوجا قاوداخستنێکی بۆ بەرپادەکرد.

پڕوپاگندە پشتدەبەستێت بە چوار بنەمای گشتی، کە بریتین لە ڕاکێشان، سەرنجدووبارەکردنەوە، ئاسانکردنو ڕەزامەندی. ئەم بنەمایانە وا لە پاگندەکە دەکەن بگات بە جەماوەرو کاریانتێبکات.

بۆ ڕاکێشانی سەرنج هەمیشە چەند ئاڕاستەیەکی لاوەکی دەخرێتەڕوو کە پەیوەندی نییە بە مەبەستە سەرەکییەکەوە، بۆ نموونە پاگندەکردن بۆ شەربەتێکی دیاریکراو وێنەی کچێکی جوان دەخرێتەڕوو کە لەو شەربەتە دەخواتەوە، ئەمەش بە مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی بینەرانە. بەڵام دووبارەکردنەوە بریتییە لە لێدانەوەی شتێك بە ئامێرو ڕێگەی جۆراوجۆر، وەکو ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆنو سینەما، بە مەبەستی بەستنەوەو گرنگپێدانی بیرەکە بە گوێی گوێگراندا، بە مەبەستی ئاسانکردنی، بریتییە لە ڕوونکردنەوەی شتێك بۆ گوێگر. بەڵام ڕازیکردن بریتییە لە نیشاندانی شتێك بە شێوەیەکی قایلکەر.

لێرەدا جیاوازی هەیە لەبارەی پێناسەکردن بۆ پڕوپاگندە، بۆ نموونە هێندێك کەس پێناسەیدەکەن بەوەی کە جۆرێکە لە بڵاوکردنەوە،

(١) قۆچی قوربانی:- بریتییە لە فێڵێکی بەرگری کە پێشەواکە، یان دیکتاتۆرەکە سەرنەکەوتنی خۆی لە جەنگێکدا، یان خراپەو دڵڕەقییەکانی خۆی دەداتە سەر کەسێکی دیکەدا، وەکو چۆن(جەمال عبد الناصر) سەرنەکەوتنی جەنگی ساڵی ١٩٦٧ لەگەڵ جولەکەدا، هۆکارەکەی دایە سەر(مشیر عبد الحکیم) دا وە بەندیکرد. هەروەها(سەدام حسین) هۆی سەرنەکەوتنی لەجەنگی فاودا، تاوانەکەی دا بەسەر ئەفسەرێکدا بەناوی (شیروانی) هەر بەدەستی خۆی کوشتی. - و -

هێندێکی دیکە پێناسەیدەکەن بەوەی کە هۆکارێکە بۆ دروستکردنی رای گشتی، بۆ رێککەوتن لەسەر شتێك، یان گرنگیدان بە شتێك، کە هێندێکی دیکە پێناسەیدەکەن بەوەی کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی زانیارییو راستییەکان، بێگومان دەشێت راستبێتو دەشێت راستنەبێت، بۆ دروستکردنی چەندین جۆر لە بیرکردنەوە لە چالاکی پەسند، یان بریتییە لە بڵاوکردنەوەی زانیاریی لەنێوان خەڵکیدا بە ئامانجی کارکردن لەسەر رای گشتیی، بەگوێرەی روکارێکی دیاریکراو، بەبێ ئاشکراکردنی ئەو کاریگەرییە، لێرەدا ئەوانەش هەن کە گوزارشتی لێدەکەنو پێناسەیدەکەن بەوەی کە درۆیەکە، یان ئامرازیکە بۆ گۆڕینی رای گشتییو دوورخستنەوەی لە ڕاستییە کردارییەکان، بۆ مەبەستی تایبەتی.

لەراستیدا ئەم جیاوازییە لەبارەی واتای پاگندەو پێناسەکەیەوە لەنێوان دەوڵەتەکاندا بە روونیو ئاشکرا دەرکەوتووە، بۆ نموونە مەبەست بە پاگندە لە ئەڵمانیا بڵاکردنەوەیە لە ماوەیەکی دیاریکراودا، ئەو وەزارەتەی کە (جوبلز) سەرۆکایەتی دەکرد لە ئەلمانیا ناونرا بە وەزارەتی رۆشنبیریو پاگندە.

لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت جیاوازیبکەین لە نێوان پاگندەو لە نێوان شێوەی بڵاوکردنەوەکانی دیکەدا، بۆ نموونە رۆژنامەنووس یان بڵاوکەرەوە هەواڵەکان کۆدەکاتەوە، بە مەبەستی بڵاوکردنەوەیان، بۆ خەڵکیو ئاگادارکردنەوەیان لە راستییەکان. بەڵام پاگندە بریتییە لە هەوڵێك کە جەختدەکات، بە مەبەستی کارکردنەسەر ئاڕاستە دەروونییەکانی خەڵکیی، بەو جۆرە ئاڕاستەدەکرێت کە پاگندەچییەکە ئارەزوویدەکات.

لە ڕاستیدا زۆرجار پاگندە هەستکردن بە پێویستی لای تاکەکان دروستدەکات، پاشان دوای ماوەیەك دەستدەکرێت بە پاگندە ڕاستەوخۆکە بۆی، ئەمەش لەبەرئەوەی پاگندەی کارا، ئەو پاگندەیەیە کە پەیوەندیدارە، بە پێویستییە هەنوکەییەکانەوە، لەلای تاك و کۆمەڵەکان. پاگندەش سەرکەوتوونابێت ئەگەر بێتو پلانێکی گونجاوی بۆ دانەڕێژرێت واتا: ئەگەر باردۆخی دیاریکراوو ئامادەگیەکی دەروونیی لای تاك و کۆمەڵەکان بۆ دابیننەکرێت، ئەگەر ئەو مەرجانە دابینکرا ئەوا بە ئاسانی کاردەکرێتە سەر ئاڕاستەکانی خەڵکیو ڕاو ڕەفتارەکانیان لەبەرئەوەی مرۆڤی ئاسایی، ڕای کەسانی دیکە زۆر کاریتێدەکاتو بەجۆرێکی وا دەریدەبڕێت کە ڕای تایبەتی خۆیەتی.

پاگندەی هیتلەری جیاوازە لە پاگەندەی مارکسی، مارکسییەت بە توانای پاگندەکردن دەناسرێتەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی ئاماژەدەکات بە قۆناغێکی شارستانیی دیاریکراو، لەبەرئەوە پشت بە مادیەت دەبەستێ، کارڵ مارکس گوزارشت لەوەدەکات، بەوەی کە هەستی چینایەتی بریتییە لە بنەمای هەستی ڕامیاریی، لەبەرئەوە پێویستە پشتگوێنەخرێت، چونکە لە دوارۆژدا دەگۆڕێت بۆ جووڵەی سەندیکایەکی ڕووت، واتا:- هەروەك لینین دەڵێت پێویستە چالاکبکرێتو هۆشیاربکرێتەوە، لە ڕێگەی پاگندەوە بەو گوزارشتەی کە پاگندەچی ڕۆشنبیرێکی ڕامیارییە، پاگندەی لینینی پشت بە بڵاوکراوە دەبەستێت، کە بۆ هەر ناوچەیەك، یان پیشەیەك، ڕۆژنامەیەکی تێدا بڵاودەکرێتەوە، هەموو ئەم ڕۆژنامانە هەمان زانیاری بڵاودەکەنەوە، بەڵام بۆ هەر ڕۆژنامەیەك شێوازی تایبەتی خۆی هەیە کە لە ئاستی ژیری خوێنەرەکاندا پیادەیدەکات.

پارت بە باوەڕی لینین بریتییە لەو ناوەندەی کە سەرۆکایەتی بە جەماوەرەوە دەبەستێتەوە، پاگندەش واتای نییە تەنها ئەوە نەبێت کە ئامێرێکە بەدەست پارتەکەوە بۆ راکێشانی جەماوەرو رۆشنبیرکردنی. بەڵام ( ماوتسی تونگ) سوپای داناوە بەجوڵێنەری گەل، گرنگی بە رۆشنبیرکردن داوە بەو گوزارشتەی رۆشنبیرکردن وەك ئامێرێك لە ئامێرەکانی پاگندە کاردەکاتە سەر رای گشتی وەکو/ ئەنجامدانی زنجیرەکانی لێکۆڵینەوەو ڤیستڤاڵەکانو چالاکییە سیاسییەکانو ئابوورییەکانو رۆشنبیرییەکانو وەرزشییەکان......هتد.

دەربارەی پاگندەی نازی، موسولینی دەڵێت پیاوی نوێ هەرچی پێدەڵێن، باوەڕپێدەکات هیتلەریش دەڵێت ( جەماوەر تایبەتمەندیو سۆزداری خۆی هەیە، دەتوانرێت بقۆزرێتەوە کاریتێبکرێت)، نازی پاگندەیەك بەکاردەهێنێت کە لەسەر تیۆری دژدانەوەی مەرجی، لە تیۆری باڤلوڤ دامەزراوە کە کاردەکاتە سەر لایەنێکی تایبەت، لەلای کەسەکەو دەیوروژێنێت، لە ئەنجامدا بۆ دەرخستنی ئەو لایەنە لە کەسەکەدا کارتێکراوە، هەروەك لەم تاقیکردنەوەیەی خوارەوەدا بۆماندەردەکەوێت:- ئەگەر پارچە شەکرێمان خستە بەردەم سەگێك دەبینین لیك بەدەمیدا دێتەخوارەوە، ئەگەر کلۆشەکرێکمان خستەبەردەم سەگێکو چەند جارێك دووبارەمانکردەوە، لەگەڵ لێدانی زەنگێکدا، ئەوا دەبینین لیك بە دەمی سەگەکەدا دێتەخوارەوە، هەرچەند گوێی لە لێدانی زەنگەکە بێت بەو گوزارشتەی کە وروژێنەرێکە یان سەرنجراکێشەرێکە ئەمجارە زەنگەکەیە نەك شەکرەکە، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دوور دەبینین دەنگی زەنگەکە کارناکاتە سەر سەگەکە، لەبەرئەوە دەبێت ناوبەناو لەگەڵ لێدانی زەنگەکەدا شەکری دیکە بەکاربهێنین. لەبەرئەوە هیتلەر دەیویست روونیبکاتەوە کە

بەختەوەری ئەڵمان پەیوەندی بە پارتی نیشتمانیی سۆشیالیستییەوە هەیە، سەرەڕای بەهێزکردنی ئەم هەستە بە بڵاوکردنەوەی خاچی ئەڵقەدارو سڵاوی هیتلەریو وێنەکانی فوهرەر بە حیزبەکەیەوە.

ڕۆشنبیریی لە پاگندە به ڕێگاکانیو ئەنجامەکانییەوە جیادەبێتەوە، بۆ نموونە لە ڕووی ڕێگەوە ڕۆشنبیریی هێندێ جار واتای ئەو پاگندەیە دەگەیەنێت، کە خێزان یان خوێندنگە بە یارمەتی هێندێ لە چەمکەکانی رەوشتیدا لە مێشکدا دەیڕوێنێتو دایدەڕێژێت ڕۆشنبیریی راستەقینە ئەوە نییە کە باسکرا، بەڵکو ڕۆشنبیریی واتای روونکردنەوەی تایبەتمەندیی تاك دەگەیەنێت. کەواتە جیاوازییەکانی نێوان ڕۆشنبیریو پاگندە ئەوەیە کە ڕۆشنبیریی هەمیشە تاکییەو داڕشتنیو بۆ چوونەکانی هەمیشە لە مێشکی تاکدا کاردانەوەی هەیە، بەڵام پاگندە کۆمەڵییە واتا لە کۆمەڵدا بڵاودەکرێتەوە، یان لەناو جەماوەردا کاریگەرییەکەی، بۆ ماوەیەکی کورتە، کە دوای ئەوە دادەبەزێت، لەلایەکی دیکەوە ڕۆشنبیریی روکاری نوێ لەلای تاکەکە دروستدەکات، کە دەیگۆڕێت بۆئەوەی ئامادەبێت بۆ رەفتارێکی دیاریکراو. بەڵام پاگندە پشت بەو روکارانە دەبەستێت کەبوونیان هەیە لەلای کۆمەڵ، هەروەها هەڵدەستێ بە نزیککردنەوەو چالاککردنی، کۆمەڵەکە، بەجۆرێك کە تاکەکە، ئامادەدەکات بە هەڵسوکەوتێ بەگوێرەی ئارەزوی پاگندەکە کەواتە ڕۆشنبیریی تاکەکە ئاشنادەکات بە روکارە گشتییەکان بەڵام پاگندە تاکەکە ئاشنادەکات بە روکارە تایبەتییەکان.

گیروگرفتی رای گشتی بە گیروگرفتی روکارەکانو بیروباوەڕەکانەوە دەبەسترێتەوە.

روگار: بریتییە لە ئامادەگییەك بۆ هەستان بە کارێکی دیاریکراو. بەڵام بیروبۆچوون بریتییە لەو بیرکردنەوەیەی کە بە ڕاستدادەنرێت وە گوزارشتی لێدەکەین بەوەی کە ڕاستەقینەیە.

## پڕوپاگەندەو جەنگی دەروونیی:-

جەنگی دەروونیی پاگندە دەگرێتە خۆی لەگەڵ بەکارهێنانی کردارە سەربازییەکاندا یان هەڵسوکەوتەکانی تردا کە پێویستی دەیانسەپێنێت.

جەنگی دەروونی بریتییە لە بەکارهێنانی نەخشەیەك لەلایەن دەوڵەتەوە لەکاتی جەنگدا یان لەکاتی مەترسیداردا، بەکارهێنانی کاری پاگندەیی، بە مەبەستی کارکردنە سەر راو سۆزەکانو هەڵوێستەکانو رەفتاری کۆمەڵە بیانییە دوژمنکارەکان، یان بێلایەنەکان، یان دۆستەکان، بە رێگەیەك کە یارمەتیبدات بۆ بەدەستهێنانی رامیاری دەوڵەتو ئامانجەکانی.

بە دەربڕینێکی دیکە جەنگی دەروونیی بریتییە لە بەکارهێنانی نەخشەیەك، لەلایەن دەوڵەتێکەوە،یان کۆمەڵە دەوڵەتێکەوە بۆ پاگندە کردنو جگە لەمانەش ئەو هەڵسوکەوتە راگەیاندنە ئاڕاستەکراوانەیش دەگرێتەوە بەرامبەر بە کۆمەڵی دوژمنەکان، یان ناکۆکەکان، بۆ کارکردنە سەر راکانیانو سۆزەکانیانو هەڵوێستەکانیانو رەفتارەکانیان، بە رێگەیەك کە یارمەتیبدات بۆ بەدەستهێنانی سیاسەتو ئامانجەکانی دەوڵەتە بەکارهێنەرەکە، یان دەوڵەتە بەکارهێنەرەکان، بۆ پاگندەکە لە جەنگی دەروونیدا.

گرنگیی بنچینەیی لە جەنگی دەروونیدا بریتییە لە زاڵکردنی ویستمان بەسەر ویستی دوژمندا، بە سەپاندنی فرمانکردن بەسەر کارەکاندا بە رێگەیەك جگە لە رێگەی سەربازی، بە ئامێرێك جگە لە ئامێرە

ئابوورییەکان، لەراستیدا کردارەکانی جەنگی دەروونیی جاری وا هەیە مەوداکەی کورتدەبێت، جاری واش هەیە درێژ دەبێت، جۆرەکانی چالاکی مەودا کورتەکان، ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:-

١-پاگندەی ( ستراتیژی).

٢-پاگندەی کوشتار.

٣-بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان.

٤-فرِوفێڵکردن لە دوژمن بە رێگەی رێکخراوو چەسپاو.

٥-پاگندەی نهێنی.

بەلام مەودا درێژەکەی بە رِێگەیەکی بەردەوام، لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان پێکدێت بە ئامێری جۆراوجۆر، بە مەبەستی یارمەتیدانی رامیاریی دەرەکیی، بۆ دەوڵەتو بەرزکردنەوەی رەووشتی بەدەستهێنانی بە پشتگیری.

لەراستیدا گرنگیی جەنگی رامیاریی بەوە دەناسرێتەوە کە بریتییە لە جێبەجێکردنی پاگندە بۆ خزمەتی پێویستی جەنگ.

دەتوانرێت جەنگی رامیاری بناسرێت، بەوەی کە شێوەیەکە، لە شێوەکانی ململانێ لەنێوان دەوڵەتەکاندا، کە هەریەکە تێیدا هەوڵدەدات ویستی خۆی بەسەر لایەکەی تردا بە رِێگەیەك بسەپێنێت جگە لە رێگەی هێزی چەکداریی، لەم حاڵەتەدا چەکی دەوڵەت پاگندەو دیبلۆماسیەت پێکەوە دەبەستێتەوە.

جەنگی رامیاریی یان جەنگی نائاسایی، ئامانجەکەی لەناوبردن، یان بێهێز کردنی دوژمنە، ئەگەر بتوانرێت، لەناوببرێت، بە یارمەتی بەکارهێنانی گەلەکۆمەکیکردنی دیبلۆماسیو پەستانی ئابووریو زانیارییە راستەکانو وێلکەرەکانو وروژاندنیو ترساندنیو روخاندنیو توندوتیژیو گۆشەگیرکردنی لە هاورێکانیو پشتگیرەکانی.

گرنگترین چوار چەکەکەی جەنگی رامیاریی بریتین لەمانە:-

١-دیبلۆماسیەت.

٢-پاگندە.

٣-ئابووریی.

٤-سەربازیی.

لەکۆتایدا دەڵێین:-جەنگی رامیاریی هەوڵی بەدەستهێنانی باری ژێریو ویستەکانە.

## جەنگی رامیاریی بۆ خزمەتی پێویستی جەنگ:

جەنگی پاگندە بە واتای هەڵبژاردنی گوزارشتەکانو رەواجپێکردنیان، بە مەبەستی کارکردنە سەر رەفتاری جەماوەر، لە کێشە جۆربەجۆرەکانی دەوڵەتاندا، بەلام دوژمنایەتیکردنی ناڕاستەوخۆ، بە واتای کردارەکانی رووخاندنو هاندان بۆ شۆڕش دێت، هەروەکو چۆن بەکارهێنانی پاگندەو زانیاریش بۆ ئامانجی هێرشبردنیش دەگرێتەوە. جەنگی دەروونیی تەنها بەکارهێنانی رادیۆ ناگرێتەوە لە پاگەندەدا بەڵکو لێرەدا چەند ئامێرێکی تریش هەن بۆ نموونە پێویستی ئابووریی هاوبەش، بازرگانیو ئاڵوگۆڕی شت، وەك بەستنی پەیوەندییە هەنووکەییەکان، لە رێگەی باڵوێزەکانو پەیامنێرەکانو یارییە وەرزشییەکانو هەموو ئەمانە یارمەتی هەموو ئەو پرۆگرامانە دەدەن کە خراونەتە پێش چاو لەبەر هاوکاریی سەربازیو ئاسایشی کۆمەڵی.

# دەروازەی سێیەم

## بەشی دووەم

- ئاستی هونەری لە جەنگی شۆڕشگێڕیدا

- توندوتیژی، یان (کرداری تۆقێنەر).
- پاگندە.
- جەنگی رزگاریخوازی.
- شێوازە نوێکان لە جەنگی شۆڕشگێڕیدا.
- ئامێرە رامیارییە سەرەکییەکان لە کاتەکانی ئاشتیو جەنگدا.

## ئاستی هونەریی لە جەنگی شۆڕشگێڕیدا :-

ئاستی هونەریی لە جەنگی شۆڕشگێڕیدا بریتییە لە ئاستی ڕێگەو شێوازەکانو ناتوانرێت لێکۆڵینەوەیەکی قوڵ بۆ ئەم ڕێگەو شێوازانە ئەنجامبدرێت، بەگوێرەی ژمارەیان. گرنگترین ئەو ڕێگایانە بریتییە لە توندوتیژی، پاگندە، ڕێکخستنی جەماوەر، جەنگی ڕزگارکردن، بەکارهێنانی هێزە چەکدارە چاولێکەرییەکان.

**١- توندوتیژیی یان (کرداری تۆقینەر):**

ئامێرێکە لە ئامێرەکانی پەستان بۆ قەدەغەکردنی دانیشتوان لە پێشکەشکردنی زانیارییەکان بۆ دوژمن. توندوتیژی داوای هەستان بە ئەنجامدانی تیرۆرکردنە نموونەییەکان دەکات ( کوشتن بەهۆی تەقینەوەکانەوە، تیرۆرکردنی نهێنیو ئاشکرا، شێواندن). ئەمەش دەبێتەهۆی پەرەسەندنی دەسەڵات.

ئەم شێوازە گوزارشتی لێدەکرێ بەوەی کە جۆرێکە لە جۆرەکانی پاگندە، ئەگەر توندوتیژییەکە ئاراستەنەکرا بە شێوەیەکی باشو بەرنامەدار ئەگەر یارمەتینەدرا بە بڵاوکردنەوەی بیرێکی رامیاری گونجاو دەشێت ببێتە هۆی هەستانی دانیشتوان لە دژی، بە تایبەتی ئەگەر لەوەوپێش هەستی دانیشتوان نەوروژێنرابێ، ئەمەش بۆ نموونە/ سەرنەکەوتنی ڕێکخراوی سوپای نهێنی فەرەنسی لەساڵی ١٩٦١ لەناو فەرەنسادا.

**٢-پاگندە(١):**

**ئەمەش ئامێرێکی بنچینەییە بۆ زۆرکردنی ژمارەی سۆزدارەکانو ئەمەش دەبێتەهۆی پەیدابوونی بیرێکی رامیاریی باشو گونجاو کە گونجاوبێت لەگەڵ ئارەزووەکانی دانیشتواندا. وەرگێڕانی ئەم بیرە بۆ داڕێژراوێکی ئاسانو کاریگەر هەمیشە بەسەر زوبانەوە دەووترێتەوە، ئەگەر وانەبێت بە بیرۆکەیەکی سیاسی هەڵە دادەنرێت.**

**ئا لەبەرئەمە بوو کە فەرەنسییەکان هیچیان بەدەستنەهێنا لە جەزائیرو هیندی چینیدا. بەدرۆخستنەوەی پاگندە بە لێدوانە رەسمییەکان دوای ماوەیەك، زیان بە پاگندەکە ناگەیەنێت.**

**هەروەها پێویستە کە ئەو بیرە رامیارییە ئەو مەرجانەی تێدابێت ئەگینا پاگندەکە هەر دەمێنێ بەبێ کارتێکردن، با ئەو ناوەندە مادییانەش هەبن کە دەستیان بەسەرداگیراوە.**

**پێویستە هەمیشە پاگندە زیاتر بەهێزبکرێت، ئەویش بەڕووداوە گرنگەکان، لەسەر بەڕێوەبەری کردارە سەربازییەکان یان ناسەربازییەکان، ئەو جۆرە روداوە گرنگانە بەگوێرەی توانا دروستبکات.**

**دەبێت ئەوە بزانین کە سەرکەوتنی توندوتیژیی یان کرداری تۆقێنەرو کردارە خۆکوژەکان، یان کردەوە چەتەگەرییەکان، گوزارشتی لێدەکرێت بەوەی کە کارێکی پێویستە بۆ سەرکەوتنی پاگندە.**

**دەبێت ئەوەش بزانین کە پاگندەی گێرەو کێشیەکی رامیارییە پێویستە بگونجێت بە شێوەیەکی بەردەوامیی لەگەڵ باردۆخی گشتیدا.**

---

(١) بوفر، أندرية، الحرب الثورية- تعريب أكرم ديرى- الهيثم الايوبى- المؤسسة العربية للدراسة والنشر، لبنان، الطبعة الاولى تشرين الاول ١٩٧٣ (ص١٧).

### ٣- ڕێکخستنی دانیشتوان:-

دادەنرێت بە ئامێرێکی بنچینەیی لە جەنگی شۆڕشگێڕیدا، واتا: چاودێریکردنی دانیشتوان بە مەبەستی هۆشیارکردنەوەیان، لە ڕووی بیروباوەڕەوە، قەدەغەکردنی سەرپێچیکەران لەنێوان ریزەکانیاندا، ئەمەش لە ڕێگەی دروستکردنو دارشتنی لایەنی سیاسییەوە وەکو دروستکردنو ڕێکخستنی پارتێکی سیاسیی، یەکخستن بۆ بەهێزکردنو هۆشیارکردنەوەیان. لەڕاستیدا پارت چاودێری ئامێری بەڕێوەبردنو پۆلیسیی دەکات، هەروەك چۆن ( پارتەکە) یش چاودێریدەکرێت لەلایەن بنەماکانی ئاسایشی ناوخۆیەوە.

### ٤- جەنگی ڕزگاریخوازیی:

بریتییە لە ئامێرێکی بەهێز لە ئامێرەکانی پەستان. واتا: جەنگی رزگاریخوازیی بریتییە لە شێوازێکی چاولێکەری بۆ ئەو دووبەرەکییە درێژخایەنەی کە زۆربەی جار کۆتایی بەشیتەڵبوونی یەکێك لە دوو دوژمنەکە دێت. پێویستە لەسەر کۆمەڵەکان کە هەڕەشەکانیان دابەشبکەن بۆ سەر گەورەترین رووبەر، بەبێ ئەوەی کە زۆر لە دوژمنەکەیان بکەن، بۆ ئەوەی بکشێتەوە، بەڵکو بە ئامانجی زۆر لێکردنیەتی بۆ دابەشکردنی هێزەکانی بەسەر فرەوانترین رووبەردا. لەڕاستیدا جەزائرییەکان لە فراوانکردنی رووبەری ناوچەی جەنگی سەربەخۆییدا سەرکەوتن لە کاتێکدا هێرشیان کردە سەر کێڵگە تەریکەکانو کومپانیا هونەرییەکانو هێڵە تەلەفونە بێ چاودێرەکان، بۆ ئەوەی دوژمن ماندووکەنو سەرکەون بەسەریدا.

جەنگی دەروونیی چەند شێوازی جیاواز دەگرێتەوە، لە کاتێکدا کە دوژمن سەرکەوتوبو ئەوا ژمارەی چەتەکان لەسەر شێوەی کۆمەڵە

بچووکەکان دەبێت (٥ کەس) کارەکانیشیان نیزیکە لە تۆقاندنەوە، جیاوازیو ژمارەی کەسەکان زیاددەکات، ئەگەر دوژمن لاوازبو، تیپە شەڕکەرەکان لەسەر شێوەی کەتیبە دەبن ( ڤێتنام) ساڵی ١٩٦٥، یان لەسەر شێوەی فەریقو فەیلەق دەبن.

چەتەکان زۆر جار پێویستییان بە کۆمەکی دەرەکی دەبێت بۆ پاراستنیان لەمانەوەو بەردەوامبوونیان، هەروەك داوای پێکهێنانی یاسا دەرەکیەکان دەکەن، کە هەردوو لایەنی مادیو رۆحی دەگرێتەوە، هەروەك لە تونسو مەغریبدا روویدا، بۆ کۆمەکی بەرەی رزگاریخوازی نیشتمانیی جەزائیر.

## شێوازە نوێکان لە جەنگی شۆڕشگڕیدا:

ئەو شێوازە نوێیانەی کە لە جەنگی شۆڕشگێڕیدا بەکاردەهێنرێن ئەمانەن:- (تۆقاندن، پاگندە، رێکخستنی دانیشتوان، جەنگە چەتەگەرییەکان).

هەروەها دروستکردنی کەشێکی رامیاریی گونجاو و گەیشتن بە زانیارییەکان لە رێگەی هاندانی سیخوڕەکانەوە، هەرەسپێهێنانو پاگندەو تۆقاندنو جەنگی گەلییەوە.

ئامێرە رامیارییە سەرەکییەکان لە کاتەکانی ئاشتیو جەنگدا ئەمانەن:- دیبلۆماسیەت، پاگندە، ئابووری، تەقەمەنی.

بەڵام لە کاتەکانی جەنگدا پێویستە پشتببەسرێت بەمانە: جەنگی چەکداری، جەنگی ئاسایی، جەنگی دەروونی بەڵام رامیاری، لە جەنگی دیبلۆماسیدا، جەنگی پاگندەیە، جەنگی ئابووری.

جەنگی هەنوکەیی ئەمانە دەگریتەوە:- جەنگی سەربازی یان جەنگی ئابووری یان جەنگی

دەروونیی، ئەم سێ جۆرە هێندکیان بە هێندێکی تریانەوە بەستراونەتەوە، بەجۆرێك سەرکەوتنی سەربازیی سەرکەوتنێکی ئابوورییە، ئەگەر هاتو ئەنجامەکەی دەستبەسەرداگرتنی رێژەیەکی گەورە بێت لە دەستکەوتەکانی دوژمن، یان داخستنی رێگە گرنگیەکانی یارمەتیو زەخیرەو تەقەمەنی بێت، لەراستیدا دەستکەوتێکی دەروونیو گیانیی دەبێت، ئەگەر توانرا لایەنی رۆحی دوژمن نرم بکرێتەوە، یان سەربازەکانی وایان لێبکرێت کە توشی دۆڕاندن بن یان گەلی دوژمن هەلیان بۆ رێکبخرێت بۆ تەسلیمبونو ملکەچبوون.

سەرکەوتنی سەربازی سودی لێوەرناگیرێت ئەگەر ببێتە هۆی دارمانی دەروونیی، واتا ئەگەر یەکبونی ریزەکان دوژمن زیادیکردو خەڵکەکە جیاوازیان لەبیرچۆوە، چونکە کۆدەبنەوە بۆ رووبەڕووبونەوەی جەنگ.

جەنگی دەروونی بریتییە لە سەرچاوەی چەکی جەنگەکان، کە ئاراستەدەکرێت دژی بیرێك، ئەمەش لەیەککاتدا جەنگی بەرگریو جەنگی هێرشبردنە، لەبەرئەوەی هەوڵدەدات بونیادی وورەبەرزی گەلو سەربازەکان بنێت، لەلایەکی دیکەوە هەوڵی وێرانکردنی وورەی دوژمن دەدات.

جاری واهەیە دوژمن لەدوای دەنگی ئایینەوە خۆی دەشارێتەوە. لەگەڵ ئەوشدا ئاسەواری جەنگی دەروونیی ئەوکاتە لاواز دەبێت یان هەر نامێنێت ئەگەر بێتو دەوڵەتە ئامانجدارەکە گەلەکەی هۆشێکی ئاگابووی هەبێت، یان راهێنرابێت لەسەر بەکارهێنانی شێوازەکانی هۆشی رامیاریو کۆمەڵایەتی بە پلەیەکی گەورە، بۆئەوەی ئامانجەکان تێبگات، بۆئەوەی کردارە نامرۆڤایەتییەکانی دوژمن بناسێتەوە.

تەنها ئامادەکردنی چەکدارو تەقەمەنی لە جەنگدا بەس نییە، مادام ئامادەکردنی رای گشتیی لەگەڵدانەبێت، بەڵام شێوەکانی رێکخستنی پاگندە دەگونجێت کە یەک بەڕێوەبەرایەتی هەبێتو بەرپرسیاربێت لە هەموو کردارەکانی پاگندە، ئەو کاتە چەند لقێکی لێدەبێتەوە، کە هەریەکەیان جێبەجێیدەکەنو هەموشیان بەرپرسیارن لە بەشێك لەم بەشانەی پاگندە، بۆ نموونە پاگندە دژی دوژمن، پاگندە لە وڵاتی ناوخۆدا، پاگندە لە وڵاتی دۆستدا، پاگندە لەنێوان هاووڵاتیاندا (بێچەکەکان)، پاگندە لەنێوان جەنگاوەراندا.

# دەروازەی سێیەم

## بەشی سێیەم

- ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە جەماوەرو رای گشتییەوە.
- چەمکی رای گشتی.
- پێناسەکانی رای گشتی.
- گرنگی رای گشتی.

## ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە جەماوەرو رای گشتییەوە:-

لە کۆمەڵگەی پیشەسازیی نوێدا لەلای جەماوەرەکەی گرنگی ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە جەماوەرەوە دەردەکەوێت، مەبەست بە ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە جەماوەرەوە، ئەو ئامێرانەیە کە تاکەکانو کۆمەڵەکانی لە رێگەیەوە کارلەیەکدەکەن، ئەم ئامێرانەش بیروراکانیان دەنوێنێتو کاریانتیدەکات.

ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە جەماوەرەوە، رۆژنامەو چاپکراوەکانو ئامێرەکانی ئیزگە لە رادیۆو تەلەفزیۆنو سینەماو شانۆ دەگرێتەوە.

رادەی دەماودەمکەوتنی هەواڵو وتەووت لەسەرکردنی، دەوستێتە سەر چەند کارکەرێکی فرە، لەوانە، ناونیشانەکەیو رێگەی دابەزاندنو پلەی لە رۆژنامەکەدا، سەرباری ئەوەش کە زوربەی هەواڵە کاریگەرەکانو خێرا بڵاوبووەکان بریتین:

لە هەواڵە کتوپڕە نائاساییەکان لەبەرئەوەی خوێنەر، یان گوێگر (لە رادیۆدا) ئارەزووی بەدواداچوونی هەواڵەکەی هەیە، بۆئەوەی بڵاویبکاتەوە، لە نێوان ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیەی کە لەدەوریدا هەن.

چاکەی روودانی گۆڕانکارییە گەورەو گرنگەکان لە ژیانی مرۆییدا بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە، بۆ ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بەجەماوەرو شۆڕشی پیشەسازییەوە.

ئەو کارکەرانەی کە کاریگەری ئامێرەکانی پەیوەندیکردنی کۆمەڵیی بە جەماوەرەوە دیاریدەکەن بریتین: لەو لایەنەی کە دەریدەکات واتا ( سەرچاوە) و (ناوەرۆك) و (بەڕێوەبردن) و (سروشتی ئەو کۆمەڵەی کە هەواڵەکەیان لێوەدەردەچێت).

دەربارەی کارکەری یەکەم واتا سەرچاوەکە ئەو ئامێرە کۆمەڵییانەی لێوەدەردەچێت مەودای متمانەی جەماوەرەکە بەو ئامێرانە گرنگییەکی بەرچاوی هەیە، لە دیاریکردنی پلەی کاریگەرییەکەی لە جەماوەردا. بۆ نموونە: کاریگەری ئەو هەواڵەی کە لە سەرچاوەیەکی ئەمریکییەوە ئەبیستریّ کاریگەرییەکەی جیاوازە، لەو هەواڵەی کە لەلایەنێکەوە دەبیسترێت کە بە پلەیەکی گەورە متمانەی پێدەکرێت.

هەوەها دەربارەی (ناوەڕۆك)، لە راستیدا گرنگیدەدات بە ڕووداوەکان، یان هەواڵەکان بە پلەیەکی بەرزتر لە گرنگیدان بێجگە لەوانی دیکە، بەڵام دەربارەی (بەڕێوەبردن) بۆ نموونە بەڕێوەبردنی کرداری زیاتر کاریتیدەکات، وەك لە بەڕێوەبردنی بیستراو، هەروەها دەربارەی جەماوەرو پلەی رۆشنبیرییەکەیو ئاستی هۆشمەندییەکەی.

ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە کۆمەڵەوە هەوڵدەدات بۆ بوون بەیەکی (رای گشتی)، رای گشتی بە ناوەڕۆکی کۆمەڵە کۆمەڵایەتییە داهێنەرەکە دادەنرێتو ئەوەش ناوەرۆکێکی گیانییە گوزارشت لەو یەککگرتنە گرنگانە دەکات، کە لە ئاوێتەی کۆمەڵایەتیی، ئاینیی، نەتەوەیی، پیشەیی، پێکهاتووە جگە لەمانەش. خۆپاڵدانی تاك بۆ چەند کۆمەڵەیەك کاریگەرییەکەی بە کۆمەڵەکانی دیکەوە گوزارشت لە ناوەرۆکی کاریگەری کۆمەڵەکە دەکات، کە دەبێتە هۆی لادانی بیروڕاکانی هێندێك لە تاکەکان، لە رای ئەو کۆمەڵەی کە پاڵیانپێوەداوە.

## چەمکی رای گشتی:

رای گشتی بریتییە لەو دیاردە دەروونییانە کە کاریگەرییەکی گەورەیان هەیە لەسەر کۆمەڵەکان. لەراستیدا رای گشتی بە بەردەوامیش جوڵێنەری رامیارییە لە بواری دەروونزانیی کۆمەڵایەتییدا. فەیلەسوفو رووناکبیرەکان هەر لە کۆنەوە گرنگییانپێداوە.

لە راستیدا( هیرۆدۆت)[1] هێزو کاریگەریی رامیاریی لە رای جەماوەردا دەرخستووە، رۆمانییەکان رۆڵی رای گشتییان لە بڵاوەپێکردنی یان وێرانکردنی دەستەڵاتی فەرمانڕەوادا دەرخستووە.
(هۆبس) وتویەتی کە جیهان رای گشتیی، فەرمانڕەوایی دەکات. (ماکیافل)[2] دەریخستووە کە چۆن فەرمانڕەوا پێویستەلەسەری هەمیشە پشت بە رای گشتیی ببەستێت. بەڵام ( ویلیام تمبل) رای گشتی بە مەڵبەندی دەسەڵاتی رامیاری دادەنێت (جۆن لۆك)[3] بۆ لەمە دوورتر دەڕوانێت، کاتێك رای گشتیی بە پێگەی یاسا دادەنێت.

---

(١) هیرۆدوت: [٤٨٠-٤٢٥ پ-ز]: لە شاری هێلیکارناس لە یۆنان لەدایکبووە، نازناوکراوە بە (باوکی مێژوو) چونکە یەکەم کەسبووە مێژووی نوسیوە لە گەرمەی بەرەبەرەکانی ناوخۆییو دەرەکی یۆناندا ژیاوە وڵاتەکانی ئەو سەردەمەی خۆی هەر هەمووگەڕاوە. - و -
(٢) نیکولا ماکیافیل[١٤٦٩-١٥٢٧ ز]: نوسەرێکی سیاسیی ئیتالییە، کابرایەکی بلیمەتیووە لە فەلسەفەی سیاسیدا، نفوزێکی گەورەی بەسەر سیاسەتمەدارانی سەردەمی خۆیو دوای خۆیدا هەبووە، وەکو: فریدریکی دووەم، ناپلیۆن، راکانی لە هەردوو پەرتووکەکەیدا (وتارەکان) و (نامەکەی بورونس) دا بڵاوکردۆتەوە. بە رای ئەو دەبێت ووڵات کەسیك بیباتبەڕێوە، دەستێکی ئاسنینو ویستێکی ئاگرینی هەبێت، دەبێت (بورونس) لە حوکمی هاووڵاتیە باشەکاندا یاسا بەکاربهێنێت، وەکو رێوی داناو فێڵبازبێتو نەکەوێتە تەڵەوە، بەڵام لەگەڵ پیاوخراپاندا شێربێتو ورگیان هەڵدڕێت. - و -
(٣) جۆن لۆك- John, Iocke[١٦٣٢-١٧٠٤ ز]: فەیلەسوفیکی وجودی ئینگلستانییە، ئەو بەرهەمانەی کە راکانی تێدا بڵاوکردۆتەوە، بریتین لەمانە، ووتارێك بە ناونیشانی (تیگەیشتنی سروشتی مرۆڤ)، پەرتوکێك بە ناونیشانی (لەبارەی حکومەتە)وە پەرتوکێکی دیکە، بە ناونیشانی (چەند بیرۆکەیەك لەبارەی پەروەردەوە). -و-

هێندێك كەس رەگەزی رێكخستن لەرای گشتیدا دووپاتدەكەنەوە، رای گشتی بەلای ئەمانەوە بریتییە لە رای كۆمەڵەی رێكخراوەكانو پارتەكانو نەقابەكانو كەنیسە، یان بە گوزارشتێكی دیكە هەموو ئەوانەی كە پێیاندەوترێ (كۆمەڵەكانی پەستان).

ئەو دانەرانەی كەوا دەبینن دیموكراتیەت، بریتییە لە هاوسەنگكردنی نێوان زۆرینەو كەمینە ، ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە رای گشتیی، لە راستیدا رای كەمینەیە. ئۆپۆزسیۆن واتا: جەختكردنەوە لەسەر رەگەزەكانی ووشیارییو رەخنەگرتن.

لێرەدا ناتوانرێت كە وێنای رای گشتیی بكرێت، لەبەرئەوەی، ئازایەتی دەربڕینی راكان، لە كۆمەڵێكەوە بۆ كۆمەڵێكی دیكە لە تاكێكەوە بۆ تاكێكی دیكە دەگۆڕێت.

لێرەدا رایەكی ئاشكرا هەیە، واتا رایەك كە بەئاشكرا دەووترێت كە لە هێندێ باردا دەتوانرێت بەهێزی رای گشتی دابنرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەیە ئەگەر بە رایەكی رەها دابنرێت،چونكە ئەم

رایە، رای تەنها چینێكە وەكو چینی كۆمەڵێكی كۆمەڵایەتی، یان رامیاری، یان پیشەیی، یان ئایینی دیاریكراو، لەبەرئەوەی هەر یەك لەم چینانە ئامێری وایان هەیە كە بەئاشكرا رای پێبدەنو پێشیدەچەسپێنن، رای گشتی هەروەك (جیمس برایس) باسیدەكات پێویستە بەكاربهێنرێت بۆ گوزارشتكردن لەو رایانەی كە خەڵكی باوەڕیان پێی هەیە لەو مەسەلانەی كە كاردەكەنە سەر بەرژەوەندییە گشتییو تایبەتییەكانیان، (مونتسكۆ)[1] بە ئاشكرا؟ ئاماژەی پێدەكات

(١) شارل دی مۆنتسكۆ[١٦٨٩-١٧٥٥ ز]: نوسەرێكی فەرەنسییە، وەكو دیكارت زۆر حەزی بەكەشتو كوزار كردووە سەفەری بۆ زۆر وولاتی ئەورووپی كردووە، شارەزای زۆری وەرگرتووە

دەڵێت: رای چینێك بە شێوەیەکی دابڕکراو رایەکی گشتیی نییە، چونکە سەربەخۆیی بۆ کۆمەڵەکانو هاونیشتمانەکانی تێدانییە.

رای گشتی بریتییە لەو رایە مەرجدارە کۆمەڵایەتییە بۆ گەورەترین ژمارەی گونجاو لە تاکەکان، دەربارەی کێشە گشتییەکان گوزارشتی لێدەکرێت، بەوەی کە ئاشکراو ئاراستەکراوە، تەنها کارناکاتە سەر کاروبارە گشتییەکان، بەڵکو دەبێت هەمو چینێکی گەل خوێندەوارو نەخوێندەوار رای تایبەتی خۆی دەربڕێت، بەبێ هیچ پەستانێك.

رای گشتی یەك پێناسەی نییە کە توێژەرەکان لەسەری رێکبکەون، لەبەرئەوەی رای گشتی ناوێك نییە بۆ یەك شتی دیاریکراو بەڵکو پۆلێندەکرێت بە چەند شێوەیەکی فرە.

**سەرەڕای جیاوازی ئەم پێناسانە لێرەدا رێککەوتن هەیە لەسەر ئەم کارانەی خوارەوە:-**

١-رای گشتی رای کۆمەڵێکی گەورە لە تاکەکان دەنوێنێت.

٢-ئەم رایانە پەیوەندیدارن بەو دۆسێیانەی، کە خەڵکی جیاوازی هەیە لە سەریانو بەرژەوەندیدارن بۆ هەموو.

٣-ئەم رایانە دەتوانرێت کاری پێبکرێتە سەر رەفتاری تاکەکانو کۆمەڵە رامیارییەکان، یان گشتییەکان، بەڵام هێندێك کەس بۆ ئەم کارە ئەوە زیاددەکەن کە دەبێت پێشبڕکێ، دابینبکرێت بۆ گەیشتن بە رایەك.

---

لەبەر ئەو دەلیت: کاتیك لەفەرەنسەم هەمو کەسم خۆشدەویت، کەلەئیتالیا دەبم لەگەل هەموکەسیکدا روخۆشدەبم، کەلەئینگلستان دەبم کەس ناناسم، کەلەئەلمانیا دەبم لەگەلهەموکەس دەخۆمەوە. - و -

هێندێك لە زاناکان وا دەبینن کە رای گشتی بریتییە لە کۆمەڵێك رای جیاواز، بەڵام هێندێکی دیکە لەسەر ئەوە رێك دەکەون وەك (جۆن دیوی)[٢] کە ڕای گشتی پابەندبوونێکی کاراو رێکخراودادەنێت، ئەمەش بە مەبەستی گەیشتن بە رێککەوتن لە رێگەی گفتوگۆوە، لەئەنجامی ئەمەشدا رای گشتیی بەدیهاتووی هەموو رای تاکەکان نییە بەڵکو رای زۆرینەی خەڵکە لەبارەی دۆسێیەکانەوە.

=پێناسەی جون ستیوارت میل[٣]: بریتییە لەوەی کە کۆمەڵگە ( یان بەشێکی بەهێزی بڕیارێکی تایبەتی لەسەر بدات یان کۆمەڵگە نەیەوێت) ئەو بڕبارەبدات.

=پێناسەی دوب: واتا:- ئاڕاستەکانی خەڵك بەرەوڕووی دسێیەکی دیاریکراو، لە کاتێکدا کە ئەم خەڵکانە ئەندامن لە هەمان کۆمەڵەدا.

=پێناسەی کلیردج کنگ (Klaridge King):- رای گشتی بریتییە لەو بڕیارەی کە کۆمەڵ پێیدەگات لە دۆسێیەکدا، کە گوزارشت لە گشت دەکات، ئەمەش دوای گفتوگۆی ئاشکرای کۆتایی پێهێنراو.

=پێناسەی جیمس برایس: رای گشتی بریتییە لەو زاراوەیەی کە بەکاردەهێنرێت، بۆ گوزارشتکردن، لەو کۆمەڵە رایەی، کە کۆمەڵێك

---

(٢) جۆن دیوی[١٨٥٩-١٩٥٣]: فەیلەسوفو دەروونزانێکیئەمریکییە. - و-

(٣) جۆن ستیواردمل[ ١٨٠٦-١٨٧٣]: فەیلەسوفیکو ئابور بوریزاتیکو جاکسازێکی کۆمەڵایەتیو سیاسی ئینگلیزە، کۆمەڵێك کتێبی نوسیوە باسەکانیان گرنگیان بەچینی کۆمەڵایەتیو ناوەندی هیزو پەیوەندی نێوان شارستانیو کەسێتیدا، داوە. - و -

باوەڕیان پێی هەیە، لەو دۆسیٚیانەی کە کاردەکەنە سەر بەرژەوەندییە گشتیو تایبەتییەکان.

=پێناسەی جیمس یونگ: بریتییە لەو بڕیارە کۆمەڵایەتییەی کە گوزارشت لە کۆمەڵگەیەکی هۆشیار دەکات، ئەمەش دەربارەی مەسەلەیەکی گشتییە، کە گرنگی هەیە بەوەی کە بڕیارەکە کاردەکاتە سەر رامیاریی گشتیی.

## گرنگی رای گشتیی:

رووناکبیرەکان هەر لە کۆنەوە گرنگییانداوە بە لێکۆڵینەوەی رای گشتیی، لەڕاستیدا هیرۆدۆت هێزی دەرخستووە کە کاریگەری رامیارییە بۆ سەر رای جەماوەر، رۆمانییەکان رۆڵی رای گشتییان دەرخستووە، لە یارمەتیدان، یان لەناوبردنی دەستەڵاتی فەرمانڕەوادا، (هورس) دەڵێت جیهان رای گشتیی حوکمیدەکات، (ماکیافل) دەریدەخات کە فەرمانڕەوا پێویستە لەسەری، هەمیشە پشت بە رای گشتیی ببەستێ، بەڵام (ولیام تمبل) پێناسەی رای گشتیی دەکات، بەوەی کە ئەو ناوەندەیە کە دەستەڵاتی رامیاری پشتی پێوەدەبەستێت، گرنگترینی ئامێرەکانە بۆ هەڵبژاردنی کۆمەڵە پێشەواییەکان.

(جون لوك) بە ئەندازەیەك بیردەکاتەوە لە رای گشتی بە پێگەی یاسادادەنێت، لەڕاستیدا پەرەسەندنی کۆمەڵگا مرۆییەکان گرنگی تایبەتی هەیە لەسەر رای گشتیی، کە لە دوو توێی هەڵبژاردنەکاندا ئاماژەی پێدەدرێتو، دەتوانرێت تاقیبکرێتەوەو لە رێگەی پاگندەوە

کاریتێبکرێت، ئەمەش بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە سیاسییە دیاریکراوەکان.

لەراستیدا تەکنەلۆجیا یارمەتیداوە بۆ زیادبوونی دامەزراوەکانو ئامێرە کاریگەرەکان لە رای

گشتیدا، بۆ نموونە رۆژنامەو تەلەفزیۆن و ئیزگەو سینەماو شانۆ واتا (ئامێرەکانی پەیوەندی کۆمەڵیی) بە تایبەتی لە شارەگەورەکاندا.

پێناسەی رای گشتی لە روویەکەوە واتای رای زۆرینە نادات، بەڵکو دەگونجێ کەمایەتی ئۆپۆزسیۆن بێت، کە بەچالاکیو هۆشی رەخنەگر دەناسرێتەوە. بە راستی رێکخستن بەوەدادەنرێت کە رەگەزێکی گشتییە لە رای گشتیدا.

ڕای گشتیی واتا: رای کۆمەڵە رێکخراوەکان، واتا: کۆمەڵەکانی پەستان، بۆ نموونە پارتە رامیارییەکانو سەندیکاکان.

رای گشتی بەکاردەهێنرێت بۆ دەربڕین لەو کۆمەڵە رایانەی کە خەڵك باوەڕیان پێی هەیە، لەو دۆسیانەی کە کاردەکانە سەر بەرژەوەندییە گشتییەکانو رای کۆمەڵێکی گەورە لە تاکەکان، ئەم رایانە پەیوەندییان هەیە بەو دۆسیانەی کە جیاوازن لە دۆسێکانی دیکە، پەیوەندییەکی راستەوخۆیان هەیە بە بەرژەوەندی گشتییەوە بۆ هەموو. ئەم رایانە بەهۆیانەوە دەتوانرێت کاربکرێتە سەر رەفتاری تاکەکانو کۆمەڵە رامیارییەکانو گفتوگۆی رێکخراو لە رێگەی ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە جەماوەرەوە بکرێت. ( ئامێرەکانی پێڕاگەیاندن) بریتییە لەو ئامێرانەی کە دەبنە هۆی گەیشتن بەو را گشتییانەی کە پەیوەستن بە دۆسێ گشتییە هاوبەشەکانەوە، لێرەدا چوار کارکەر هەن دەبێت

بەکاربهێنرێن لە کاریگەریی هەواڵەکاندا لە رای گشتییدا ئەمانەش بریتین لە:-

١/ سەرچاوە: واتا: سەرچاوەی هەواڵەکە.

٢/ نامە: واتا: ناوەڕۆکی هەواڵەکە.

٣/ ئامێر: واتا: ئامێری گواستنەوەی هەواڵەکە یان ئاشکراکردنی هەواڵەکە.

٤/ کەسەکە: واتا: بڵاوکەرەوەی هەواڵەکەو کەسێتییەکەیو مەودای کاریگەرییەکەی.

ئەمەش سەرباری رادەی کاریگەریی پاگندەو ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە جەماوەرەوە لە رای گشتیدا، لە دوو توێی کارکەری دەوروبەری کۆمەڵایەتییو سروشتیی جەماوەرە ملکەچەکەدا، بۆ ئەو کارتێکەرەو بارودۆخی ئابووریو رۆشنبیریی، دیاریدەکرێت.

ئامێرەکانی پەیوەندیکردن بە جەماوەرەوە وەسفدەکرێت بە کەم نەرمیی.

ئەو کارەش دەبێتە هۆی ئەوەی پەناببرێت بۆ یارمەتیوەرگرتن لە پاگندە، بە مەبەستی گەیشتن بە روونبونەوەی رای گشتیی.

# دەروازەی چوارەم

## بەشی/ یەکەم

- ئامێرەکانی پەیوەندیی کۆمەڵیی
- دینامیکی کۆمەڵو پێوانەکانی کۆمەڵایەتیی
- پەیوەندیی دینامیکی کۆمەڵ بە زانستە مرۆییەکانی دیکەوە
- رێگاکانی لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵە بچوکەکاندا
- پەیوەندیی نێوان دینامیکییەکانی کۆمەڵو دەروونزانیی
- تێوەچوون لەنێو کۆمەڵو کۆمەڵگەدا

## ئامێرەکانی پەیوەندی کۆمەڵیی:-

جەماوەر لە کۆمەڵگەی پیشەسازی نوێدا بۆیدەردەکەوێت کە پێویستی پەیوەندیکردن بە دەزگا چالاکەکانی راگەیاندنەوە هەیە، لەبەرئەوە دەستەڵاتە گشتییەکان، توانایەکی زۆر بەختدەکەن لە گرنگیدان، بەم ئامێرانە بەوە، دانرێت کە کاریگەرییەکی کارای هەیە لە بواری پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا. تاکەکان لەم کۆمەڵگا پەرەسەندووانەدا، بەشێوەیەکی گشتی گرنگیدەدەن بەو ئامێرانە.

بۆ نموونە لە فەرەنسا(٤/٥ ی) پێگەیشتووان رۆژانە بەلای کەمییەوە سەعاتێك لە کاتیان بۆ خوێندنەوەی رۆژنامەی رۆژانە تەرخاندەکەن، گرنگیپێدانی تاکەکان بە رۆژنامە کاتێك دەردەکەوێت، کە خەڵکی دەستدەکەن بە مانگرتن، بۆ نموونە هێندێك لە تاکەکانی دەگەڕێنەوە بۆ خوێندنەوەی رۆژنامە کۆنەکان، رۆژنامەکان ئەو گرنگییە لەوە وەردەگرن کە گەورەترین دامەزراوەی راگەیاندنی کۆمەڵییە بۆ گەیشتنی کۆمەڵەکان بە هەواڵە نوێکان.

رۆژنامە لە گرنگیپێداندا وەکو باقی ئامێرەکانی دیکەی راگەیاندن وایە، وەکو رادیۆو تەلەفزیۆن، گۆڕینو شێواندنی هێندێك هەواڵ دەبێتە هۆی دژەکرداری دەروونیی گەورە بۆ خوێنەر. پلەی کاریگەری هەواڵەکە دەوەستێتە، سەر رێگای دابەزاندیو ناونیشانو شوێنەکەی لە رۆژنامەکەدا.

هەواڵ کاتیك گرنگە کە کتوپڕو نائاسایی بێت، دەبینین زۆربەی هەواڵەکانو رووداوەکان لە رووداوە کتوپڕە چاوەڕواننەکراوەکانەوە بلاودەبنەوە، وەکو کوشتنی سەرۆکی ئەمریکی (جۆن کەنەدی)، ئەم جۆرە بۆ نموونە ئارەزووی خوێنەر بۆ بەدواداچوونی هەواڵەکە دەبزوێنن، بۆئەوەی بلاویکاتەوە لەنێوان ئەو کۆمەڵەی کە لە دەوریدان.

هەروەهاخێرایی بڵاوکردنەوە شتێکی پێویستو بنچینەییە لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکەدا، لە ڕاستیدا ئامێرەکانی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان بەخێرایی یەکجار پەرەیسەندووە، چونکە سەرەتا دەستکرا بە گواستنەوەی هەواڵەکان بەهۆی ئامێری تەلەگرافەوە لەساڵی ١٨٤٠ دا. هەروەها ئامێری چاپکردنیش لە ئامێری دەستییەوە لە سەرەتاکانی سەدەی پانزەهەمدا، پەرەیسەند بۆ چاپکردنێك بە یارمەتی (کحول)ەوە، کە یەکێك لە ئەڵمانیەکان دایهێناوە، دوای ئەو(جون والتر) بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (تایمسی لەندەنی) ساڵی ١٨١٤ بەکاریهێنا، بۆ چاپکردنی هەزار لەبەرگیراوە، (فۆتۆ کۆپی) لە یەك سەعاتدا، هەتا ئەمڕۆکە گەیشتوین بەچاپکردنی نوێ، کە لە سەعاتێکدا بە ملیۆنەها لەبەرگیراوەی لێدەگیرێتەوە.

ڕێگەی کۆکردنەوەی هەواڵەکانیش بەگوێرەی گرنگییەکەیجیاوازە.

سەرچاوەی هەواڵەکە بەگوێرەی سروشتی خۆیو ئامێری بڵاوکردنەوەکەی کاردەکەنە سەر کەسەکە، ئەمەش دەوەستێتە سەر جۆری ئامێری بڵاوکردنەوەی پاگەندەییو جۆری جەماوەرەکە.

کارتێکردن بە پلەی یەکەم پشت بە سەرنجڕاکێشان، پاشان گەیاندنی هەواڵەکە هەوڵدانی، بۆ کارتێکردن لەسەر ڕاکانیو ئاڕاستەکانیو ڕەفتارەکانی دەبەستێت.

ئامێرەکانی ڕاگەیاندن هەوڵدەدەن کە ڕای گشتی یەکخەن، ڕای گشتی خۆی لە ئەنجامی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان لەناو کۆمەڵداو گفتوگۆکردن لە دوو توێی هەڵبژاردنەکاندا دروستدەبێت، بە ناوەڕۆکی کۆمەڵە شوێنکەوتووە داهێنەرەکە دادەنرێت، ئەوەش ناوەڕۆکێکی گیانییە، واتای ئەو یەکگرتنە دەگەیەنێت کە گرنگی بەلایەنی کۆمەڵایەتیی، ئاینیی، نەتەوەیی، پیشەیی..هتد دەدات.

هێندێك لە تاکەکان رای جیاوازیان لە رای ئەو کۆمەڵەی کە پاڵیانپێوەداوە هەیە، وەکو پاڵدانی تاك بە کۆمەڵە فرەکانەوە، وەکو خێزانو هاوڕێیانو هاوکارانی کار.. هتد ئەوکاتە بێگومان هەر توێژێك لەم توێژانە کارتێدەکات، لێکۆڵینەوەکانی بابەتی رای گشتی دەریانخستووە کە رای راستی تاکە کە خۆی نیشانەی جێگیریو دەربرینی خێرای پێوە دیارە، بەڵام ئەو رایەی بەرێگەی چاولێکەری لە خەڵکی وەریگرتووەو دەیکاتە رای خۆیو جێگیرنیەو درەنگیش دەریدەبڕێتو تا رادەیەك راڕایشە لە دەربڕینیداو متمانەیشی پێناکرێت.

## دینامیکی کۆمەڵو پێوانەی کۆمەڵایەتیی:-

## بزوتنەوەکانی کۆمەڵ (Group Dynamique) :-

بنەماکانیو پێناسەکەیو چەمکەکانیو گرنگییەکانی:- بەکارهێنانی زاراوەی بزوتنەوەکانی کۆمەڵ هەر لە جەنگی جیهانی دووەمەوە بڵاوبۆتەوە، لەو کاتەی دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی گرنگی زیادیداوە بە لێکۆڵینەوە تاقیکارییە وردەکان، واتا لەو کاتەی لە لێکۆڵینەوە سەرزارییەکانەوە روویکردە ئەو باسە زانستییانەی کە گرنگیدەدەن بە ژیانی رۆژانە، لەگەڵ ئەوەشدا دەروونزانی کۆمەڵایەتیی، گرنگییەکەی بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەکانو لێکۆڵینەوەی رەفتارەکانی کۆمەڵو رەفتاری ئەندامەکانی زیادیکرد، پەرەیشیسەند، هەروەها گرنگی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەکانو پێشەواکانی، شانبەشان دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی، دوبارە پەرەیانسەند.

لە راستیدا لێکۆڵینەوەی کۆمەڵ روکارێکی نوێی لەسەر دەستی( کۆرت لیڤین) وەرگرت، ئەو زانایەی کە لێکۆڵینەوەکانی بە روکارێکی تاقیکارییدا برد، جەختی لەسەر گرنگی کارتێکەرە کۆمەڵایەتیو

دەروونییەکان لە رەفتاری تاکەکانو کۆمەڵەکاندا دەکردەوە. لە راستیدا (لیڤێن Lewin.) کاریگەری هەبووە لە لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵدا، لە کاتێکدا پالی بە ژمارەیەکی زۆر لە توێژەرو زاناکانەوە ناوە، بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە تاقیکارییەکان، لەسەر کۆمەڵەکان، ئەو زانایانەش هەر وەك (دویتش Deutsch) کە هەوڵیداوە کاریگەری هاوکاری پێشبڕکێ تاقیبکاتەوە لە نێوان کۆمەڵەکاندا، هەروەها(باڤیلاس Bavalas) لە تەرزەکانی پەیوەندی لەنێوان ئەندامەکانی کۆمەڵدا کۆڵیوەتەوەو[1] ، هەر یەکە لە (فێستنجە - Festinger- و شاشت-Schachter- وباج-Bach-) لە رادەی کاریگەریی پێکەوەبەستراوی کۆمەڵیان کۆڵیوەتەوە، لە گونجاندنی رەفتاری ئەندامەکانیو پابەندبوونیان بە بەها کۆمەڵایەتییەکانەوە، کۆڵیوەتەوە.

بەڵام گرنگیدان بە کۆمەڵە بچووکەکان[2] لە ساڵی١٩٠٩دا لەسەر دەستی(کولی Cooly)[3] دەستیپێکرد پاشان بە کەمی گرنگیپێدرا، هەتا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، دەتوانرێت پەرەسەندنی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵە بچووکەکان بۆ چوار قۆناغ دابەشبکرێت ئەمانەش:-

---

(١)Theodore, Mills, The Sociology of small groips, New Delhi 1969P.u-5

(٢)Yvonn.Castellan,IntiatioraLaPsychologie Sociale, Amman Colin1972, P.150-151.

(٣) چالس کۆلی: لەنێوان ساڵانی (١٨٦٤-١٩٢٦)دا ژیاوە، زانا و فەیلەسوفو کۆمەڵزانێکی ئەمریکی بووە، ژمارەیەك کتێبی داناوە. - و-

**قۆناخی یەکەم:-** دەکەوێتە نێوان ساڵی ١٩٢٠-١٩٣٠ لێرەدا لێکۆڵینەوەکانو باسەکان لەبارەی کۆمەڵە بچووکەکانەوە چالاك بوو، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە دیاریکردنی رەفتاری تاکدا.

**قۆناخی دووەم:-** دەکەوێتە نێوان ساڵی١٩٣٠-١٩٤٠ لێرەدا وەسفی کۆمەڵە بچووکەکان کراوە، کە کاریگەرییەکی گەورەو گرنگییەکی بەرچاوی لە دیاریکردنی رەفتاری تاکدا، هەبو هەروەها(داشمیل) هەوڵیداوە، کە کاریگەریی رووداوەکان لەسەر ئاستی تاکیو کۆمەڵیدا ساڵی١٩٣٢ بزانێت.

**قۆناخی سێیەم:-** لە ساڵی(١٩٤٠)دا دەستیپێکرد، لەم قۆناخەدا، لێکۆڵینەوەکان بە دەروونزانیی شێوەیی کاریانتێکراوە، کۆمەڵی بە بنەمایەك لە دیاریکردنی رەفتاری ئەندامەکانیدا داناوە هەروەها تاقیکردنەوەکانی(کۆرت لیڤێن)و (رونالد لیبین)و (رالفوایت) چالاکییەکی زۆریان بووە بۆ زانینی رادەی کاریگەریی پێشەوایەتیی لەسەر رەفتاری ئەندامەکانی.

**قۆناخی کۆتایی:-** گرنگیدەدرا بەو لێکۆڵینەوانەی کە ئاماژە بە کاریگەریی سۆز لە کۆمەڵدا دەکەن، لەڕاستیدا ئەم قۆناخە، بۆ ئەو لێکۆڵینەوانە دەگەڕێنەوە کە (التون مایو) لە ساڵی١٩٢٣دا لە کارگەیەکی چنیندا ئەنجامیدا لە (ڤیلادیڤیا)، لە دوای ئەو(مورینۆ) ساڵی١٩٣٠ لە خانەی پێگەیشتووان لە نزیك (نیویۆرك) لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامدا، کە پاڵیپێوەنا بۆ دانانی رێگەیەك بۆ پێوانەی کۆمەڵایەتیی.

لە راستیدا (لیڤێن) لە ساڵی١٩٤٧ دا سیمنیارێکی بۆ باسە دەروونیو زمانەوانییەکان بۆ کۆمەڵێك کە پێکهاتبوون لە ١٥ کەس بەڕێوەبردو

تێیدا ڕووندەبێتەوە، کە گفتوگۆی دۆسێی کۆمەڵەکان زیاتر سەرنجڕادەکێشێت لە گفتوگۆی دۆسێی تاکەکاندا، لە دوای مردنی ئەو لە ساڵی ١٩٤٧ دا رۆناڵد لیبیت و ئەوانی دیکە سیمنیارێکی دیکەیان بەڕێوەبرد بە هەمان شێوەو بە هەمان رێگە، پاشان گرنگیدان بە کۆمەڵو لێکۆڵینەوەی پەیوەستە سۆزدارەکان لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵدا زیادیکرد.

هەروەها( ماکس باجێە Max Pages) جەختی لەسەر شەڕەنگیزی نەستیو کاریگەرییەکەی لە ژیانی کۆمەڵدا دەکردەوە، لە ساڵی ١٩٦٠دا (کارل روجر)[1] لە پەستانە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەکاندا کۆڵیوەتەوە. لە راستیدا بەکارهێنانی زاراوەی دینامیکی کۆمەڵ، چەند شێوەیەکی جیاوازی هەیە، بۆ نموونە/ هێندێك وا بەکاریانهێناوە کە بریتیە لە چەند ئایدۆلۆجییەکی سیاسیی، لە لایەکەوە لە هۆکارەکانی رێکخستنی کۆمەڵو پێشەوایەتیو هەرەوەزیکردنی لە نێوانیاندا دەکۆڵێتەوە، لە لایەکی دیکەوە لەنێوان ئەوانو تەنها پێشەوایەتییدا دەکۆڵێتەوە.

هێندێکی دیکە بەکاریدەهێنن بە واتای ئەو شێوازانەی کە کۆمەڵ لە کارلەیەککردن، لە نێوان ئەندامەکانیداو لە ڕاهێناندا لەسەر پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانو لە بەڕێوەبردنی کۆنگرەکانو لیژنەکان پشتیپێدەبەستێت، لە کۆتاییدا هێندێکی دیکە بەوە لێکیدەدەنەوە کە مەیدانێکە بۆ لێکۆڵینەوەی سروشتی کۆمەڵو یاساکانو گەشەکردنیانو پەیوەستییان بە تاکەکانو کۆمەڵەکانی دیکەوەو بە کۆمەڵگەشەوە.

---

(١) کارل روجرز Rogers, Carl – ١٩٠٢ - زانایەکی ئەمریکییە بە لێکۆڵینەوە عیادییەکانو (کلینیکییەکان) تیۆرەکانی لە کەستێیدا ناسراوە. - و-

(بۆند) دینامیکی کۆمەڵ بەوە دەناسێنێ کە لقێکە لە دەروونزانیی کۆمەڵایەتیی، هەوڵدەدات بۆ دروستکردنی کۆمەڵو گۆڕینی بونیادو ئەرکەکانی، هەروەها دەڵێت: کۆمەڵی جووڵاو لە کردارێکی بەردەوامدایە لە دووبارەکردنەوەی بونیادو ڕێککەوتن لە نێوان ئەندامەکانیدا، بۆ ئاسانکردنی پەشێوییو چارەسەری گیروگرفتە هاوبەشەکان. لەڕووی جێبەجێکردنەوە، زانستی دینامیکی کۆمەڵ تەنها گرنگینادات بە بنەماو یاساکانی رەفتاری کۆمەڵیی، بەڵکو هەوڵدەدات بۆ هەڵهێنجانی کارتێکردنی لە بیرەکانی کۆمەڵو لە کردارە کۆمەڵییەکاندا.

لە کاتێکدا (کارترایتو زاندر) وادەبنین کە زانستی دینامیکی کۆمەڵ لقێکە لە لقەکانی زانیاریو بریتییە لە زانستێکی کۆمەڵایەتی، کە پەیوەستە بە رەفتاری مرۆڤایەتیو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانەوە، زەحمەتە مەیدانێکی بۆ دیاریبکرێت، یان بگەڕێنرێتەوە بۆ زانستێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراو، هەردووکیان وا دەبینن کە هەوڵدان بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنێکی پاراو لە سروشتی کۆمەڵ وامانلێدەکات کە پەیوەندیداری نەکەین، بە بیروباوەڕێکی دیاریکراوەوە، یان خۆمان پەیوەستنەکەین بە شێوازێکی دیاریکراوەوە، لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکاندا. هۆی گەشەکردنی دینامیکیی کۆمەڵ، دەگەڕێتەوە بۆ گرنگیپێدانی بیریارەکانو فەیلەسوفەکان بە زانینی سروشتەکەییو کارکەرە کاریگەرەکان تێیداو بۆ سروشتی پەیوەندی ئەندامەکان، لەلایەکەوەو بۆ پەیوەندی بە کۆمەڵەکانی دیکەوە لەلایەکی دیکەوە، بێجگە لەوەش ژمارەیەکی زۆر لە نوسەران لە ماوەی سەدەی شانزەهەمدا، هەتا کۆتایی سەدەی حەڤدەهەم لە ئەورووپا دەرکەوتن گرنگی زۆریان بە مرۆڤو شوێنەکەی لە کۆمەڵگەدا دەدا.

لــە ڕاســتیدا نوســینەوەکانی تویــژەرەوەکان، لــەو ماوەیــەدا، بــەوە دەناسرێنەوە، کـە چارەسـەری تیـۆرێکی سـەرتاگر دەکـەن، کـە لەسـەر بنەمای شارەزایی کەسێتیو تۆمارگە مێژوویییەکان دامەزراوە، ئەمەش وەکو لێکۆڵینـەوەکانی (کـۆلیو دورکـایمو فرۆیـدو لۆبـۆنو ماکدوکالو ڕۆسۆو کاردۆ و تـوێنن)، لەگـەڵ ئەوەشدا کاتێك کە شۆڕشو، پەستان لەسـەر پێـڕەوی تێڕامـانی نـاوخۆیی بەهێزبوو، لـە سـەرەتاکانی بەشـی دووەمــی ئــەم ســەدەیەدا (ســەدەی بیســتەم) ، ئــەو لێکۆلینەوانــەش دەرکـەوتن کـە گرنگییـان بـەو کۆمەڵانـەدەدا، کـە زیـاتر پشـتیان بـە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانو تێبینییە ووردەکانو پێوانەکانی چەندێتی دەبەست، ئەوەی کە دینامیکیزانی کۆمەڵ پێیگەیشت، هەر لە سەرەتای دەرکــەوتنی، لــە دوای جــەنگی جیهــانی دووەمــەوە پێویســتی بــۆ بەکارهێنانی ڕێگەی باسی تاقیکاری هـەبووە، سـەرەڕای ئـەوەی هـەر لـە سەرەتای دەرکەوتنی ئەم زانستەوە توێژەرەوان لەم بوارەدا گرنگییان بە بونیادی تیۆرییەکانو دەرهێنانی گریمانەکان تێیداداوە.

## پەیوەنـدیی زانسـتی دینـامیکی کۆمـەڵ بـە زانسـتە مرۆڤایەتییـەکانی دیکەوە:-

لە ڕاستیدا زانستە کۆمەڵایەتییەکان گرنگییـان بە لێکۆڵینـەوەی کۆمـەڵو جوڵانــەوەکانی داوە، هــەروەك چــۆن کۆمەڵناســیی گرنگیــی بــە لێکۆڵینــەوەی خێزانــو کۆمەڵــەکانی کــارو چــەتەگەرییەکانو یەکــە سەربازییەکان داوەو ڕەرەفتارەکانیانی بە دیاردەیەکی کۆمـەڵی دانـاوە نەك تاکیی.

دەروونزانیــی گرنگیــدەدات بــە لێکۆڵینــەوەی کۆمەڵــەکانو ڕەفتـاری کۆمـەڵیی، کاریگـەری کۆمـەڵ لەسـەر ڕوکـارو ڕەفتـاری ئەندامـەکانی،

هەروەها کاردانەوەی تاکەکانیش لە رەفتارەکانیکۆمەڵدا، هەروەکوچۆن مرۆڤناسەکان بەشدارییان کردووە لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵە بەراییەکانو تەرزی رەفتارەکانیان. هەروەکوچۆن رامیاریزانیی، گرنگیی بە لێکۆڵینەوەی دامەزراوە رامیارییەکانو کۆمەڵەکانی پەستانو کاریگەریی ئەندامێتی کۆمەڵەکان لە سەرکەوتن، لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا داوە.

ئابوریزانەکان گرنگییانداوە بە لێکۆڵینەوەی سەندیکاکانی کارکردنو کاریگەرییەکانیان لە رامیاریی کارداو چۆنێتی دەرکردنی بڕیارەکانی کاروبارە ئابوورییەکاندا. لەبەرئەوە دینامیکیی کۆمەڵیش بە مەیدانێکی گرنگ دادەنرێت دەربارەی زانستە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان، سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی ئەم زانستانە بەشداری لە پەرەسەندنی دینامیکییەکانی کۆمەڵدا دەکەن، دوو زانستی لە هەر هەموویان زیاتر ئەم کارە ئەنجامدەدەن، ئەو دووانەش هەردوو زانستی کۆمەڵناسیو دەروونزانیی دەگرێتەوە.

## پەیوەندیی لە نێوان دینامیکیزانیو کۆمەڵناسیدا :-

لە راستیدا پەرەسەندنی کۆمەڵناسیی بووە هۆی پەرەسەندنی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵو دینامیکیزانی کۆمەڵ بەلاّم گرنگترین ئەو قۆناخانەی کە کۆمەڵناسیی پێیاندا تێدەپەڕێت لەڕووی گرنگیدانی بە کۆمەڵەوە بریتین لەمانەی خوارەوە:-

١-<u>نموونەی شێوە میکانیکیی</u>: کۆمەڵناسیی کۆمەڵ، دەچوێنێت بە ئامێرێکی کارلەیەککەرەوە، کۆمەڵ کاتێک کە فرمانەکانو ئەرکەکانی ئەنجامدەدات، لە جێبەجێکردنی پێویستی ئەندامەکانو باردۆخی کارلەیەککەرەکانیاندا، لەبەرئەوە رەفتاری کۆمەڵ بریتییە لە دەربڕینی

ئەو ڕۆڵەی کە پێویستە ئەنجامیبدات، هەروەك ڕۆڵی ئەندامێتی دیاریدەکات.

٢-نموونەی ئەندامیی:- کۆمەڵناسی کۆمەڵ دەچوێنێت بە بونەوەرێکی ئەندامی بایۆلۆجی، گەشە دەکاتو پێدەگات بۆئەوەی بگات بە قۆناغی گەیین، ئەمەش بە کۆمەڵێك لە تاکەکان دەستپێدەکات، کە پێویستی دیاریکراوو وزەی دیاریکراویان هەیە. پاشان لە کۆمەڵدا تەرزەکانی ڕەفتارە دیاریکراوەکانو بەها کۆمەڵایەتییە تایبەتییەکانو بیروباوەڕەکان گەشەدەکەن، پاشان لەلای هەر ئەندامێك لەناو چوارچێوەی کۆمەڵەکەدا، ئەرکێکی تایبەتی دەردەکەوێت وەکو (گشتێك) بە شێوەیەکی میکانیکی ڕێکخراو. زیاتر بە شێوەیەکی ئاڵۆسکاوو تێکئالاّوو تەواوکار دەردەکەوێت، کۆمەڵەکان ئەو کۆمەڵانەی بنەمایەکی لەیەکچوویان هەیە، لە ڕووی کەسێتیو شارستانیو پێویستییەکانو بەهاکانەوە، بە مێژوویەکی هاوبەشەوە پەیوەستدەبن.

کۆمەڵ هەمیشە لە ژینگە سروشتییەکەیدا لێیدەکۆڵرێتەوە، بۆ نموونە لێکۆڵینەوەی خێزان لە ماڵدا ئەنجامدەدریت، لێکۆڵینەوەی خوێندکار لە پۆل یان خوێندنگەدا ئەنجامدەدرێت، واتا لێکۆڵینەوەی کۆمەڵە راستەقینەکە لەباری ئەنجامدانی ڕۆڵە راستەقینەکەیدا. بەراستی ئەنجامدەدرێت تەرزە شارستانییەکان دەیسەپێنن بەسەر تاکدا، کە کەسێتییەکەی بە شێوەیەك قاڵبکات، کە بگونجێت لەگەڵ ئەو تەرزە شارستانییەدا.

٣-نموونەی ململانێ:- ململانێکان کاتێك دەردەکەوون کە توانای کۆمەڵ لەسەر دابیکردنی پێویستییەکانو تێرکردنی ئارەزووەکانی ئەندامەکانی کەمدەبێتەوە، هێندێك لە تاکەکان زیاتر بەهێزنو شوێنیان

بەرزترە لەوانی دیکە، یان کۆمەڵەکە بە شێوەیەکی نادادپەروەرانە ئەندامەکانی خەڵاتدەکات.

لە راستیدا ئەم وێنەیە لە نێوان برایاندا دەردەکەوێت، لە کاتێکدا یەکێك لەمانە دەبینێت کە بەرامبەرەکەی پێشبڕکێی لەگەڵدەکات، ئەو کارە پاڵپێوەدەنێت بۆ رووخاندنی ئەو، یان بۆ تەسلیمبوون بەشێوەیەکی راستەقینە بۆ ئەو، ئەمەیش بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی هاوبەش لەنێوانیاندا.

٤-نموونەی هاوسەنگ: کۆمەڵ بە یەکەیەکی هاوسەنگ دادەنرێت کە هاوکاریی یەکتری دەکەن، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە هاوبەشەکان، بە بێ روانین بۆ زیادبوونی ژمارەی تاکەکانی، وەکو لەدایکبوونی منداڵ لە خێزاندا، یان مردنی یەکێك لە ئەندامانی.

٥-نموونەی بونیادی- فرمانی:- رێکخستنی کردارەکانو رۆڵەکانو بیرو بۆچوونەکانو بنەماکان: کۆمەڵ دەتوانێت کە تواناکانو هەوڵەکانی بخاتە گەڕ لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانیدا ئەگەر ئەم ئامانجانەش پەرەیانسەند یان گۆڕانو پەیوەستبوون بە یەکەوە، بۆ دروستبوونی ویژدانی کۆمەڵیی، لەگەڵ ئەوانی دیکەدا تاك هەست بە یەکگرتوویی دەکات، هەرچەندە ئەگەر ئەم هەستەش نەگاتە ئاستی تێکەڵاوبوونیان.

دینامیکی کۆمەڵ لە پەیوەندی نێوان شارستانیو کۆمەڵ دەکۆڵێتەوە، بۆ نموونە: دەپرسێت: (ئایا گۆڕانی بیری تاکیی، لە چوارچێوەی بونیادی کۆمەڵایەتیدا رودەدات؟ بێگومان دینامیکییەت گرنگیی بە کارلەیەککردنو ناوەڕۆکی شارستانیو پاڵنەرە دەروونییەکانو پێوانەکانو بەها کۆمەڵایەتییەکانو بیروباوەڕەکان دەدات.

**ڕێگاکانی لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵە بچووکەکاندا بریتییە لە:-**

١/پێوانەی کۆمەڵایەتی.

٢/پێوانە پاڵنەرەکان (وێنە پاڵنەرەکان) ئەمەش بۆ جووڵاندنی هەستە شاراوەکان.

٣/پۆلێنکردنو ئاستی تاکەکان: واتا: ئاڕاستەکردنی پرسیار بۆ تاکەکانو پۆلێنکردنی تاکەکان بەگوێرەی ئامارەو دیاریکراوەکان بۆ نموونە:- کێ باوەڕی بە زۆرترین پشتبەستنی کۆمەڵو زۆرترین بەشداریکردنی هەیە، لە چارەسەری گرفتەکانی کۆمەڵدا، یان گرفتی ئەندامەکانیدا؟

٤/چاوپێکەوتنە تاکییەکان:- پێشکەشکردنی پرسیاری کراوە بۆ ئەندامەکانی، بە شێوەیەکی تاکیی بۆ نموونە باسی ئەوەمان بۆ بکە کە بزانین ئەمڕۆ چی تیا روویداوە؟ لە کۆبوونەوەی ئەمڕۆدا، چی سەرنجیڕاکێشایت؟

٥/چاوپێکەوتنەکانی کۆمەڵ:-ئەمەش بۆ تێگەیشتنی رۆڵی کرداری کۆمەڵیی، لە دوتوێی پێشکەشکردنی پرسیاردا، هەروەکو چۆن کردار لەگەڵ تاکەکاندا دەکرێت لە کاتی چاوپێکەوتنیاندا.

**پەیوەندیی نێوان دینامیکییەکانی کۆمەڵو دەروونزانیی:-**

دەروونزانیی هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمیش تەنها گرنگیی بە رەفتاری تاکەکانو جیاوازی نێوانیان (الفروق الفردیة) دەدا، بەڵام گرنگیدان بە رەفتاری کۆمەڵیی، لە راستیدا ئامانجی تێگەیشتنی سەرەکی کۆمەڵ بوو بۆ مرۆڤ (خودی خۆی).

یەکەم: تیۆری فرۆیدو ئەو رەخنانەی کە ئاڕاستەیکراون:-

١-ئارەزوومەندیو دیاریکردنی: سەرەڕای ئەوەی کە (فرۆید) لە شیکارە دەروونییەکانیدا جەخت لەسەر خودێتی دەکاتەوە، بەلاّم ئێمە هێڵە بنچینەییەکانی تیۆری پەیوەندیی نێوان تاکەکانی تێدا بەدیدەکەین، ئەمەش بەگوێرەی دوو ئاڕاستە پەیوەستن بەیەکەوە، ئەم دوو ئاڕاستەیەش بریتین لە:- ئارەزوومەندیو دەستنیشانکردن، ئارەزوومەندی بە مانا فراوانەکەی تەنها لە رووخسارە هەستییەکەیدا بەکاردێت، بەلاّم پەیوەندیی دەستنیشانکردنی (التشخیص)، سروشتێکی دوژمنکاریی وەردەگرێت، ناتوانرێت بگۆڕدرێت بۆ سۆزی خۆشەویستی یان رێزگرتن، تەنها دوای چارەسەرکردنی( ئۆدیبەگریّ) نەبێت بۆئەوەی جێگەی باوك بگرێتەوە.

ئەو پەیوەندییە سۆزدارییانەی کە دروستدەبن لەناو چوارچێوەی خێزاندا، لە میزاجێکی ئاڵۆزکاودا هەڵدەقوڵێت، بەلاّم لە دەرەوەی چوارچێوەی خێزاندا، سۆزەکان لە مەیلدارییەکی هەستیدا، بۆ کەسێکی دیاریکراو هەڵقولاّون، کە وێنەیەکی هێماییو نموونەی، بۆ ئەو مەیلە هەستییە دروستکردووە، هەروەها ئارەزووە خەفەکراوەکان پەیوەستن بە هەستەکانەوە، بۆ نموونە هاوڕیّ هەوڵدەدات کە لە نزیك هاوڕێکەیەوە بمێنێتەوە. (فروید) ئاماژەدەدات بۆ بوونی جۆرێك لەدەستنیشانکردن، کە بەراووردەکرێت، بەو لێکچواندنە، یان ئەو نواندنەی کە هەستکردن دروستیدەکات، بە هاوکارییو هاوڕێیەتی. هاوڕێیەتی بریتییە لەئەنجامی بەرامبەربوون، یان لێکچوون. لەبەرئەوە پەیوەندیی نێوان ئەندامانی کۆمەڵو هەستی کۆمەڵییان هۆیەکەی لێکچوونو پەیوەستییە، بە پێشەوایەکی هاوبەشەوە، کە نموونەو هێمایە بۆ نموونەی بالاّ لە کۆمەڵدا.

**٢-گیانی دژایەتیو دوژمنکاریی:-** (فرۆید) ئاماژەدەدات بۆ بوونی پێکەری (مردن) بەرامبەر ئەو پێکەرە ژیانەی کە دەبێتە هۆی دوژمنایەتیو قینو وێرانکاریی، کە ئاراستەدەکرێت رووەو کەسانی دیکە (سادیزم) یان رووەو خۆ (ماسۆشیزم)، سەرەڕای ئەوەی کە ئەم پێکەرانە، رێکخراونو گونجاون بەگوێرەی بارودۆخە سروشتییەکان. لەڕاستیدا تاك هەست بە چەندین سۆزی دژایەتی بەرامبەر کەسێکی دیکە دەکات کە دەبێتە هۆی هاوڕێیەتیو دوژمنایەتیی، هۆی ئەم دژایەتییەش دەگەڕێتەوە بۆ قۆناخەکانی یەکەم لە ژیانی منداڵیدا، چونکە ئەگەر گواستنەوەکە لەبارەی رەزامەندییەوە بێت، بۆ نائومێدی، جاری وا هەیە دەبێتە هۆی دژە کردارو دوژمنایەتیی.

**٣-رەخنەگرتنەکان لە تیۆری فرۆید:-** بەڕاستی تیۆرەکەی فرۆید رووبەڕوی چەند رەخنە بۆتەوە، بە تایبەتی دەربارەی ئەوەی کە دەڵێت: سۆزو روی خۆشدان بە خەڵکی (الملاطفة) بەگوێرەی ئارەزوو چونیەکبوون (التطابق) لاوەکینو لە پلەی دووەمدا دێن، هەروەها دەڵێت: سۆزە دوژمنکارییە هێرشبەرەکان لەمان دەرکەوتوون. هەروەها (لاگاش) هەستا بەهێنانەوەی بەڵگە لەسەر هەوڵی پاشگەزبونەوەی دەروونزانە شیتەڵییەکان لە هەڵوێستی خودییەوە کە (فرۆید) بەکاریهێناوە بۆ گرنگیدان بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە بابەتییەکان، ئەمەش بۆ نموونە هۆرنیو سولیڤان.

**دووەم: تیۆری کەمکردنەوەی پێویستییەکان لە نێوان تاکەکاندا:**

(شۆتن) پێشنیازی تیۆرێکی نوێی لە دەروونزانیی شیتەڵیدا کردووە، کاتێك دەڵێت کە (٣) سێ پێویستی بنچینەیی لەلای تاك هەن

پەیوەندییەکانی بە ئەندامانی دیکەی کۆمەڵەوە دیاریدەکەن، ئەمانەش بریتین لە تێوەچوون، چاودێری، خۆشەویستی، بۆ نموونە:- منداڵ لە قۆناغەکانی یەکەمی ژیانیدا دەگاتە ئەوەی کە دەبێت کەسانی دیکە لێی رازیبن، چونکە دەترسێت لە پشتگوێخستن، یان لەبیرچوونەوە، لە راستیدا ئەم قۆناغە جاری وا هەیە درێژدەبێتەوە بۆ قۆناغی گەنجی، کە دەبێتە هۆی پارێزگاریکردنی بە ئاستێکی تەواو، لە بەرژەوەندی ئاڵۆگۆڕ، لەنێوان کەسەکەو ژینگەکەیدا.

بەڵام پێویستی (چاودێری) پەیوەستە بە ئەرکەکانی دەستەڵاتەوە، ئەگەر ئەم کارە پەیوەندی هەبێت بە ئارەزووی تاکەکەوە لە دەستەڵاتگرتنە دەستو زاڵبوون بەسەر خەڵکی دیکەدا، یان ملکەچبوون بۆ دەستەڵاتی کەسانی دیکەوە، بۆئەوەی بگات بە هەموو ئەو لێپرسراوییە گەورانە، لە پارێزگاریکردن لە خۆی دڵی ئارامبێت، ئەم پێویستییە درێژدەبێتەوە بەرەو قۆناغەکانی خوێندنو لەسەر کاردامەزراندن، بەدەستهێنانی ئەم ئامانجەش، پەیوەندیی هەیە بە هەستکردن بە لێپرسینەوەو رێزگرتنی (بەرامبەر) لەنێوان رۆڵەکانی دیکەدا، بەڵام لەسەر ئاستی کۆمەڵەکان ئەوا پێویستییەکە بە تەواوەتی جێبەجێدەبێت، بەگوێرەی سستەمە رێکخراوەکان.

بەڵام پێویستی بۆ (خۆشەویستی) ئەمەش لە تەمەنی پێنج ساڵیدا دەردەکەوێت، ئامانجیشی بەستنی پەیوەندییە سۆزدارییەکانە، بە خەڵکییەوە، (خۆشەویستی) پەیوەستە بە پەیوەندییە دوو قۆڵییەکانەوە بە جۆرێك کە جێبەجێکردنی پێویستی بەوە هەیە کە (بەرامبەر)ە کەش هەمان وەڵامی هەبێت بۆئەوەی بە (مقابل) کردەوەی لەگەڵ بکرێت.

## تێوەچوون لەنێو کۆمەڵو کۆمەڵگەدا

وا دیارە باری تێوەچوون لە کۆمەڵگەدا بریتییە لە جۆرێك لە تاقیکردنەوەی بنچینەیی بۆ مرۆڤ. Heiderger (هدجر) وا دەبینێت کە مەرجی سەرەکیی لە مرۆڤدا بریتییە لە (بوونی لەگەڵ کەسانی دیکەدا) چونکە مرۆڤ پەیوەستە بە گیانی کۆمەڵایەتییەوە، لە ئاستی کۆمەڵایەتییدا تاقیکردنەوەی (بوونی مرۆڤ لەگەڵ کەسانی دیکەدا) یەکسانە بە چەمکی جەماوەر، هەر وەك هێندێك لە دانەران بەکاریدەهێنن، بە تایبەتی (فاین) و (کورفتیش)، یەکەمیان وا دەبینێ کە جەماوەر وێنەی یەکەیەکی کۆمەڵایەتی کاتیی دەنوێنێ، کۆمەڵ بە شێوەیەکی لەیەکچوو بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی هاوبەش هەڵسوکەوتدەکات، بەڵام ئەگەر باردۆخەکانو ئامانجەکانی گۆڕان، ئەوا کۆمەڵ لەناودەچێتو قەوارەکەیشی نامێنێت.

بەڵام بەلای (کورفتیش) ەوە ئەوا جەماوەر وێنەی شێوەیەکی بنچینەیی لە کۆبونەوە دەنوێنێت، لە کۆمەڵێکی راستەقینە بەردەوام نانوێنێت بە واتەیەکی دیکە جەماوەر وێنەی جۆرێك لە بوونی هاوبەش دەنوێنێت بۆ کۆمەڵێك لە تاکەکان، کە پەیوەندیدارن بە پەیوەندییەکی کۆمەڵییەوە.

(کورفتیش) جیاوازیدەکات لە نێوان جەماوەرو Iamase، ئاپۆرەدا Iafouie کە دووەمیان کەمتر بەردەوامیی هەیە.

تێوەچوون لە جەماوەردا لاوازدەبێت لە کاتێکدا کە پەستانی کۆمەڵیی بەهێزو لەخۆبێت واتا: بەدەستی ئەنقست نەبێت. تاکەکانیش راستی هەبوونیان لەنێو جەماوەرەکەدا، لەدوتوێی قەوارەی جەماوەرەکەو ژمارەی تاکەکانی پەیدادەکەن (دەرك)، واتا: تاکەکان، وەکو تاك هەست بەبوونی خۆیان ناکەن. هەموو جەماوەرێك ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی

دەگرێتە خۆی، بەڵام پێویستە کە جیاوازیبکەین لە نێوان جەماوەرە پەرتو دابڕاوەکانداو لەنێوان جەماوەرە یەککگرتووەکاندا.
(جۆری یەکەم): هەمیشە زیاتر بڵاوە، بۆ نموونە (جەماوەرە، دەست بەتاڵەکان لەکار)، ئەندامەکانی بەشداری لە بارودۆخو بەرژەوەندییەکاندا دەکەن، بەڵام (جۆری دووەم): دەتوانین ناوبنێین بە گشت، ئەندامەکانی جارناجارێك لە کاتە دیاریکراوەکاندا کۆدەبنەوە، کۆبوونەوەکەیان دەبێتە هۆی دەرکەوتنی جۆرێکی نوێ لە تێکەڵاوبوونی کۆمەڵیی، سەرەڕای ئەوەی کە ئەمە خۆی لەخۆیدا کۆمەڵە.

# دەروازەی چوارەم

## بەشی دووەم

- کەسێتیو هاوبیریو تێوەچوون لە کۆمەڵدا.
- جۆرەکانی کەسێتی.
- کەسێتی وەکو رۆڵی کۆمەڵایەتی.
- کەسێتی وەکو نموونە.
- کەسێتی وەکو روپۆش.

## کەسێتیو هاوبیریو تێوەچوون لە کۆمەڵدا:-

کۆمەڵو پەیوەندییەکان لە نێوان تاکەکاندا:

تێبینیمانکرد کە هێندێك هۆکارە هەن، دەبنە هۆی نەگەیشتنی تاك بە هەستکردنی سەربەخۆییو کەسێتی لە کۆمەڵدا، ئەمەش بۆ نموونە وەکو:- ئەو کارکەرە شارستانیو کۆمەڵایەتییانەی کە دەبنە هۆی دەرکەوتنی کەسێتیی تاك، بەگوێرەی چوارچێوەیەکی دیاریکراو.

هێندێك لە توێژەران وەکو (ماوسی) M.Mauss وا دەبینێت کە چەمکی کەسێتیی بە پەرەسەندنی کۆمەڵگە پەرەدەسێنێت لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم پەرەسەندنە جیاوازە، لە کۆمەڵگەی سەرەتاییەوە، بۆ کۆمەڵگەی پێشکەوتوو، ئەمەش بەگوێرەی رێکیی شارستانی لە کۆمەڵگەدا. لەکاتێکدا (ستوتیزل) Stoetzel دەبینێت کە هەستکردنی بە قەوارەو کەسێتییەکەی بەگوێرەی پەرەسەندنی شارستانیی دیاریناکرێت، هەروەك ناتوانرێت دیاریبکرێت، بە پشتبەستن بە بەهای کۆمەڵایەتیی دیاریکراو. بە شێوەیەکی گشتی هەستکردنی تاك بە قەوارەو کەسێتییەکەی لە ماوەی پەرەسەندنی بیرییو گیانیدا لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا دیاریدەکرێت، بۆ نموونە:- تاك لە قۆناغی گەییندا یان گەیشتن بە تەمەنی کامڵی، چەند نموونەیەکی پەیوەندی نوێی پڕ مەعنا دروستدەکات.

جاری وا هەیە پەیوەندی دۆستایەتی بە رێکەوت دروستدەکات، کەچی کاریگەرییەکی تایبەتیی لە دەروونیدا جێدەهێڵێت، بۆ نموونە: هاوڕێی یەکەم پلەیەکی تایبەتی هەیە چونکە پەیوەندییەکی ناخی لەگەڵیدا گرێداوە، ئەگەرچی ناگات بە ئاستی تێوەچوون، واتە یەکێتیی بیری بەکارکەرە کۆمەڵایەتیو دەروونییەکان بە تەنها دیاریناکرێت، بەڵکو واتایەکی گیانیو بیریی هەیە، لە دوتوێی نەریتە ناسراوەکاندا

دیاریدەکرێت ئەم پەیوەستبونە، دەبێتە هۆی جێگربونی هەستی کۆمەڵیی.
جاری وا هەیە هەستی کۆمەڵیی هەستێکی رووکەشییە، هەر وەك لە باری جەماوەریدا رێدەکەوێت، کەچی ناوەرۆکیشە لە کۆمەڵدا، دەتوانین بکۆڵینەوەو پێوانەی ئەم یەکێتییە بیرییو تێکەڵاوبوونە کۆمەڵییە بکەین، لە کۆمەڵە بچوکەکاندا کە پێکهاتبێتن بە نموونە لە (١٠) کەس.

## جۆرەکانی کەسێتییو واتاکەی:

کەسێتی چۆن گەشەدەکات؟ چۆن کەسێتی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا دادەڕێژرێت؟ یان لە نموونەیەکی دیاریکراو لە کەسێتیدا؟ چۆن دەتوانرێت کە درێژە بە پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ بدرێت؟ چۆن دەتوانرێت ئەم پەیوەندییانە بەرەو دارمان ببرێت؟.
١-کەسێتیی وەکو رۆڵی کۆمەڵایەتیی: تاك لە کۆمەڵو کۆمەڵگەدا رووبەڕووی کاردانەوەی بەها کۆمەڵایەتییەکان دەبێتەوەو ڕێزی هێندێك لە یاسا کۆمەڵایەتییە ئاشکراکان یان ناڕاستەوخۆکان دەگرێت. لەبەرئەوە، پێویستە لەسەر تاك کە لە لای کەسانی دیکە بە کەسێتییەك دەربکەوێت کە گونجاو بێت لەگەڵ رۆڵە کۆمەڵایەتییەکەیدا، لەبەرئەوە تاك وەکو ئەو کەسانە رەفتار دەکات کە پەسندن لای کۆمەڵگە، کەسێتیی بریتییە لەوەی کە تاك دەیەوێت پێی دەربکەوێتو تاك خۆی لە خۆیدا ئەوە دەبینێت کە کەسانی دیکە دەیبینن، واتا لە چاوی خەڵکیدا خۆی دەبینێت.
بەراستی چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکان کاردەکەنە سەر رەفتارو کەسێتیی مرۆڤ، هەتا لە کاتەکانی بۆشاییدا (کاتی دەستبەتاڵی) تاك لە بەرگی خەڵکیدا ڕۆڵی خۆی دەبینێت.

٢-کەسێتیی وەکو نموونە:- کەسێتیی دیاریناکرێت تەنها لە دوتوێی پەستانەکاندا، دوور لە دوتوێی ئەو ڕۆڵە دیاریکراوانەی کە کەسەکە دەیانبینێت، چونکە تەنها وێنەی ئەوە دەردەخات کە پێویستە تاك پێیدەربکەوێت بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی، بەڵکو ئەوەی دەوێت کەخۆی لە کۆمەڵگەوە پێکیدەهێنێت، کەسێتیی دیاریناکرێت بە شێوەیەکی ڕەسمی، بەڵکو تاکەکە تەرزی کەسێتییەکەی خۆی دیاریدەکات.

ئەدلەری دەروونزان، ڕاڤەکردنێکی پیشەیی گشتیی، بۆ نموونەی باڵای تایبەتی بە خۆمەکی(الأنا) پێشکەشدەکات. ئەوەی کە پاڵ بە تاکەوە دەنێت بۆ پابەندبوون بە تەرزێکی دیاریکراوەوە لە ژیان، کە شایەنی ئەوەیە نموونەی باڵای بۆ بەدەستبهێنێت، بەمەش تاك لاسایی ئەو تەرزە کەسێتییە دەکاتەوە کە باوەڕی وایە بواری پێدەدرێت بۆ بەهێزکردنی گەیشتنی بە قۆناغی بەهێزیی، ئەمەش دوای ئەوەی هەست بەکەمی خۆی دەردەخات. ئەم ئارەزووە بەگەیشتن بە دەستەڵاتو بەهێز، لەلای هەمووان بە پلەی جیاواز هەیە، (تعبیر) لە ئاستەکانی هەوڵدان دەکات، بێجگە لەمەش پێویستە کە جیاوازیبکەین لە نێوان تاکی ئاساییو تاکی دەمارگیردا (العصابي) کە یەکەمیان هەوڵدەدات بۆ سەرکەوتن بە گونجاندن لەنێوان داواکارییەکانیدا، بەگوێرەی توانای مادیو ژیریی خۆی، بەڵام کەسی دەمارگیر لەبەرئەوەی لە خەیاڵیدا دەژیو دەچێتە بەرگی خەیاڵەوە هەوڵدەدات لە بارودۆخە دەرەکییەکاندا نەك لە واقعدا بژی، لەبەرئەوە داواکارییە نمونەییەکانی بە گوێرەی توانای مادیو ژیریی خۆی نییە، لەبەرئەوە ناگات بە سەرکەوتن بەخەیاڵ نەبێت.

٣-کەسێتیی وەکو ڕووپۆش:-دەتوانرێت کەسێتیی جۆرێك لە چارەسەری مامناوەندی بۆ کەسەکە پێکبهێنێت، ئەمەش بۆ ئەوەی چارەسەری گرفتێکی بە ڕواڵەت پێبکەیت، تەرزی ڕواڵەتی ڕەفتار، یان کەسێتیی، ئەو ڕەفتارەیە کە پێویستە لەسەر تاك لەسەری بێت، یان ئەوەی کە تاك دەیەوێت لەسەری بڕوات، لەبەرئەوە تاکەکە پاڵپێوەدەنرێت بۆ یەکێك لەم دوو هەڵوێستەی خوارەوە:-

١/ ڕاستییەکانی لە کەسانی دیکە، بە هەستو هۆشێکی تەواوەتییەوە بشارێتەوە، ئەمەش بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتێکی دیاریکراو، یان بۆ ئەوەی بە ڕواڵەت خەڵك بخەڵەتێنێت، کە کەسێتییەکی پاکو بە ویژدانە!

٢/ یان ڕاستیی لەخودی خۆی دەشارێتەوە، ئەو ڕاستییەی دەترسێت بە سەریدا ڕووبدات، ئەمەش بە پابەندبوون بە هەڵوێستێکی جێگیر یان خەیاڵییەوە (خۆگونجاندن).

زور جار تێبینی هەڵوێستە بیرییو ڕەفتارییە فرەکان، لەلای هێندێك لە تاکەکان دەکرێت وەکو: بەرژەوەندیی یان ڕێزگرتن، یان شەرمکردن، یان ماتەمینی، یان ئارەزوشکاندن، ئەمەش نەك بە ڕاستی بەڵکو بە درۆ بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی تایبەتیی، یان پابەندبوون بە پێوانەو بیروباوەڕە ڕەسمییە ئاشکراکانەوە، بە ڕاستی زۆر قورسە کە جیاوازیبکەین لەنێوان ڕەفتارەکانی بێباریو ڕەفتارەکانی خۆگونجاندندا.

٤-کەسێتیی وەکو پەنایەك: تاك پەنادەبات یان پابەندەبێت بە تەرزێك لە ڕەفتارو کەسێتیی تایبەتی، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ڕای گشتیی، کەسێتیی ریاباز، یان دووڕوو، بۆ نموونە دەگات بە خاڵێك

دڵەڕاوکێ کۆمەڵایەتییەکە دەخاتە جێگەی دڵەڕاوکێ ناوخۆیییەکە، بە بەهای کەسێتییەکەی. لەبەرئەوە هەوڵدەدات بۆ بەدەستهێنانی هاوسەنگیی بە رەفتارو کەسێتییەکەی، ئەمەش بۆ رزگاربوونە لەو دڵەڕاوکێیەی کە توشیبووە لە ئەنجامی بێدەستەڵاتیو سەرنەکەوتنیدا، بەمە هەوڵدەدات بۆ لەبریکردنەوەی. بۆ نموونە: تاك پیشەکەی دەکاتە پەنایەك بۆ خۆقوتارکردن لەسەر حسابی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی، یان خێزانییەکانی، واتای وایە ئەم پیشەیە بە کارێکی دینامیکی دانانرێت بەڵکو تەنها پەنایەکە ئاسایش بۆ کابرا دابیندەکات بە رادەیەك دەگاتە پلەی ئارەزوکاریی.

# دەروازەی چوارەم

## بەشی سێیەم

- لایەنە کۆمەڵایەتییە شارستانییەکان.
- شارستانیو کۆمەڵ.
- پێناسەکانی کۆمەڵ.
- پاڵنەرەکانی خۆپاڵدان بەکۆمەڵەوە.
- بونیادی کۆمەڵ.

# لایەنە کۆمەڵایەتییە شارستانییەکانی تێوەچوون لە کۆمەڵگەدا.

**شارستانیەتو کۆمەڵگە:-**

**دوای ئەوەی کە گەیشتین بە تێڕوانینێکی خێرا لەبارەی تێوەچوونی کۆمەڵایەتییەوە کە بە شێوەیەکی ئاسایی روودەدات، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بڕوانرێت بۆ کارکەرە سەرەکییەکانی پێشوو کاریگەرییەکانیان لەم تێوەچوونەدا، ئەمانەش بریتین لە یاساو پێوانە کۆمەڵایەتییەکانو نموونەکانو وەتیرە شارستانییانەی کە کۆمەڵگە پێشکەشیاندەکات، ئەوەی کە کۆمەڵگە دەریدەخاتو لەکاتی پێویستیشدا دەیسەپێنیت بەسەر ئەندامەکانیدا، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەوە کاریگەریی کۆمەڵەکانو بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان ئەوانیش کاردانەوەیان هەیە، چونکە هەر تاکێك لەلای خۆیەوە هەستدەکات بەهۆی ئەوانەوە کاریتێدەکرێت.**

**لەم بوارەدا دەبێت کە جیاوازیبکەین لە نێوان چەمکی هەردوو وشەی کۆمەڵگەو شارستانییەتدا. کۆمەڵگە بریتییە، لە قەوارەیەکی رێکخراو لە تاکەکان کە دوای تەرزێکی دیاریکراو لە گوزەراندا کەوتوون، یان بریتییە لە قەوارەیەکی دانراو لە تاکەکان کە بە رێگەیەك دەناسرێنەوە ناودەنرێ شارستانیەت. شارستانیەت، بریتییە لە تەرزێکی ژیان لای کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو، واتا: شارستانیەت گوزارشت لە رەفتاردەکات، نەك لە دەستگا کۆمەڵایەتییەکان، چونکە دەستگاکان شێوازێکی شارستانی وەرناگرن، گەرچی ئەو دامەزراوانە یاساکان یان دابەکان، پێشکەشبکەن مادام نەلکێن بە هەڵوێستەکانو تەرزەکانی**

ڕەفتارەوە، مادام واتا دارنەبن بەگویرەی ئەو تاکانەی ملکەچی ئەو یاسایانەن.

سیستمی کۆمەڵایەتی کارکەرێکی دەرەکیی یان ڕێکەوت نییە، لەبەرئەوە بەردەوام نابێت، تەنها بە بەردەوامبوونو پەسەندکردنی ئەو کۆمەڵگەیە نەبێ کە دەرکی دەکاتو هەستیپێدەکات. هەروەکو چۆن دامەزراوەکانی گرتنەوەی کۆمەڵایەتیی، دامەزراوە پەستانداره سەپێنراوەکان دەنوێنن کە چاودێری تاکەکان دەکەنو سزایشیان دەدەن، بەڵکو ئەوانیش پلە بە پلە فێریان دەبنو وەریاندەگرن، لەبەرئەوەی وێنەی سیستەمو یاسا کۆمەڵایەتییەکان دەنوێنن.

لەلایەکی دیکەوە دەبینین زۆر لەم شێوەو شارستانییانە لە زۆر لایەنەوە لەیەکدەچن، چونکە تاقیکردنەوە هاوبەشەکان، دەبێتە هۆی لەیەکچونی زۆر لە ڕەفتاری تاکەکان.

لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا، جۆرێك لە ڕێکخستنی خێزانی، جۆرێك دابەشکردنی کارو پلەی کۆمەڵایەتیی بوونی هەیە.

**یاساو شێوەکانی ڕەفتار:-**

لە هەموو کۆمەڵێکدا هێڵێکی ڕەفتاری هەیە کە لە چوارچێوەیەکی فراواندا تاکەکان شوێنیدەکەون، بەجۆرێك کە ئاگادارنەبوونی یان پابەندنەبوون پێیەوە دەبێتە هۆی سەپاندنی سزایەکی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، کە کۆمەڵگە پێیڕازییە.

تەرزی ڕەفتاری:- واتا: دووبارەکردنەوەی ڕەفتارە. بەڵام یاساکان بە واتای گۆڕینە بۆ رویەکی ڕێکو شێوەی پابەندبوونەکەی، بە گوێرەی ئەو تاكو ئەو کومەڵانەی کە بەشداریدەکەن لە یەك شارستانیەتدا. ئەم سیستمە کۆمەڵایەتیو شارستانییانە ئەرکە دەروونییە بنچینەییەکان

دیاریدەکەن، بۆ نمونە وەکو: پەیکردنی هەستیو بیرهێنەرەوە، دیاردە سۆزدارییەکانو تێوەچوون لە کۆمەڵو کۆمەڵگەداو گونجاندنی کۆمەڵایەتی.. واتا: لێرەدا پەیوەندییەکی دینامیکی لەنێوان شارستانیەتو کەسێتیدا هەیە.

## رۆڵو پلە کۆمەڵایەتییەکان:-

(لینتۆن) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە هاوبەشیکردنی تاك لە شارستانیەتدا چونیەك نییە لە کۆمەڵگەدا، هەر وەکو چۆن لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت، ئەمەش لەبەر جیاوازی پلە کۆمەڵایەتییەکەی بە جیاوازی تەمەنو جیاوازی ئەو کۆمەڵانەی کە پالێپێوەداون، واتا: پلەی تاك یان گوزەرانە کۆمەڵایەتییەکەی بەگوێرەی تەمەنو رەگەزو پیشەو چین... هتد لە زۆرینەی بونیادی کۆمەڵایەتیدا دەگۆڕێت.

ئەم پلەوپایە، یان ئەم باری گوزەرانە لە دوتوێی ئەو رۆڵەی یان ئەو فرمانەی کە تاك پیادەیدەکات، کاردەکاتە سەر رەفتارەکانیو بە ئاشکرا دەردەکەویت، لێرەدا کۆمەڵێك نموونەی شارستانی هەن کە گرێدراون بە بارێکی دیاریکراوەوە کە تەرزە رەفتارییەکان دیاریدەکەن.

رۆڵ بریتییە: لە دیمەنیکی دینامیکی بۆ پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی، زۆربەی جار کۆمەڵە کەسێك دەبنین یەك رۆڵ پیادەدەکەن. ئەم لەیەکچوونە، پەیوەستی کۆمەڵایەتییو دۆستایەتی لەنێواندا دروستدەکات، سەرەرای ئەوەی لەسەر پلە بەرزەکان بەربەرەکانیدەکەن.

لە راستیدا لەلای تاکە کەسێك بە تایبەتی لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا ژمارەیەك پلەی کۆمەڵایەتیی هەن، یان هەڵدەستێت بە ژمارەیەك رۆڵ کە هێندێ جار دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ململانێی ناوخۆیی مەترسیدار، بەهۆی ململانێی ئەرکەکانەوە، ئەمەش بۆ نموونە وەکو ئەو

دووبەرەکییانەی کە لەنێوان رۆڵە پرسیارکەرەکانو ڕۆڵە پیشەییەکاندا روودەدات.

لە راستیدا ژیانی رۆژانە پێویستیدەکات لەسەرمان بە گواستنەوە لەنێوان بارودۆخو رۆڵەکاندا، هەتا ئەگەر لەیەك دامەزراوەشدا کاربکەین، بۆ نموونە جاری وا هەیە سەرۆکی خێزان رۆڵی بەڵێندەری ئابووریو مێردو باوكو پەروەردیاریش دەبینێت.

**پێناسەکانی کۆمەڵ:-**

کۆمەڵ لە روویەکەوە واتای پەیوەندییە جیاوازەکان لەنێوان تاکەکاندا دەگەیەنێت، لەلایەکی دیکەوە واتای رێکخراوەکان، لە ئاستە جیاوازەکانی رووی ئاڵۆزییەوە دەگەیەنێت، لێرەدا سێ جۆر لەو پەیوەندییانە هەن کە بەڵگەن لەسەر وشەی کۆمەڵ:-

١-پەیوەندییەکان لەنێوان ئەو تاکانەی کە پێیدەوترێ کۆبوونەتەوە لە شوێنێکی دیاریکراودا، واتا کۆبوونەوەی خەڵکەکانە کە پەیوەستن بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بابەتی دینامیکی کۆمەڵ گرنگی نییە بەلای ئەم جۆرە کۆمەڵانەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی کە تاکەکان هێندێکیان لە هێندێکی دیکەیان بە سەربەخۆییەکی تەواوەتی دەناسرێنەوە، واتا ئەمانە کۆمەڵێکن کە پەیوەستنین بە پەیوەندییە ئەرکییەکانو کاریگەرییە ئاڵوگۆڕەکان (کارلەیەککردن) لەگەڵ ئەوەشدا کە لێك نزیکبوونەوەو دوورکەوتنەوە هەیە لە نێوان تاکەکانی ئەم جۆرە لە کۆمەڵگە، کارناکاتە سەر یەکەکانی دیکە.

٢-جاری وا هەیە کۆمەڵ ناسراوە بەوەی کە ژمارەیەکە لەو یەکانەی هاوبەشن لە سیفاتە دیاریکراوەکانداو گونجاون لەهێندێك لایەنەوە. ئەو کۆمەڵەی کە ئەم چەمکەی بەسەردا جێبەجێدەبێت، بریتییە لە ژمارەیەك لەو تاکانەی کە خۆیان هەست بە ئەوە دەکەن کە ئەمانە هاوبەشن لە

تایبەتمەندییە دیاریکراوەکاندا، وەکو دەسکەوت، یان جلوبەرگ، یان باری مەدەنیی..هتد. بەڵام ئەم کۆمەڵانە مەرجی کار لەیەککردنیان تیادا نامێنێت، چونکە: پەیوەندییە تایبەتییەکان، یان پەیوەندیی رووت یان هەتا نزیکبوونەوەی نێوانیان پێویستناکات، جاری وا هەیە جیاوازیکردن لە نێوان ئەم کۆمەڵانەدا، لە شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی، یان سەرژمێریدا، سوودی لێوەردەگیرێت، لەگەڵ ئەوەشدا جاری وا هەیە ئەم جۆرە کۆمەڵانە کارلەیەککردنیان بۆ دابیننناکرێت لە ئاستی کۆمەڵایەتیدا.

٣-جیاکردنەوەی کۆمەڵ بەپێی پێناسەی سێیەم، بە بوونی کارلەیەککردن لە نێوان ئەندامەکانیدا دەناسرێتەوە، هەر وەك دەردەکەوێت کە پەیوەندیی نێوان هەردوو ئەندامێك، کاریتێدەکرێت بە پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی دیکە، بەمەش واتای وایە کۆمەڵە تاکێك کۆمەڵەکەیان لێپێکدێت، ئەگەر کارلەیەککردن لە نێوان تاکەکاندا رووبدات ئەمە کۆمەڵ لە رێکخراو جیادەکاتەوە. سەرەڕای ئەمەش ئەوە بە تەنها بەس نییە بۆ پێناسەی کۆمەڵ، لەبەرئەوە چەند پێناسەیەکی دیکە هاتنەکایەوە کە جەخت لەسەر لایەنە دیاریکراوە جیاوازەکان دەکەنەوە لە کۆمەڵدا، بە ئەندازەیەکی زۆر یان کەم لەم پێناسانەش:-

١/ پێناسەی کێرت لیڤین:( k.Lewin) لیڤین جەخت لەسەر کارلەیەککردن لەنێوان تاکەکاندا دەکاتەوە، بە رای ئەو لەیەکچون لەنێوان تاکەکاندا بنچینەیەکی باشە، ئەگەر هاتو ئەم لێکچوونە، کۆمەڵایەتی بێت یان لە ئامانج یان لە خۆپاڵدانداندا یان لە بوونی دوژمنێکی هاوبەشدا بێت. ئەم لێکچوونە پەیوەستە بە کارلەیەککردنی ئاڵوگۆڕەوە، لەنێوان ئەندامەکاندا ئەمەش هۆیەکە بۆ کۆمەڵبوونەکە.

٢/ کرتش و کرتش فیلد(Kretch and Crutch Fiedld):کۆمەڵ دەناسێنن بەوەی کە دووکەس یان زیاترە، پەیوەستن بە پەیوەندییەکی دەروونیی ئاشکراوە، بە جۆرێك ئەم پەیوەندییە کاریگەریی هەیە لە رەفتارو تایبەتمەندییەکانیاندا.

٣/ بەلام جیلین و جیلهین (Gillin&Gilhin): بە رای هەردووکیان ئەگەر وەلامدانەوە کۆمەڵییەکان بنچینەییبن ئەوا پێچەوانەدەبێتەوە لە یەکبونی کۆمەڵدا، واتا: کۆدەبنەوە لەنێوان کارلەیەککردنو هاوبەشیکردن لە ئەنجامەکاندا.

٤/ (کاتل)[١] گرنگیی بە ئامانجەکانی کۆمەڵ زیاتر دەدات، لەوەی کە گرنگیی بدات بە کارلەیەککردنی ناوەکی لەنێوان ئەندامەکاندا، کۆمەڵ دەناسێنێت بەوەی کە کۆمەڵێکە لە تاکەکانو ئەرکەکەی تێرکردنی هێندێ لە پێویستیی ئەندامەکانە، ئەم پێناسەیە فراوانەو کۆمەڵە بەراییەکانو ناوەنجییەکانیش دەگرێتەوە.

٥/ (جیب) ئەم چەمکە بە شێوەیەکی وردتر دیاریدەکاتو کۆمەڵیی پیشەیی، بەوە دەناسێنێت کە ئاماژەدەکات بۆ دوو تاك، یان زیاتر بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێکی هاوبەش کارلەیەکدەکەن، بە شێوەیەك بونی هەردووکیان هێندێك لە پێویستییەکانی ئەندامەکانی تێردەکەن، جیب

(١) رایموند، کاتل- Raymond,Cattell [1950]: ئەمریکیەکی بە رەگەز ئینگلیزە، لە ئیگلستان دکتورای وەرگرت، دوای ئەوە کۆچیکرد بۆ ئەمریکا، ئەم پەرتوکانەی بلاوکردەوە:-

١. رابەر لەپێوانەژیرییەکاندا ١٩٣٦. ٢. دەروونزانی گشتی ١٩٤١.

٢. باسەکانی کەسێتی پیوەکان ١٩٤٦. ٤. کەسێتی لیکوڵینەوەیەکی سەرزارییە ١٩٥٢. - و -

بەلایەوە وایە، کە ئەم پێناسیە کۆکی نێو ژمارەیەك لە پێناسەکانی پێشووەوە، لەبەرئەوە کۆمەڵ بە جۆری پەیوەندیی لە نێوان تاکەکاندا جیادەکاتەوە، لە ئەنجامی ئەندامبونی هەر یەك لەمانە لە کۆمەڵدا دەگۆڕێت، هەروەك کۆمەڵ چۆن بە یەکبوونی ئامانجەکانی، بۆ بەدەستهێنانی تێرکردنی پێویستییەکان، جیادەکاتەوە.

٦/ پێناسەی (نیوکمب Newcomd): کە دەڵێت: کۆمەڵ بریتییە لە دوو کەس یان زیاتر کە بەشداریدەکەن لەو پێوانانەی کە پەیوەندییان هەیە بە چەند بابەتێکی دیاریکراوەوە، ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکانیان تێکهەڵکێشە بە تێکهەڵکێشانێکی پتەوو بەهێز، جاری وا هەیە کۆبوونەوەیەك دەبێتە کۆمەڵە لەئەنجامی کارلەیەککردندا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، ئەوکاتە هەر یەکە ڕۆڵی خۆی دەبینێت، جاری وا هەیە کۆمەڵ وەلامدانەوەیەکە بۆ داواکاریی هەڵوێستێکی خێراو بەبێ کارلەیەککردن دەمێنێتەوە، هەروەك روویداوە لە دروستبوونی لیژنەیەکدا کە کۆدەبێتەوە بۆ رووبەڕووبونەوەی گرفتە سادەکان.

واتا:- ( نیوکمب) وا دەبینێت کە کۆمەڵ کاتێك پێکدێت کە ئەندامەکانی هێندێکیان لەگەڵ هێندێکی دیکەیاندا لە پێوانە دیاریکراوەکاندا بەشداریبکەن هەر یەکێکیان دەتوانێت کە پێشبینی رەفتاری کەسەکەی دیکە بکات بە شێوەیەکی ئاشکراو بە ئەندازەیەکی دیاریکراو.

دوای خستنەڕووی ئەم پێناسانە مانای دینامیکیی ئاساندەبێت. هەروەها (لیفین) وای دەبینێت کە کۆمەڵ بەوە دەناسرێتەوە کە (دینامیکی)یە، ئەمەش واتای وایە کە ڕوودانی گۆڕان لەسەر هەر بەشێك لە کۆمەڵ دەبێتە هۆی رودانی گۆڕان لە سەر هەر بەشێکی دیکەدا، ئەگەر ویستمان لێکۆڵینەوە لەسەر دینامییەکانی خێزان

بکەین، ئەوا دەتوانین کە گیروگرفتەکانی گۆڕانی بونیادو رەفتاری لە بارودۆخە جیاوازەکاندا بخەینەڕوو، بۆ نموونە هەڕەشەی دەرەکی، یان گۆڕان لە پەیوەندییەکانی دەستەڵاتدا لە ئەنجامی لەناوچوونی ئەندامێك لە خێزانەکەدا، یان خۆڕێکخستنی ئەندامێکی نوێ، ئەویش بە هاوسەرێتییکردنەوە، هەروەها دەتوانین لە چۆنیەتی وەرگرتنی بڕیارە کۆمەڵییەکان لەلایەن خێزانەوە بکۆڵینەوە، هاریکاریکردنیو بەشداریکردنی، وەکو کۆمەڵێك، لە کاتبەسەربردنداو لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانی لە رێگەی پێوانەکردنی رووالەتە رەقو نەرمەکانەوە لە پەیوەندییە کۆمەڵییەکانو ناوەندەکانیی دەستەڵاتەوەو لە رێگەی پەیوەستکردن لە نێوان هەموو ئەم دیاردانەدا بکۆڵینەوە.

توێژەر لە دینامیکی کۆمەڵدا تەنها بە وەسفی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵ، یان وێنەی رەفتاری کۆمەڵیی وازنایەنێت، بەڵکو گرنگیدەدات بە زانینی چۆنیەتیی پەیوەستبونی ئەو دیاردانەی کە هێندێکیان لەگەڵ هێندێکی دیکەیاندا تێبینیدەکرێن. هەروەها دەپرسێت: ئەو دیاردە نوێیانە کامانەن، لە ئەنجامی بارودۆخی نوێدا رودەدەن؟ واتا: ئامانجی هەوڵدانە بۆ پشکنینی ئەو بنەما گشتییانەی کە دیاریدەکرێن، واتا: بارودۆخ ئامانجەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەرییەکەی.

ئەم باسە پێویستی بە ئاڕاستەکردنی ژمارەیەکی زۆر، لە پرسیار دەبێت، لە بارەی دیاردەکانەوە، بۆ نموونە لە ژێر کام کاریگەریدا کۆمەڵ ئارەزوو لە گۆڕینی پێشەواکەیدا دەکات؟ ئەو بارودۆخە کۆمەڵییانە کامانەن کە هاوبیریی لە نێوان ئەندامەکاندا بەدەستدەهێنن؟ ئەو باردۆخانە کامانەن کە تەگەرەن لە رێگەی داهێناندا؟ واتا ئەو لایەنانە کامانەن کە لە کۆمەڵدا دەگۆڕێنو ئەو لایەنانەی کە ناگۆڕێن؟

وەڵامەکانی ئەم پرسیارانە روونیدەکەنەوە کە چۆن تایبەتمەندییەکانو کرداره کۆمەڵییەکان هێندێکیان پشت بە هێندێکی دیکەیان دەبەستن. ئەمانەیە کە تیۆرەکانی کۆمەڵ هەوڵدەدن کە راڤەیان بکەن، لەم روانگەیەوە دەگەین بە بابەتە دیاریکراوەکان، بۆ نموونە گۆڕانو بەرهەڵستیکردنی گۆڕانو پەستانە کۆمەڵایەتییەکانو کاریگەریو سەرنجڕاکێشانی کۆمەڵ...هتد.

لەم زاراوانەدا هێزی کۆمەڵایەتیو شارستانیو دەروونیی هەیە کە کاردەکەنە سەر لایەنەکانی دینامیکییەتی کۆمەڵەکان دەیانوروژێنێت، هەروەها ئەمە رۆڵێکی گرنگدەگێڕێت لە تیۆرەکانی دینامیکییەتی کۆمەڵدا.

**پاڵنەرەکانی خۆپاڵدان بە کۆمەڵەوە:-**

هەست بەئاسایشکردنو خۆشەویستیو قسەلەڕویی، دەرکەوتنی کارامەییەکانو پایە کۆمەڵایەتییەکانو رێزگرتنی کەسانی دیکەو چەسپاندنی خود.

**پێوانەکانی کۆمەڵ:-**

کۆمەڵ ناتوانێت بەردەوام بێت گەربێتو وێنەی کارلەیەککردن لەنێوان ئەندامەکانیدا دیارینەکرا، ئەم پێوانانە چوارچێوەیەکی پێشینەیی بنەڕەتی لە پەیوەندیی ئەندامەکاندا دروستدەکات، بەجۆرێك لقیکی شارستانیەت بۆ کۆمەڵو چوارچێوەیەکی پێشینەیی بنەڕەتی بۆ رەفتارەکانیان دروستدەکات.

پایەی کەسەکە لەکۆمەڵدا دەوەستێتە سەر مەودای پابەندبونی بە پێوانەکانەوە.

**بونیادی کۆمەڵ:**

هیچ کۆمەڵێك دروستنابێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، بەبێ ئەوەی کە ئەندامەکانی خۆیان ڕێکبخەن لە ئەرکە پلەدارەکاندا، هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵ هەڵدەستێ بە ڕۆڵێی لێپرسراویو ئەرکە دیاریکراوەکانی خۆی، بۆ نموونە پێشەوای کۆمەڵەکە ڕێکخەری کاروبارەکانی کۆمەڵە، هەر وەك دۆخی هەموو تاکێك لە ڕێگەی ڕادەی بەشداریکردنەکەی لە بەدەستهێنانی ئامانجی کۆمەڵەکە دیاریدەکرێت، ئەندامەکان توانایان جیاوازە لە هەستان بە ڕۆڵە کۆمەڵێیەکان لە چارەسەرکردنی گرفتە هاوبەشەکان لە پێشەوایی کردنیکارادا.

سەرەڕای ئەوەی کە کۆمەڵە دیموکراتییەکان، پێشەوایەتیکردن تێیاندا لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگوێزرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزوویەکی زۆر بەهێز هەیە لای ئەندامەکانی کۆمەڵ بۆ پشتگیریکردنی ئەو کەسانەی کە توانای زیاتریان هەیە لە هەڵگرتنی بەرپرسی ئەم ئەرکەدا، ئەوانەی کە زیاتر ڕێگە خۆشدەکەنو ڕەفتارەکان قەرزدار دەکەنو جوڵەی کۆمەڵەکە خێراترو ئاسانتردەکەن بەرەو ئامانج.

پلەداریی لە ئەرکە کۆمەڵێیەکاندا، پەیوەندی کارلەیەککردن لە نێوان ئەندامەکاندا ڕێکدەخاتو دەبێتە هۆی فەلسەفەی کۆمەڵ، سەرەڕای ئەوەی کە دەبێتە سەرچاوەی پەشێوی لە نێوان ئەندامەکانداو سەرچاوەیەکە بۆ ناتەواوی هاوسەنگیی کۆمەڵ، بۆ نموونە: ئەو ئەندامانەی کە پلەیەکی بەرزیان هەیە هەست بە دەستەڵاتێکی زۆرتر لە سەربەخۆییو لە ئاڕاستەکردنی ڕەخنە بۆ کەسانی دیکە دەکەن، کەسە خاوەن پلە نزمەکان، کاریگەرییان کەمترە لەسەر کەسە پلە بەرزەکانو ڕەفتارێکی بەرگریکەر دەنوێنن، ئامانجەکەی بریتییە لە کەمکردنەوەی ئەو پەشێوییەی کە بووەتە هۆی ئەم هەڕەشانە.

## پەیوەندیی کۆمەڵ بە کۆمەڵە دەرەکییەکانەوە:

دینامیکییەتی کۆمەڵ هەروەکو چۆن گرنگی بە لایەنی پەیوەندییەکان لە ناوخۆی کۆمەڵدا دەدات هەروەها گرنگییش بە لێکۆڵینەوەی بەربەرەکانیو هاریکاریو ململانێ لەنێوان کۆمەڵەکاندا دەکات بۆ نموونە: گرنگییدەدات بە دەمارگیریی رەگەزپەرستیو ئاینیی، یان مەزهەبییو پەشێوی نێودەوڵەتی، لەبەرئەوەی کۆمەڵ لە گۆشەگیریدا کارناکات، پەیوەندییەکانی رۆژانەش لە نێوان کۆمەڵەکاندا بەیەکداچوون، بە جۆرێك رووداني هەر رووداوێك لە کۆمەڵێکدا بێگومان کاریگەریی هەیە لەسەر ئەوانی دیکە لە وێنەی ململانێدا، یان لە وێنەی کۆکییدا.

## رۆڵی گۆڕاوە کەسێتییەکان:

کەسێتی ئەندامەکان کاریگەریی هەیە لە کاری کۆمەڵیدا، گەرچی پێشبینیکردن، لەبارەی رەفتاری ئەندامەکاندا، تەنها بە زانینی کەسێتییەکانیان قورسە.

# دەروازەی پێنجەم

## بەشی یەکەم

- پۆلێنکردنی کۆمەڵەکان
- جۆرەکانی کۆمەڵ
- پەیوەستی کۆمەڵ
- پەیڕەوەکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵ
- سۆسیۆمیتری(پێوانەی کۆمەڵ)
- شیکردنەوەی زانیارییەکانی هەڵبژاردنی سۆسیۆمیتری
- دروستکردنی کۆمەڵ
- کارلەیەککردنی کۆمەڵ

## پۆلێنکردنی کۆمەڵەکان

لە ڕاستیدا هەوڵێکی زۆردراوە بۆ پۆلێنکردنی کۆمەڵەکان، پۆلێنکردنی کۆمەڵ دەوەستێتە سەر ئەو تەوەرەی کە لێکۆڵەر پشتیپێدەبەستێت، جاری وا هەیە لێکۆڵەر شوێن دەکاتە تەوەری، ئەو کاتە کۆمەڵەکان پۆلێندەکات بۆ کۆمەڵی هاوسێیەکانو کۆمەڵی ناوخۆییو نیشتمانییو نەتەوەییەکان یان تێوەچونی تاکەکان خۆیان لەنێو کۆمەڵەکەدا دەکاتە تەوەر، ئەو کاتە کۆمەڵەکان پۆلێندەکرێن بۆ کۆمەڵە سەرەتاییەکانو ناوەندییەکان، یان پۆلێندەکرێت لەسەر بنەمای تەمەنو ڕەگەزو نیشتەجێبوون وەکو کۆمەڵە کاتیو هەمیشەییەکان یان پۆلێندەکرێن بۆ کۆمەڵە ڕەسمیو ناڕەسمییەکان یان کۆمەڵە زۆرە ملێکانو سەربەستەکان. لێرەدا پۆلێنکردنی دیکە هەیە کە پشت بە بنچینەی سروشتی کۆمەڵەکە دەبەستێت وەکو کۆمەڵە لێکدابڕاوو بەیەکدا چووەکانن، کۆمەڵە لێکدابڕاوەکان بریتییە لەوەی کە ڕێگە بەئەندامەکانی نادات کە پاڵبدەن بە کۆمەڵەکانی دیکەوە لەهەمان جۆر وەکو نەتەوەو خوێندنگە. بەڵام کۆمەڵی بەیەکداچوو بریتییە لەوەی کە ڕێگە بە ئەندامەکانی دەدات پاڵبدەن بە کۆمەڵەکانی دیکەوە لەهەمان جۆر، یان پۆلێندەکرێت بۆ کۆمەڵە گونجاوەکانو نەگونجاوەکان یان کۆمەڵە داخراوەکانو کراوەکان یان کتوپڕەکانو هەمیشەییەکانو سروشتییەکانو دروستکراوەکان.

لە ڕاستیدا جاری وا هەیە کۆمەڵ پۆلێندەکرێت لەسەر بنەمای پەیوەندی کۆمەڵ بە کۆمەڵەکانی دیکەوە، هەروەها کۆمەڵ دابەشدەکرێت بۆ کۆمەڵە ناکۆمەڵایەتییەکانو نیمچە کۆمەڵایەتی یەکان، بۆزیانبەخشو سودبەخشەکان یان پۆلێندەکرێت بۆ کۆمەڵە یەکەمیو دووەمێکان.

هەروەها جاری واهەیە کۆمەڵ پۆلێن دەکرێت لەسەر بنەمای روانین بۆ رەگەزی سەربەستی، یان زۆرە ملێ لە ئەندامێتیدا، لێرەدا کۆمەڵە سەربەستەکان و ناسەربەستەکان هەن، کۆمەڵە سەربەستەکان ئەوانەن کە کەسێك هەڵدەبژێرن بۆ نواندنی ژمارەیەك لەکەسەکان وەکو ئەنجومەنو دەستگاکان یان پۆلێندەکرێت بۆ کۆمەڵە رەسمیو نارەسمییەکان رەسمییەکان بریتییە لە ژمارەیەك لە لێپرسراوان، بەڵام نارەسمی بریتییە لە ژمارەیەك لە تاکەکان کەبەهایان(القیم) هەیە زیاتر حەزدەکەن و هاوبەشی لەبوون لەسەرمانەوەی ئەو بەهایانەو گەشەپێدانی بکەن.

هەواداری ئارەزوی زۆرینە بریتییە لە پۆلێن کردنی کۆمەڵەکان بەشێوەی کۆتایی، واتا کۆمەڵە ناوەندییەکان یان رەسمی‌یە بچووك و گەورەکان و کاتی‌یەکان و هەمیشەیی‌یەکان.

لێرەدا دەتوانرێت کە زیاتر لەپێوانە یەك بەکاربهێنرێت.

١-**کۆمەڵگەی گشتی**: بریتییە لە کۆمەڵە خەڵکێك کە پەیوەستن بەنزمترین ئاستی رێکخستنەوە، کەشێوەی نیشتمان یان نەتەوە، وەردەگرێت و کار دەکاتەسەر ئەندامەکانی وەکو شارستانی،یان بیروباوەڕو جل وبەرگ.....هتد.

٢-**کۆمەڵە شاراوەکان**: بریتییە لەو کۆمەڵە کۆبووانەی کە زروف، یان روکار کۆیکردونەتەوەو پەیوەستن بەهەستێکی هاوبەشەوە کە لە کۆمەڵەکانی دیکە جیایاندەکاتەوە وەکو چینە کۆمەڵایەتییەکان بۆ نموونە.

٣-**کۆمەڵە رێکخراوەکان بۆ ماوەیەکی کاتی دیاریکراو**: بە بوونی پەیوەندیی ناوخۆیی لەنێوان ئەندامەکانیداو بە بوونی مەبەستێك یان کۆمەڵە

مەبەستێکی هاوبەش دەناسرێتەوەو بەجۆرێك بە جێگیریی و سەقامگیربوون وەسفدەکرێت.

هەروەها ئەندامەکان پێکەوە پەیوەست دەبن، ئەوانەش بۆ نموونە وەکو: کۆمەڵە پیشەییو ئاینییو رامیارییو رۆشنبیرییەکان (سەندیکاکانو مزگەوتەکانو کەنیسەکانو پارتەسیاسییەکانو خوێندنگاکانو پەیمانگاکان...هتد).

٤-**کۆمەڵە تەسکەکان:** ئەندامەکانی هێندێکیان، هێندێکی دیکەیان دەناسنەوە، سەرەڕای ئەوە تێوەچوونەکانی نێوانیان هەمیشەیی نییە، وەکو ئەندامەکانی یانە بۆ نموونە.

٥-**کۆمەڵە رووبەڕووەکان:** زۆربەی ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵەیەکتر دەبینن، پەیوەستییەکی کرداری هەیە لەنێوانیاندا هێندێك لەمانە رێکخستنێکی هەیە، وەکو کارخانە، شانەی پارتی، هێندێکی دیکەیان تایبەتمەندییەکی راستەوخۆی لاوازی هەیە وەکو هاورێیان یان وەکو کۆمەڵەکانی مندالان.

ئەم جۆرە کۆمەڵە ناوی بەراییەکان یان بنچینەییەکانیان لێدەنرێت، کۆمەڵ بریتییە لە دوو تاك یان زیاتر کە پەیوەندی پێکەوە دەیان بەستێتەوە، کە کاریگەری هەیەو کاردەکاتە سەر تایبەتمەندییو رەفتارەکانیانو ئەو کارلەیەککردنەی لەسەر بنەمای لێکچوونە، لە نێوان تاکەکاندا، ئەوە بنچینەی کۆمەڵەکەیە، کۆمەڵەکان لە رووی جۆری کارلەیەککردنەوە لەنێوان تاکەکانیدا لەروی ئەو پەیوەندییەی لەنێوان تاکەکاندا هەیە جیاوازن، ئیتر پەیوەندییەکی دکتاتۆرییە یان دیموکراتییە، هەروەك گرنگیدانی ئەم کارلەیەککردنە جیاوازە، هێندێ جار نموونەی پەیوەندییە ویژدانییەکان دەنوێنێت، وەکو لە خێزاندا بەدیدەکرێت، جاری وا هەیە ئەم کارلەیەککردنە لە کاتی رووداني

مەترسییەکی دیاریکراودا رودەدات، کە هەڕەشە لە ئەندامەکانی کۆمەڵەکە دەکات. جاری وا هەیە بەرێگەی دروست بوونی راستەوخۆ دەبێت، هەر وەکو لە خێزانو هاوڕێیاندا رودەدات.

جاری واش هەیە کارلەیەککردنەکە مەبەستدارە، وەکو لە کۆمەڵی یانەدا رودەدات، هەروەها جێگیردەبێت وەکو لە خێزاندا، یان کاتی دەبێت وەکو ئەو جەماوەرەی کە لە ئەنجامی هۆکارێکی روداودار دروستدەبێت، وەکو کۆبوونەوەی خەڵك لە رێگەیەك بۆ تەماشاکردنی رووداوێك.

یەککگرتنی کۆمەڵ: ئەمە بریتییە لە هەستی تاکەکان بەخۆپاڵدانیان یان پابەندبوونیان بە کۆمەڵەوە لەبری ئەوەی باسی خودی خۆیان بکەن، باسی کۆمەڵ دەکەن. تێرکردنی دەروونی لەم کۆمەڵانەدا خاڵی بنچینەییە بۆ یەککگرتن، بۆ نموونە تاك پێویستییو پاڵنەری لەشییو دەروونیی هەیە، داوای بوونی ژیانێکی کۆمەڵایەتی ئاسودەگی بۆ دەکەن، بۆئەوەی تێریانبکات، ئەم پێویستییانە جۆری ئەو چالاکی‌یانە ئاڕاستەدەکەن کە تاکەکانی کۆمەڵەکە بەشداریی تێدادەکەن، وەکو پێویستبوون بۆسۆزو خۆشەویستی حەز لە پلەوپایەکردن، ئارەزوی خۆدەرخستنو پێویستیی بوون بە دەستەڵات...هتد.

سەرەڕای ئەوەی کە هێندێك لە پاڵنەرەکانو پێویستییەکان، وەکو حەز بەدەسەڵات، دەبێتە هۆی ململانێو هەڵوەشاندنی کۆمەڵ. سەرەڕای ئەوەی کە تاك کاتێ رووبەڕووی هەڕەشەیەك لەلایەن کۆمەڵەوە دەبێتەوە، بۆ تێرکردنی هێندێك لە پاڵنەرەکانی، هەوڵدەدات رەفتاری خۆی بگۆڕێتو لەنێوان تێرکردنی پێویستی‌یەکانیو پاڵنەرەکانیدا هاوسەنگی ڕابگرێت، بۆ نموونە یەککگرتن بریتییە لە پوختەی ئەو بەرژەوەندییە بەهێزەی کە تاکەکان بۆ کۆمەڵ رادەکێشێو

پاڵیانپێوەدەنێت بۆ مانەوە تێیداو بەرهەڵستیکردنی وازهێنانیان لە ئەندامێتی کۆمەڵەکە، وەکو پێویستی تاك بۆ خۆڕێکخستن بە کۆمەڵەوە، یان چالاکییەك کە کۆمەڵ پێیهەڵدەستێت، یان بەهۆی سەرسوڕمانی کەسەکەوە بە تاکەکانی کۆمەڵ، ڕاکێشانی بەرەو لایان، پەیوەستی کۆمەڵ دەبێتە، هۆی زیادبوونی توانا و یارمەتیدان دەبێتە هۆی ناسینەوەی ئەندامانی کۆمەڵەکە بە ڕەفتاری کۆمەڵی. **نموونەی ئەم جۆرە ڕەفتارە تێیدا بەم جۆرەیە:**

١/ ئەو چالاکییە هاوبەشەی کە بەڵگەیە لەسەر هەستکردن بە بەرپرسی لە ڕووی کۆمەڵدا.

٢/ کاریگەری ئاڵوگۆڕ لەنێوان ئەندامەکاندا کە هێندێکیان ڕای هێندێکی دیکەیان پەسەنددەکەن.

٣/ بەها لە لێکچوونو زیادبوونی گرنگیدانی ئەندامەکان، بە ئامانجەکانی کۆمەڵو پێوانەکانێوە.

٤/ هەستکردن بە ئاسایشو دڵئارامی لەو چالاکییە کۆمەڵایەتییەی کە پەشێوی کەمدەکەنەوە.

**سودوەرگرتن لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵە بچووکەکان:**

ناکۆکی لە نێوان زانایانی دەروونزانییو کۆمەڵایەتیدا لەبارەی ئەم بابەتەوە هەیە. هێندێك لەمانە، بەتایبەتی زانایانی ئەمریکا بە باشی لە کۆمەڵگە بچووکەکانیان کۆڵیوەتەوەو لە ڕێگەیەوە لە سروشتی هەموو کۆمەڵگەیان کۆڵیوەتەوە. ئەمانە وادەبینن کە کۆمەڵە بچوکەکان سەربەخۆنین، بەڵکو دێنە ناوچوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی فراوانترەوە، لەمەوە وێنەی سیستمی کۆمەڵایەتی، بە شێوەیەکی زۆر بچووك دەنوێنن، لەبەرئەوە دەتوانین ئەنجامەکانی بەسەر هەموو کۆمەڵگەدا گشتی بکەین(گشت گیر).

بۆ نمونە شوێنی کارگەی بچوك دەکەوێتە ناو چوارچێوەی کارگە گەورەکەوە، ئەمەش لە سنووری تۆڕی پیشەسازی بازرگانیدا روودەدات. شوێنی پۆلی خوێندن دەکەوێتە نێو قوتابخانەکەوە، کە بریتییە لە سیستمێکی رۆشنبیری بۆ هەموو کۆمەڵگەکە. پێکهاتەو رێکخستنی فرمانەکانی کۆمەڵ پێك دێت لە رەگەزەکانی کۆمەڵایەتی، ئابوریی کۆمەڵایەتیی، شارستانیی هەر هەموو پێکەوە دروستدەبێت، رەگیشیان بەمێژووی کۆمەڵگەکەوە دادەکوترێت.

هەر ئاوەها یەکە کۆمەڵایەتییە تەسکەکان دەکەونە نێوان بیروباوەڕو نێوان نەریتو شارستانییەکانەوە لە کۆمەڵگەی گشتیدا.

بەلاّم بەرهەڵستکارانی ئەم لێکۆڵینەوانە بۆ نموونە وەکو/ فەرەنسییەکان، کە سوکایەتی بە لێکۆڵینەوەی ئەم کۆمەڵە بچووکانە دەکەن، بە بێسوودو هەڵخەڵەتێنەریان لە قەڵەمدەدەن، لەبەرئەوە دەڵێن: کەسێتی ئەندامانی ئەم کۆمەڵە بچوکانە بە شێوەیەکی رونو ئاشکرا دیارن، لەبەرئەوەی جیاوازی شارستانی لە نێوانیاندا هەیە، کەواتا دەبێت ئەوە بزانین کە کۆمەڵگە بریتییە لە کۆمەڵەیەکی تەندراوی فرە پلەدار، یان هاوکارن، بەربەرەکانیکارن.

ئەم کۆمەڵانە بریتین لە ناوەندێکی کۆمەڵایەتیو تاکیش، واتا کێڵگەیەکی دەروونیو کۆمەڵایەتیی تاکەکانن، سەرچاوەی پەیکردنو پاڵنەرو روکارەکانن. کۆمەڵگەو شارستانییەت لەوێدا نەبێت دەرناکەون. بەڕاستی ئەم جیاوازیی شارستانییو گوزەرانو تایبەتمەندییە گشتییانە، بەراورد لەنێوان کۆمەڵەکاندا پوچەڵدەکەنەوە.

تیپێکی سێیەم هەیە لە دەروونزانە کۆمەڵایەتییەکان، دژی هەموو لێکۆڵینەوەیەکی تاقیکاری دەوەستن، لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەی

کۆمەڵە بچووکەکان گرنگەو سودێکی گەورەی هەیە، لەبەرئەوەی تێبینییکردنیان ئاسانە، بەراووردکاریی شارستانیی لەسەریان، بە مەبەستی ناسینیان، یان زانینی جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکانو بۆ زانینی کاردانەوەی کۆمەڵایەتیو شارستانیی، هێندێکیان بۆ هێندێکی دیکەیان هەر ئاسانە، بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵی خێزانییو پیشەیی لە وڵاتە شارستانییە جیاوازەکاندا، وەکو لێکۆڵینەوەی چینە کۆمەڵایەتییەکان دووبارە هەر ئاسانە...هتد.

## پەیڕەوەکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵ

لێرەدا کۆمەڵە پەیڕەوێکی جیاواز هەن، لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵداکە دەتوانرێت بەم شێوەیە دیارییبکرێن:

**١/پەیڕەوی سروشتی:** بریتییە لە ڕێگەیەکی تایبەتی بە زانستە سروشتییەکان، ئامانجی تێبینیکردنی ئەو راستیانەیە کە ناتوانرێت رووبدات لەناو تاقیگەدا، لەسەر ئەو بنەمایەی، کە تێبینیەکە، پشت بە پلانێکی ڕێکخراو بۆ لێکۆڵینەوەکە دەبەستێت.

ئەم ڕێگەیە کاتێك بەکاردێت کە لێکۆڵراوەکان هاریکاری لێکۆڵەر نەکەن لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکاندا.

**٢/پەیڕەوی تاقیکاری:** ئەم ڕێگەیە ئامانجی تێبینی کردنی کۆمەڵە، لەبارودۆخە دیاریکراوەکاندا، کە توێژەر خۆی کۆنترۆلی دەکاتو هەڵسوکەوتی پێوەدەکات، ئەمەش بە هەڵبژاردنی نموونەیەك بۆ ئەنجامدانی را وەرگرتنێك کە گرنگیدەدات بە گرفتێکی گرنگ، پاشان نموونەکە دابەشدەکات بۆ دوو(کۆمەڵە) یەکێکیان کۆمەڵەی تاقیکاریی یان سەربەخۆ کە ملکەچی گۆڕانی تاقیکاریەکە دەبێت. ئەوی دیکەیان

کۆمەڵـەی شـوێنکەوتوی پێـدەڵێن، بـۆ نموونـە/ (پاگنـدە) دەخەینـەگڕ لەسـەر کۆمەڵـەی یەکـەم، ئەگـەر گۆڕانکارییـەکی زیـاتر رووبـدا لـە رایەکانیـدا زیـاتر لـە رایـەکانی کۆمەڵـەی دووەم. ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر کاریگەری پاگندە لەسەر زۆربونی را(دەنگ)دا.[1]

**٣-پـەیڕەوی چارەسـەری:** ئەمەش بە دروستکردنی چەند هەڵوێستێك تێیاندا تاکەکان بواریان دەدرێتێ بۆ دەربڕین لەبارەی خودی خۆیانەوە، بـۆ دۆزینـەوەی گرفتـەکانیانو تێگەیشـتنیانو چارەسـەرکردنیان، فـرە وێنـەی هەیـە، گرنگترینیـان چارەسـەری شانۆگەری( سـایکۆ دراما)یـە کە(مورینۆ Moreno) دایناوە، کە بابەتێکی شانۆیی پێشکەشکردووە ئەنـدامانی کۆمەڵەکـەی تێیـدا بەشـداریانکردووە، وشـارەزاییەکی دەروونی وای بۆ پاڵەوانەکان دروستکردووە بە شێوەیەك کە ناتوانرێت لە بارودۆخی ژیانی ئاسایدا دروستبێت.

لەو کاتەدا شارەزاییەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ پێشکەش دەکرێت، ئەمـەش بـەگوێرەی کەسـێتی هەریـەك لـە پاڵەوانـەکان ئارەزوومەنـدیانو هەستەهەڵچـوونییەکانیان، ئـەوەی کـە گرنگـە ئەوەیـە بابـەتی شـانۆگەرییەکە (گرفتێکـە) هاوبەشـەکان هـەموویان تیایـدا هەسـتی پێدەکـەن، پێویسـتە هاوبەشـەکان شـارەزاییەکانیان بـە شـێوەیەکی راستەوخۆ بخەنەڕوو بـەجۆرێك کـە توێـژەر بتوانێـت هەستێت بـە ڕۆڵـە گرنگەکـەی، بـۆ ئـەوەی بگـات بـە ئاسـتێکی چارەسـەری بـۆ ئەوپـەڕی ئاستی توانراو.

---

[1] ئاسانترین نموونە، بۆ پەیڕەوی تاقیکاری: ئەوەیە دوو ئینجانە لە یەکجۆر گوڵ دەهێنیت، یەکەمیان تیشکی هەتاوی بۆ زۆردەکەیت، بۆئەوەی بزانیت بە تیشکی هەتاو زیاتر گەشەدەکات، یان کەمتر لە گوڵی ئینجانەی دووەم. — و –

**٤-پەیڕەوی پزیشکی دەروونی:** ( فروید)[١] لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری بڵاوکردەوە لەسەر (لیۆناردۆ دافنشی) تێیدا جەختی لەسەر هێزی خەفەکردنی سێکسی کردەوە، کە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی وزەی( لەبیدو) و گۆڕینی بۆ گرنگیدان بە زانین. لەڕاستیدا زۆرێك لە شیکارە دەروونییەکان دوای( فروید) کەوتن وچەمکەکانی شیتەڵی دەروونییان لەژیانی مەسیح و ناپلیۆن و زۆرێك لەچاکەخوازەکانی دیکەدا جێبەجێکرد.

هەروەك (لاسویل) زۆر لە بارەکانی پێشەوایەتیکردن، دەگێڕێتەوە بۆ رغلێبوونەوەی باوك، یان بۆ خەفەکردنی وزەی سێکسی، یان بۆ هەستکردن بە تاوانو هەروەها ئەو شتانەی کە لەوانە دەچن. پاشان جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆیو لەسەر بنەمای ئارەزوومەندی راڤەیکردنو یان باسیکردن لەسەر هێزو لەبری کردنەوەی هەستەلاوازەکان.

(ئەریك فرۆم Fromm)[٢] رەفتاری(هتلەر) و کەسێتییە سەرکوتکەرەکەی لە دانراوەکەیدا(هەڵاتن لە سەربەستی) دەرخستووە، هەروەها دەبینێ کە ئارەزووی سەرکوتکەر بە پاڵنەرە سادیو ماسۆشییەکان لە ئەنجامی رووخانە بەردەوامەکاندا دەردەکەوێت،

---

[١] سیگمۆند فرۆید (١٨٥٦ – ١٩٣٩)، لە مۆراڤیا لەدایکبووە، لە لەندەن، زۆر ژیاوە، پسپۆڕی لە پەشێوییە دەمارگیرییەکاندا پەیداکردووە، خەواندنی موگناتیسی لە شارکۆوە وەرگرتووە، رێگەی (واتا کێشکێ) لە چارسەری نەخۆشییە دەروونییەکاندا بەکارهێناوە، (٢٤) بیستوچوار کتێبی داناوە. – و –

[٢] ئەریك فرۆم: جولەکەیەکی ئەڵمانی بووە، ساڵی ١٩٠٠ لەداکیبووە، ساڵی ١٩٣٣ لە دەستی نازییەکان رایکردووە بۆ ئەمریکا، دژی روکاری غەریزی جەنگاوە، رای وایە مرۆڤ، کۆمەڵگە بە ئاوەدانکردنەوە نەك بە وێرانکردن دروستدەکات. – و –

(فرۆم) ملکەچبوونی ئەڵمانییەکان بۆ ئەم جۆرە پێشەوایەتییە، لەسەر بنەمای ئارەزووکردنیانو داکشانیان بەرەو رووی ئامۆژگارییەکانی مرۆڤێك کە هەستی ئەوان دەردەبڕێتو راڤەدەکات.

ئەمەش بووەتە هۆی گەشەکردنی سیستمی قوچکەیی لە دەوڵەتی نازیدا، تاکەکە دەبینێت سەرۆکێك هەیە لەسەروویەوە، کە ملکەچیدەبێتو لە ژێریشیەوە خواردەستێك هەیە ئەوکاتە هەست بەهێزی خودی خۆی دەکات.

**٥-پەیڕەوی سۆسیۆمتری:** داهێنەرەکەی(مۆرینۆ)یەکە بۆ پشکنینو وەسفکردنو تێگەیشتنی هەڵوێستو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە رێگەی پێوانەی مەودای راکێشانو پاڵنان لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا کاردەکات، ئەم لێکۆڵینەوەیە دووجۆر لە پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان وەردەگرێت:

١-ئەو تاکانەی کەچەند سەرچاوەیەکن بۆروپێدانو رووەرگێڕان لەتاکەکانی دیکەی کۆمەڵ.

٢-کۆمەڵە خێزانییەکان، کۆمەڵەکانی کار، نموونەی ئاراستە بەیەکدا چووەکان دەنوێنن لە چالاکییەکانیاندا لەنێوان بەشداری کەرەکاندا.

لێرەدا سێ جۆر لە پەیوەندییەکان هەن، هەر وەکو لە روونکردنەوەکەماندا بۆ ئەم پەیڕەوە بەو ئاستەی کە گرنگترین پەیڕەوی بەکارهێنراوە لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵدا ئەوانەش وەکو خۆشەویستیو رەقلێبوونەوەو پشتگوێخستن.

**سۆسیۆمتری(پێوانەی کۆمەڵایەتی)**[1]: گرنگترین ئەوبابەتانەی لەبواری پێوانــەی کۆمەڵایەتیــدایان سۆســیۆمتریدا دەخــوێنرێن، پەیوەنــدی تاکەکانو شێوەی پێشەوایەتی کردنە، کاریگەری ئەمانە لەسەر رەفتاری تاکەکانو کۆمەڵو رەفتاری کۆمەڵەکانو جووڵانەوەکەیانە. بە دەربڕینێکی دیکــە جێبــەجێکردنی پێوانەکــە بەســەر بوونــەوەری کۆمەڵایەتییــدا دەکرێت.

(مۆرینـۆ) بـە داهێنـەری ئـەم پـەیڕەوە دادەنرێـت، کاتێـك دانراوەکـەی (ئـەوەی دەنوسـێ نـەمرە) سـاڵی ١٩٣٤ بڵاوکـردەوە، (مۆرینـۆ) پزیشـك بـووەو لـە خوێنـدکارەکانی (فرۆیـد) بـووە، دەسـتیکرد بـە لێکۆڵینـەوەی پەیوەندی‌یـەکانی نێـوان تاکـەکان، لـەم مەودایـەدا دەڵێـت کـە هـەر یەکەیـەکی کۆمەڵایـەتی بـە(سیسـتمێك بـۆ راکێشـان یـان فڕێـدانی راسـتەوخۆ دادەنرێـت) بـە تێڕوانینیـی ئـەو پێویسـتە لـە لێکۆڵینـەوەدا پشتببەسـترێت بـە ژیـانو تێکـەڵاویکردن لەگـەڵ تاکەکانـداو زانینـی پەیوەندییـەکانیان لەگـەڵ یەکـداو لەسـەر بونیـادی کۆمەڵایـەتیی. بـەم رێگەیـە توێـژەر دەگـات بـە وێنەیـەکی راسـت بـۆ پەیوەندییـەکان، لەسـەر ئـەم بنچینەیە دەتوانێـت کـە هاوبەشیکردنە گونجاوەکـان روونبکاتـەوە، دەڵێـت بـۆ زانینـی ژمارەیـەك لەتاکـەتاکڕەوەکان، یـان بێزراوەکـانو پاشمـاوەی کۆمەڵـە پـەرت بووەکـانو رەفتـاری پێشـەوا دژبەیەکـەکان، (مورینۆ) گرنگی بـەم بابەتـەدەدا، لـە ئـەنجامی ئـەو تێبینییانـەی بـۆ ئـەو منداڵانەی دەکرد کە لە باخچە گشتییەکاندان، بۆی دەرکەوت کە لێرەدا

---

[1] یەکەم کەس کە ئەم زاراوەیەی بەکارهێنا (جاکوب مۆرنیۆ)ی پسپۆڕ لە نەخۆشییە ژیریو دەروونییەکاندا بووە، دوای ئەوە کۆچیکرد بۆ ئەمریکاو کاری لە سەربازگە پەنابەرەکاندا دوای جەنگی جیهانی یەکەم دەکرد. — و -

منالانی گۆشەگیر، منداڵی کۆمەڵایەتی، منداڵی پێشەوا، منداڵی ملکەچ هەن... هەروەها.

سوسیۆمتری بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی زنجیرەیی ناتاقیگەیی کە پشت بە ئاڕاستەکردنی پرسیار بۆ ئەندامانی کۆمەڵێکی دیاریکراو دەبەستێت کە هێندێکیان دەناسن.

ئەم هەڵبژاردنە پێوانەی دیاریکراوی هەیە، رابواردنو کاتبەسەربردن، کارکردنو، شوێنی دانیشتن، نهێنی...هتد. وەکو ئەوەی لێکۆڵەر پرسیار ئاڕاستەبکات بۆ تاکەکەو بۆئەوەی بزانێت کە تاکەکە کێی پێباشە یاری لەگەڵ بکات، یان کاری لەگەڵ بکات، لەوانەیە کەسێك دیاریبکات. بۆیاریکردن بەڵام ئارەززو نەکات بۆ کاتبەسەربردن لەگەڵیدا، یان بەپێچەوانەوە، پێویستە گرنگی بدرێت بە بارودۆخی دەوروبەر لە هەڵبژاردندا، وەکو کاتو زمان، پرسیارەکان بەشێوەیەکی نووسراوبن یان زارەکی، تاکەکان بە شێوەیەکی کۆمەڵیی بن یان تاکی، چونکە ئەم مەرجانەو شێوەی لێکۆڵەرەوەکە کاریگەریان هەیە لەسەر تاقیکردنەوەکە.

گرنگترین شت لە سۆسیۆمتریدا تەوەری کۆمەڵایەتییە، گرنگ تاك نییە بەڵکو تۆڕەی پەیوەندیەکانی تاکەکانە. لەبەرئەوە پێویستە کە جیاوازیبکەین لە نێوان دوو تیشکدا یەکێکیان رادەکێشێ بۆچەقی تەوەرەکەو ئەوەی دیکەیان دووریدەخاتەوە لێی. یەکەمیان نموونەی راکێشان دەردەخات دوومیش نموونەی لەیەك دوورخستنەوە دەردەخات، بەیارمەتی تیشکی راکێشانو دوورخستنەوە، دەتوانرێت شوێنی کەسەکەو بارودۆخە سۆسیۆمەتریەکەی لەناو کۆمەڵدا بزانرێت. بۆ نموونە هێندێك دەگەن بەراکێشانێکی گەورە واتا لەچەقی تەوەرەکە زۆر نیزیکدەبنەوە، ئەمانە (سەرۆكو پێشەواکانن) هێندێکی

دیکەشیان دەگەن بە راکێشانێکی کەم، ئەمانە بریتین لە (پشتگوێخراوەکان) هێندێکی دیکە لە تاکەکان، هەرگیز ناگەن بە راکێشان یان زۆرکەم، ئەمانە بریتین لە (بێزراوەکان).

لێرەدا کۆمەڵێك لە شێوەکانی راکێشانو دوورخستنەوە یان روپێدانو رووەرچەرخان لەنێوان تاکەکاندا رووندەکەینەوە:

١- ← راکێشان له یەکلایەنەوە.

٢- → پاڵنان له یەکلایەنەوە.

٣- ← → راکێشانو پاڵنان له یەکلایەنەوە.

٤- ⇆ ⇄ راکێشانو پاڵنانی ئاڵوگۆڕ

٥- ⇆ → راکێشانو پاڵنان له لایەنێکەوەو راکێشان له لایەنێکی دیکەوە

٦- ⇆ ← راکێشانو پاڵنان له لایەکەوەوە پاڵنان له لایەنێکی دیکەوە

٧- ← → راکێشانی ئاڵوگۆڕ.

٨- ← ← راکێشان له لایەکەوەو پاڵنان له لایەکی دیکەوە

٩- → ← پاڵنانی ئاڵوگۆڕ.

١٠- ............ بێپەیوەندی

تاقیکارییە سوسیۆمترییەکان، نەخشەیەکی دەروونیمان دەداتی بۆ هەڵوێستو ئەوانەی کە تێیدان لە پەیوەندییەکانی راکێشانو پاڵنانو جۆری بەهاو ئەو نموونانەی کە کاریگەرن لە رەفتاردا، زانیاریمان دەداتێ لەسەر تایبەتمەندییەکانی بونیادی کۆمەڵەکە بەبێ پێویستی بوون بە ژیان لەگەڵیاندا.

گرنگترین سوودەکانی ئەنجامە بەدەستهاتووەکان لەلێکۆڵینەوەی سوسیۆمترییەکاندا بریتییە له زانینی:-

١/ مەودای کاریگەری کارکەرە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکان لەسەر پەیوەندییەکان. دەتوانین لە ڕێگەی ئەم لێکۆڵینەوانەوە خاڵە هاوبەشەکان لەلای تاکە بۆلای یەك ڕاکێشراوەکان بزانین.

٢/مەودای یەکسان بوون لەنێوان سەرۆك و گەلدا...هتد، هەرچەندە تاك نزیك بێتەوە لەناوەندەوە لەئەنجامی تاقیکردنەوەکەدا ئەوا زیاتر دەستەڵات پەیدادەکات، هەرچەندە کەسەکان لەیەکەوە نزیك بوون ئەوا هەڵبژاردنی هێندێکیان بۆ هێندێکی دیکەیان زیاددەکات لە کارکەرە کۆمەڵایەتییەکاندا وەکو تەمەن و ڕەگەزو چینی کۆمەڵایەتیو پیشەو باوەڕ..هتد کاریگەری زیاتر دەبێت لەسەری.

ڕۆڵی کەسەکەلە کۆمەڵدا گرنگییەکی تایبەتی هەیە کە جیاوازە لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە کۆمەڵی کۆمەڵایەتی بچووك بریتییە لە یەکەیەکی پیشەیی، بە گونجاندنی کاری ئەندامەکانی هەڵدەستێت، لێرەدا جیاوازییەك هەیە لە پێکهاتەدا، لە نێوان کۆمەڵە کۆمەڵایەتییەکانو کۆمەڵە دەروونییەکاندا:-

١/کۆمەڵی کۆمەڵایەتی لە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامەکان پێکدێت.

٢/کۆمەڵی دەروونی واتە هاوڕێیەتی و برادەریو هاوکاریی، لەکاتێکدا کەکۆمەڵی کۆمەڵایەتی واتاکەی پەیوەستیکردنە لە کارکردندا. بەڵام کۆمەڵایەتیی واتە هاوبەشیکردن لە مۆڵکدارێتی لە ەرهەمە ڕۆشنبیرییە مادديیەکان یان ڕۆحییەکاندا، وەکو ناو یان هێما، یان سیستمی بیروباوەڕ، یان سیستم لە کاردا یان بەرهەمی ڕۆشنبیری یان تەرزە ڕەفتارییە ناسراوەکاندا.

٣/کەسی پەسەندکراو لە کۆمەڵی کۆمەڵایەتیدا بریتییە لە کەسی چالاك، بەڵام لەکۆمەڵی دەروونیدا مەرج نییە کە کەسی پەسەندکراو چالاکبێت، بەڵکو دەگونجێ کە خاوخلیچك بێت.

٤/کەسە تاکییەکان لە کۆمەڵی کۆمەڵایەتیدا رادەکێشرێن بەرەوڕوی کەسە پەسەندکراوەکان واتا پێشەوایەك کە پلەو شوێنی بەرزی هەبێت، ئەمە بوونی نییە لە کۆمەڵە دەروونییەکاندا.

## شیکردنەوەی زانیاریەکانی هەڵبژاردنی سوسیۆمیتری:

١-(بەتاڵکردنەوەی) تاقیکردنەوەکان:-هەنگاوی یەکەم لە شیکردنەوەدا بریتییە لە بەتاڵکردنی ئەو تاقیکردنەوە راستەوانەو چەپەوانانەی کە هەموو تاکێك لە کۆمەڵدا پێیدەگات لە خشتەیەکدا کە ناودەنرێ ( بە خشتەی بەتاڵکردنەوەی تاقیکردنەوە سوسیۆمتریەکان) یان( پۆلێنکراوە سوسیۆمترییەکان) هەروەك روونکراوەتەوە، لەشێوەیەی خوارەوەدا:

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | | | | | ١- | ١- | ١ | ١ | ١ | ١- | |
| ٢ | | | | | | | | | | | |
| ٣ | | | | | ١- | | ١- | ١ | ١ | | |
| ٤ | | | | | | | | ١- | ١ | | |
| ٥ | | | | | | | ١ | | ١ | | |
| ٦ | | | | | | | | | ١ | ١ | |
| ٧ | | | | | | ١- | | | | ١ | |
| ٨ | | | | | | ١+ | ١- | | | | |
| ٩ | | | | | | | | | | | |
| ١٠ | | | | | | | | | | ١ | |

"پۆلێنکراوەکانی سۆسیۆمتری"

ئالەم خشتەیەدا، ئەنجامی جێبەجێکراوە ئەزموونی سوسیۆمتری، تێدا هەیە کە بەسەر کۆمەڵێکی(١٠) کەسیدا جێبەجێکراوە، کاتێك کە داوایلێکردون، هەڵبژاردنە راستەوانەو، چەپەوانەکانیان دیاریبکەین.
ژمارە(١) ئاماژە بۆ هەڵبژاردنە راستەوانەکلن دەکات، بەلاّم ژمار(-١) ئاماژە بۆ هەڵبژاردنە چەپەوانەکان دەکات(توڕدان).
بۆ نموونە کەسەکە دوو کەسی هەڵبژاردووە(٢). یەك تاکی فڕیداوە ( -١ ).
٢-سۆسیۆگرام (Sociogramme): لێرەدا چەند رێگەیەك هەن بۆکێشانی سیۆگرام، بەناوبانگترینیان، ئەم رێگەیەکەناونراوە بەرێگەی(نورسیوای Northuay ) کاتێك کەکۆمەڵەکە پێکهاتبو لەچەند رەگەزێکی جیاواز، لە(نێرو لەمێ)، یان لە چەند توخمێکی، جیاواز، یان ئاینێکی جیاواز، کە هەر کۆمەڵێکو بە هێمایەکی تایبەتی ئاماژەیان بۆ دەکرا، ئەگەر بویسترایە پەیوەندی نێوان هەردو کۆمەڵەکە، ئاشکرا بکرایە، تاکەکانی هەرچەشنە کۆمەڵێك، بە جۆرێك کۆدەکردەوە، لەنیزیکی هەردو تەنیشتی سوسیۆگرامەکە، بۆ نموونە / سێگۆشەکانمان لای راستەوە دادەنا، بازنەکان لای چەپەوە لە هەر چەشنە کۆمەڵێکدا ناوی ئەو تاکانە دەنوسرا، کە زۆرترین جار دووبارەبوونەتەوە، دوای ئەوە ناوی ئەوانە بەڕیز دەنوسران کە کەمتر دووبارە بونەتەوە، بەگوێرەی ژمارەی دوبارە، یان چەند بارەبونەوەکانیان.
ئەوانەی ناویان کەمتر فرەبارەبو نایەتەوە، دەنووسران، یان لە دوورتر دادەنران، وەکو ئەم شێوەیە:



سۆسیۆگرام

**دروستکردنی کۆمەڵێك**

کۆمەڵەکە بەشێوەی گشتی ئارەزووی بەرەو ئەوەدەکات، بگۆڕێت بۆ ڕێکخراوێك، کە چالاکی ئەندامەکانی بە شێوەیەکی جیاواز دیاریبکات، بەرپرسی بەسەر ئەندامەکانیدا دابەشبکات، هەر یەکەو بەگوێرەی پلەوپایەی خۆی لە کۆمەڵەکەدا.

لەدواییدا چەند کارکەرێك هەن، دەبنە بنچینە بۆرەچاوکردنی ئەو جیاوازیکردنە، لەنێوان ئەندامەکانی ڕێکخراوەکەدا:-

١-ئەو پلەوپایەی کەدەستەڵاتی ئەندامەکە سەردەخات، بەسەر ئەندامەکانی دیکەدا.

٢-شوێنو ڕێزی لەنێو کۆمەڵەکەدا.

٣-ڕادەی هاوکاری ئەندامەکە، لەگەڵ ئەندامەکانی دیکەدا، ڕادەی پابەستبونی بەفرمانی ئەندامەکەو بەرپرسییەکانیو، پێویستیەکانی سەرشانی، بەرامبەر ئەندامەکانی دیکە.

بەڵام ئەوکارکەرانەی کەدەبنە هۆی جیاوازی لەپەیدابونی کۆمەڵدا، بەکورتی ئەمانەن:-

١/جیاوازی نێوان تاکەکان لەبەهرەو شیاوییەوە، توانستەکانی تاك و ئارەزووەکانی، دەبنە هۆی کارلەیەککردنی تاکەکان، دەبنە هۆی جیاکردنەوەو بەسەرادانیان لەنێو کۆمەڵەکەدا.

٢/پێویستبونو ئارەزوکردن لەزیادکردن و پەرەپێدانی کردارەکانی کۆمەڵەکەو تواناکانیدا.

٣/جیاوازی لەوژینگە شارستانییەو کۆمەڵایەتییەی کە کۆمەڵەکە تێیدا دەژی، کۆمەڵەکە بەگوێرەی توانا هەوڵدەدات، کاری ئەندامەکانی دیاریبکات، بەگوێرەی پێویستو بەرژەوەندی پێویستی سەرشانو بەرپرسییانبکات، بۆ ئەوەی بگەنە دروستکردنی بنچینەیەکی رێکخستنی باشتر، هەوڵیشدەدات جۆرێك لە پسپۆڕی دروستبکات.

رێکخستن لەپێویستیەکانی سەرشانو بەرپرسیدا.

شێوەکە جۆری پەیوەندیو رێکخستن لەنێوان ئەندامەکاندا، روون دەکاتەوە، چونکە سروشت و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵەکە شتێکی زۆرگەورەی هەیە لەهەڵچنینەکەیدا.

کەسی وامان هەیە حەز بەکارکردنی کۆمەڵی دەکات، کەسی واش هەیە حەز بەکاری تاکی دەکات، کەسێکی دیکە هەیە حەز بە دەستەڵات دەکات، کەسیش هەیە حەز بەملکەچیو رێنماییکردن دەکات، ئەندام هەیە کراوەیەو حەز بەپەیوەندکردنی زۆردەکات، کەسی واشمان هەیە حەز بە گۆشەگیرییو دوورەپەرێزییدەکات.

لەبەرئەوە کار لەیەککردن لەنێوان ئەندامەکاندا، دەکەوێتە سەر سروشتی تاکەکان و تایبەتمەندییەکانیان. بنالەسەر ئەمە شوێن و

پایەی هەرئەندامێك لەنێو کۆمەڵەکەدا دیاری دەکرێت، کەسانی پایە نزم هەوڵدەدەن رەزامەندی پایە دارەکان و دەستەڵاتدارەکان بەدەست بهێنن.

بنچینەی پەیوەندیو جۆری دەستەڵاتو پەیوەندییان بە تاکەکانەوەو جموجۆڵەکانیانەوە، توخمەکانی بونیادی کۆمەڵەکە دیاریدەکەن.

بونیادی رەسمی رێکخراوە گەورەکان، رێنادات پەیوەندی راستەوخۆ لەنێوتاکەکاندا ئەنجام بدرێت، بەگوێرەی فرمانە جیاوازەکانیان، بەڵکو ئەم پەیوەندییە بەشێوەیەکی قوچکەیی رێکدەخرێت، هەروەکو چونە لەرێکخراوە سەربازییەکاندا، یان چۆن لەرێگەی سەرۆك بەشەکانەوە ئەنجام دەدرێت، هەروەکو چۆنە لەفەرمانگە رەسمییەکانی حکومەتدا.

شێوەی پەیوەندی نێوان تاکەکان تینێکی زۆری هەیە لەسەر هەڵچنینی کۆمەڵەکە، ئەم پەیوەندییانە:

١-یان بۆ ئەو هەڵبژاردنەی نێوان تاکەکان دەگەڕێتەوە کە لەسەر بنچینەی ئارەزوو دارێژراوە، لە بەشداریکردنی کەسێکی دیاریکراودا، لە چالاکییەکی دیاریکراودا، ئەمە پێیدەووترێت (بونیادی سۆسیۆمەتری)

٢-یان بە شێوەی پەیوەندی دەبێت، لە نێوان ئەندامەکاندا، هێندێکیان لەگەڵ هێندێکی دیکەیاندا دەیکەن، واتا: چۆنێتی پەیوەندی. لەوانەیە نموونەی پەیوەندییە کەلەسەر شێوەی زنجیرەبێت



زنجیرەکە

دەگونجێت ئەو کەسانەی کەدەکەوونە پەڕەوە پەیوەندی بکەن بە یەك کەسەوە، ئەوکەسانەی کەدەکەوونە ناوەڕاستە دەتوانن پەیوەندی بکەن، بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەدووکەسی دیکەوە، یان لەسەرشێوەی شانە بێت، ئەوکاتە هەرکەسێك دەتوانێت بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندیبکات بە دوو کەسی دیکەوە.



شانە یان بازنە



پاچکە



چەند ڕێڕەوێک





یان لەسەر شێوەی قوچک بێت، ئەوکاتە تەنها کەسێك دەتوانێت بە شێوەی ڕاستەوخۆ پەیوەندیبکات بە ئەندامەکانی دیکەوە.

٣-ئاڕاستەکاری ئەندامەکان، ئەوکەسەیە کە دەتوانێت کاربکاتە سەر ئەندامەکانی دیکەو ئاڕاستەیان بکاتو پێشەواییانبکات، ئەوەکە رۆڵی پێشەنگی دەبینێت، یان ئەوەی کە ناودەبرێت بە بونیادی هێزی، یان کارتێکردنی.

لەرێگەی دیاریکردنی شێوەی بونیادی پەیوەندی کۆمەڵەکەوە، شوێنی هەموو ئەندامێك دەناسینەوە، ئەوەی کە دەتوانێت پەیوەندی بە هەموو ئەندامانەوە بکاتو کاریانتێبکات، ئەو کەسە شوێنێکی بالآی دەبێت، بە پێچەوانەوە ئەو کەسەی کە فرمانێکی لە پەڕەوە دەبێت، دورەپەرێزە لە زۆربەی زۆری ئەندامەکان، یان وەکو ئەو کەسەی لە پایەیەکدایە، دەتوانێت پەیوەندی تەنها بە دوو کۆمەڵەوە، یان زیاتربکات.

دەیشتوانین لە شێوەی بونیادی کۆمەڵەکەوە لە رێگەی لێکۆڵینەوەی بونیادی سۆسۆمەتریەوە کۆمەڵەکە بناسین.

ئەگەر(عمر)، زەیدی کردە هاوڕێی خۆی، ئەم هەڵبژاردنە ئەوە دەگەیەنێت کە پەیوەندییەك لەنێوان هەردو لایاندا هەیە.

بەجیاوازی شێوەی ئەم پەیوەندییانە لەنێوان تاکەکاندا، کۆمەڵەکان لەیەکتری جیادەبنەوە

لە هێندە کۆمەڵێکی تایبەتیدا، هەموو ئەندامێك ئەندامەکانی دیکە بە گشتی بە هاوڕێ هەڵدەبژێرێت، یان تاکەکانی پەیوەستدەبن بە یەکەوە.

بەڵام بونیادی کۆمەڵی بزێو، یان جوڵەدار، مەبەستمان پێی ئەوەیە، تا چ رادەیەك ئەندامەکان توانایان لەسەر گواستنەوە لەفرمانێکەوە بۆ فرمانێکی دیکە هەیە، هەروەکو چۆن لە فرمانگە رەسمییەکاندا، کاتێك کە چەند یاسایەکی تایبەتی هەن، بەرزکردنەوەی پلەی فرمانبەروو گواستنەوەی دیاریدەکەن.

هێندێك فرمانگە هەن پەیوەندیان بە کۆمەڵێك فرمانی دیکەوە هەیە، هێندێکی دیکە ئەوەی لەسەر قەدەغەیە، هێندێکیان داخراوون، هێندێکی دیکەیان دەبێتە هۆی باشترین فرمان.

هەروەها هێندێك لەم فرمانانە ئەندامەکان حەزی پێدەکەن، هێندێکی دیکە یان حەزی پێناکەن، بەجۆرێك کەرەفتاری تاك سنوری بۆ دادەنرێت لەنێو کۆمەڵەکەدا، بۆ ئەوەی بگەنە پیشەی دیکە یان فرمانی دیکە.

جاری واهەیە هێزی (بگر) یان جڵەوگر هەیە، رەفتاری تاکەکان رادەگرێت، نایەڵێت هەموو ئەندامێك بشێت بۆ هەموو جۆرە فرمانێك بەهۆی کەم شارەزاییەوە، یان بەهۆی رەگەزەو، یان بەهۆی ئایینەوە.....هتد.، ئەو کارە کاردەکاتە سەر بەرهەمی کەسەکەو رادەی ورەبەرزیو دروست ژیری. پایەی ئەندامەکەو پیشەکەییو بونیادی هێزەکەی، کاری تایبەتی خۆیان دەکەن.

بۆ نموونە: ئەو ئەندامانەی پلەوپایەی بڵندیان هەیە، ئارەزو دەکەن کە کاربکەن بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵەکەو پاراستنی، بەڵام ئەو ئەندامانەی کە پلەوپایەی نزمیان هەیە، زۆر بەدەربەستەوە نین، بەڵکو هەیانە حەزدەکەن دوژمنایەتی بکەن، هەر کە باری کۆمەڵەکە لێژ بۆوە، یان تووشی گیروگرفت بوو ئەو کاتە پشتیتێدەکەن، زۆرجار لە هەڵوێستێکی بەرگریدان بەرامبەر ئەندامە پایە بڵندەکان. هەروەکو چۆن ئەندامە پایە بڵندەکان هەست بەسەربەستی زیاتر دەکەن، بەڵام ئەندامە پلە نزمەکان، ئەو سەربەستییانەیان نییە لە کارەکانیاندا.

لێرەدا، سێ کار هەن، پەیوەندیان بە داڕشتنی کۆمەڵەکەوە هەیە، ئەوانەش ئەمانەن: رۆڵی تاك، گەشەی کۆمەڵە فەرعییەکان، پەیوەندییو بەیەکگەیشتنەی، کە لە نیوان کۆمەڵەکانو رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکاندا

هەن رۆڵی تاك ئەوەیە كە تاكەكە لە كۆمەڵەكەدا دەیبینێت، ئەوەی كە كۆمەڵەكە چاوەڕێی لێوەدەكات پەیوەندیش هەیە لەنێوان رۆڵی تاكو كەسێتییەكەیدا، چونكە كەسێتی تاك كاردەكاتە سەر چۆنێتی هەستان بە كارەكەی، رۆڵیشو كەسێتیشی هەردووكیان پەیوەندییان هەیە بە گونجاندنیوە لەبارەی دەروونییەوە.

جاری وا هەیە تاك چەند رۆڵێك دەبینێت لە یەك كۆمەڵدا، یان لە چەند كۆمەڵێكدا.

جاری وا هەیە نەگونجاندنی نیشانەكانی كەسێتی ئەندامەكە لە نێوان ئەو كۆمەڵە رۆڵەی كە دەیانبینێت، دەبێتە هۆی نەگونجاندنی، ئەگەر ئەمە بۆ ژمارەیەكی زۆری ئەندامەكان روویدا، دەبێتە هۆی نەمانی كاریگەری كۆمەڵەكەو نەمانی شیاوی.

**كاری دووەم ئەوەیە:** ئەگەر كۆمەڵەكان پێكەوە نەگونجان، ئەو كاتە چەند لقێكیان لێ دەبێتەوە ئەوكاتە پەیوەندی گەرمو پەیوەندی سارد لەنێوان ئەندامەكاندا پەیدادەبێت، شێوەی كارلەیەككردنەكە بەهێزدەكات، بەڵام لەبارەی سروشتی پەیوەندییەكە لەنێوان كۆمەڵەكانو رێكخراوەكاندا، ئەو پەیوەندییانە یان ئاسۆییە، وەكو ئەوەی كەلە دەستگا خزمەتگوزارییەكاندا هەیە، وەكو/ خوێندنگەو یانەو كۆمەڵە هەرەوەزییەكاندا بەدیدەكرێت، یاخود ئەستونیە، وەكو ئەوپەیوەندییانەی كەلەنێوان فەرمانگاكانی وەزارەتی خوێندنی باڵادا هەن.

## كارلەیەككردنی كۆمەڵ

واتای كارلەیەككردن لای زاناكانی دەروونزانی كۆمەڵایەتی لەنێوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە دەركەوت، كارلەیەككردن باسی رێگاكانی رێكخستنی كۆمەڵو لێكۆڵینەوەی سروشتیو یاساكانی گەشەكردنیو

پەرەسەندنیو پەیوەندی بە تاکەکانەوە دەکات، هەروەها پەیوەندی تاکەکان بە کۆمەڵەکانی دیکەو کۆمەڵگەی گشتی ڕووندەکاتەوە، کارلەیەککردن باسی زانینی ڕادەی جوڵەی تێبینیکردنی کۆمەڵ لەسەر بیرکردنەوەو ڕەفتاری تاکەکان دەکات، لە لایەکی دیکەوە، بە واتایەکی دیکە کارلەیەککردن هێزێکی ناوخۆییە بۆ کرداری کۆمەڵی، بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵەکە، کارلەیەککردن یان گونجاو دەبێت وەکو هاوشانیکردنو تێوەچوون لەنێوان تاکەکاندا، یان لە شێوەی دوژمنکاریدا دەبێت، وەکو/ ململانێکردنو ناحەزیکردن، لەکاتێکدا ئەندامێك کردەوەیەکی تایبەتی دەکات، پاڵ بە ئەندامێکی دیکەوە دەنێت وەڵامی بداتەوە، ئەمیش کەوەڵام دەداتەوە، پاڵ بەیەکەمەوە دەنێت، هەروەها، وەڵامدانەوەکە بەشێوەیەکی بازنەیی دروستدەبێت.

لەوانەیە ئەم کارلەیەککردنە لەنێوان دوکەسدا، یان لەنێوان کەسێكو کۆمەڵێکدا، یان لەنێوان کۆمەڵێكو کۆمەڵێکی دیکەدا ڕوودەدات.

ئەو کارکەرانەی کە دەبنە هۆی پەیوەستبونی کۆمەڵێکو یەکگرتنیان ئەمانەن:-

**١-کارکەرە جەوهەرییەکان:**

ئەمانە دەگەڕێنەوە بۆ چەند وورژێنەرێکی ناوەکی گشتی، کە کۆمەڵەکە بەهێزدەکەنو نرخی بۆ دادەنێت، هێندێك لەم کارکەرانە ئەمانەن:-

- بوونی ئامانجێکی هاوبەشی کە ئەندامەکان ڕادەکێشێت بۆلای خۆی.

-ڕۆیشتن بەرەو خۆپاڵدان یان (پابەندبوون) بە کۆمەڵەکەوە، بە ئارەزوکردنی گەیشتن بە پلەو پایەی بەرز، یان بە دەستکەوتنی مسۆگەرکردنێکی تایبەتی.

- ڕۆیشتن بۆ لای یەکێك لە ئەندامەکان، ئەمەش بە کارکەرێکی گرنگ دادەنرێت لە کارکەرەکانی چونە نێو کۆمەڵەکەوە.

**٢-کارکەرە فرمانییەکان:**

ئەمە پەیوەندی هەیە بە رێکخستنی کۆمەڵەکەوە، یارمەتی تێربونی پێویستیەکانیو گەیشتن بە ئامانجەکانی دەدات.

بەجۆرێك کە دەبێتەهۆی:-

-دابەشکردنی رۆڵی ئەندامەکان هەر یەکە بەگوێرەی توانا و چالاکی خۆی، بەجۆرێك کە دەبێتە هۆی جیاوازی کارو فرمانەکان.

-نموونەی رەفتاری کۆمەڵ، واتا: شێوەی رەفتار لەنێوان سەرۆك و ئەندامەکانی دیکەدا.

شێوەی، یان نموونەی رەفتاری کۆمەڵەکە، بەگوێرەی هەڵویستی سەرۆکەکەو ئامانجەکەی دەگۆڕێت، لەوانەیە ئەو رەفتارکردنە، بە شێوەیەکی هەرەوەزیبێت، لە حاڵەتێکدا سەرۆکەکە دیموکراتی بێت، یان بەشێوەیەکی ئاڕاستەکراو بێت، لەحاڵەتێکدا سەرۆکەکە دکتاتۆری بێت.

کۆمەڵ بەرەفتار لەیەکچوون و یەك هەستییو یەك زمانی یەك نەریتی ئەندامەکانی جیادەبنەوە، هەروەها بە یەکێتییو هۆگری، جیادەبنەوە، بەتایبەتی ئەگەر مەترسییەکی دەرەکی روی تێکردن، یان کەوتنە بەربەرەکانییەوە لەگەڵ کۆمەڵانیدیکەدا، هەروەکو چۆن بەوەش جیادەبنەوە، کە دوژمنکاری کاری هەموو دەرەکییەك دەکەن.

گرنگی بە دینامیکی کۆمەڵ دەدرێت، بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندییەکان لەنێوان کۆمەڵە جۆر بەجۆرەکاندا، ئەنجامەکانیشی بەسەر کۆمەڵەکانو کۆمەڵگەدا گشتیدەکرێت، چونکە کۆمەڵەکان لە دوری یەکتر کارناکەن، بەڵکو پەیوەندییان بە شێوەیەکی راستەوانە، یان چەپەوانە، بە کۆمەڵەکانی دیکەوە هەیە، ئیتر ئارەزووی خۆیەتی ئەو کۆمەڵانە لەو بچن، یان دژی ئەوەبن جۆری سروشتی ئەو پەیوەندییانەش کاردانەوەی هەیەو ئەنجامیشی هەیە وەکو: تۆڵەکردنەوەو دەمارگیریی

شۆڤێنی، بە هۆی دوژمنکاری نێو کۆمەڵەکان خۆیانو پەشێویی نێو دەوڵەتی...هتد، یان وەکو بەربەرەکانی ئاینیو تایەفەگەری.

دەبێت ئەوەش بزانین، کۆمەڵ لە رێگەی کەسێتی ئەندامەکانێوە کاریتێدەکرێت، بە تایبەتی کەسێتی ئەندامە پێشەواکانی، کاتێك کە دۆخ دیموقراتی بێت، کاتێك پێشەوا دیموکراتی بێت، یان دکتاتۆری بێت، یان ئۆتۆقراتی بێت، یان خزمەتی بەرژەوەندی گشتی بکەن، وەکو ئەوەی ئەندامەکان هەرهەموویان بەرژەوەندی گشتیان بوێت، یان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی کاربکەن، کاتێك کە هێندێك لە ئەندامەکان بۆ بەرژەوەندی هێندێك لە ئەندامەکان کاربکەنو دەستبگرن بەسەر خێروبێری کۆمەڵەکەدا.

لە باسەکانی پێشەوەدا باسمانکردو روونمانکردەوە، کە چۆن تایبەتمەندییەکانی کەسێتیو دەروونی هێندێك لەئەندامەکان، کاریان تێدەکرێت، دەبێتە هۆی رەفتاری لەیەك چونو پەیوەست بوون بە پێوانەکانی کۆمەڵەکەوەو بە ئامانجە نموونەییەکانیۆە بە ئاراستە گشتیەکانیۆە، یان پاڵ بە ئەندامەکانەوە دەنێت، بەرەو لابەلابونەوە.

پێشەوایی:-ئەمە لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵەکەیە، ئەوە فرمانێکە، یان ئەو پایەیەکە بۆ ئەنجامدانی چالاکە گرنگەکانی کۆمەڵەکە دەشێت.

پێشەواییکردن:-لە تایبەتمەندییەکانی ئەو تاکەیە کە زاڵە بەسەر خوێدا، یان دەروونی خۆی بگرێت، ئەوکەسەی کە هێندەنیشانەیەکی لەشی وەکو بالآبەرزی رەووشت جوانی تێدا هەیە....هتد.

# دەروازەی پێنجەم

## بەشی دووەم

- پێشەوا و پێشەوایەتی.
- تیۆرەکانی پێشەوایەتی.
- تیۆری پیاوی گەورە
- هەڵویستە تیۆر.
- فرماندە تیۆر.
- جۆرەکانی پێشەوایەتی.
- کاری پێشەوایەتی لە دینامیکی کۆمەڵدا.

## پێشەواو پیشەوایەتی

لە کاتێکدا کە کۆمەڵەکە دەگاتە پلەیەکی دیاریکراو لە پەرەسەندندا، بەرپرسیو پێویستییەکانی سەرشانی هەموو ئەندامێك لە ئەندامەکانی دیاریدەکات، ئەوکاتە شێوەی رێکخراوێك وەردەگرێت، پێویستبوون بە پێشەوایی وەدەردە کەوێت.

پێشەوایی لە گرنگترین رواڵەتی کارلەیەککردنی کۆمەڵایەتییە، ئەوەش لەبەرئەوەیە، پێشەوا، کاردەکاتە سەر چالاکی کۆمەڵەکەو، رادەی بەرهەمهێنانی.

بەشێوەیەکی گشتی پێشەوایی پشت بەبنچینەیەکی سایکۆلۆجی دەبەستێت، کەئەویش زاڵبوون و ملکەچ کردنە، هێندێك لەزاناکان وەکو (ماکدوگاڵ) ئەم دوو رۆڵەتەی بەسروشتی داناوە، هەروەکو هێندێکی دیکەیان رایان وابووە کەپەیوەندی هەیەبەگەشەپێکردنی کۆمەڵایەتییەوە، چونکە یارمەتی گەشە پێکردنیان دەدات، بەچەند پلەیەکی لەیەك جیاواز، هەروەکو چۆن لەلایەکی دیکەوە پەیوەندی بەجۆری ژیانی کۆمەڵایەتیو، پلەی رێکخستنەکەیی و شارستانێتی کۆمەڵەکەییو فەلسەفەو پێوانە تایبەتمەندییەکانێوە، تینمەنددەبن.

پێشەوایی لەهەموو کۆمەڵێکدا پەیدا دەبێت، چونکە بەشێکی تەواوکەرە، لە کۆمەڵەکە، هەر کاتێك دوو کەس کارلەیەککردنیانکرد، یان هەوڵیاندا بگەنە ئامانجێکی هاوبەش، پەیوەندی لەنێوان پیشەواو شوێن کەوتودا پەیدادەبێت، بەیەك ئاست بەشێوەیەکی بەردەوام ناڕۆن، بەڵکو هەریەکەو رۆڵەکەی بەگوێرەی چەند پێوانەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریدەبێت.

بۆ نموونە پێشەوایی لە خێزاندا، هێندێك جار بۆ پیاوەکە دەبێت و هێندێك جاریشی بۆ ژنەکە، هەر یەکە بەگوێرەی پسپۆڕی خۆی رۆڵدەبینێت.

بەلآم لەهێندێك کۆمەڵدا، تایبەتدەکرێت بەیەك کەسەوە، بە راستی هیچ نیشانەو تایبەتمەندییەکی جێگیری دیاریکراو نییە، بۆ پێشەوا، بەڵکو ئەوانە بەگوێرەی کۆمەڵەکەو هەڵوێست دەگۆڕێن، بەگوێرەی سروشتی ئەو کارە دەگۆڕێن کە کۆمەڵەکە پێیهەڵدەستێت بەلآم پێویستە پێشەوا توانستی بەسەر نەخشەکێشانو پاڵنەرو وروژاندندا هەبێت، هەروەکو چۆن جێبەجێکردنی ئامانجەکانی کۆمەڵەکە، یارمەتی سەرکەوتنی کۆمەڵەکە دەدات.

بەراستی لەبارەی پێشەواییەوە، چەند تیۆرێك دەرچووە، گرنگترینیان نیشان دەدەین:-

**تیۆری پیاوی گەورە:**

ئەم تیۆرە لە تیۆرە یەکەمەکانی پێشەواییە، گرنگترین بانگەشەکەرەکانی(گالتۆن-Galton)ە، ئەم تیۆرە ئەگەری بوونی چەند توانستو بەهرەیەکی نائاسایی لەپێشەوادا دادەنێت، وای لێدەکات گۆڕانکارییەکی گەورە لە ژیانی کۆمەلآیەتیو کۆمەڵدا، دروستبکات.

رەخنە لەم تیۆرە دەگیرێت، چونکە گوزەرانی کۆمەڵو کۆمەڵگە پشتگوێدەخات.

**نیشانە تیۆر:**

خاوەنەکانی ئەم تیۆرە باوەڕیان وایە کە پێشەوا، بە پێشەوایی لەدایکدەبێت، واتا لەگەڵ خۆی چەند سیفاتو نیشانەیەکی پێشەوایی دەهێنێت.

ئەم تیۆرە گرنگیداوە بە لێکۆڵینەوەی نیشانەکانی کەسێتی پێشەوا، گریمانی بوونی کۆمەڵە نیشانەیەکی لەشیی و ژیریی دیاریکراو لە هەموو جۆرە پیشەوایەکدا لە هەر گوزەرانێکدا بێت، دیاریدەکات، وەکو: درێژیی، کەتەیی، رواڵەت جوانی، زیرەکی، شارەزایی، باوەڕبەخۆبوون، حەز بەسەرکەوتن، ویست بەهێزی، خۆگرتن،[1] بڕیاردان ... هتد.

هێندێك تایبەتمەندی دیکە هەن بەمەرجێك کە زۆر بالاتر نەبن، لەتایبەتمەندییەکانی تاکەکانی کۆمەڵەکە،(ستۆ کدڵ Stogdill )ساڵی ١٩٤٤ ئەو لێکۆڵینەوانەی بڵاوکردەوە، لەبارەی ئەو کارکەرانەی کە پەیوەندییان بە کەسێتی پێشەواوە هەیە، ئەنجامیدابوون، وەکو: کۆمەڵەکانی: دایەنخانەکانو خوێندنگاکانو سەندیکاکانی کرێکاریی دەگرتەوە،.....هتد.

بۆیدەرکەوت کە پێشەواکان هەر هەموویان بە چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراو جیادەبنەوە، کە بە چەند پلەیەکی سنوردار لەسەروی تایبەتمەندییەکانی ئەندامەکانی کۆمەڵەکەوەیە.

## هەڵویستە تیۆر:

دوای بڵاوبونەوەی بنەما دیموکراسییەکان لێکۆڵەرەکان، روکارێکی دیکەیان گرت، چونکە ژمارەیەکیان بۆیاندەرکەوت، نیشانە تیۆرەکان هەڵەیە، لەبەرئەوەی هیچ نیشانەیەك نیە کەهەموو پێشەواکان بەشداریتێدابکەن، لەبەرئەوەی ئەم تیۆرە لە هەڵبژاردنی پیشەوادا، پشت بە ژینگە دەبەستێت، چونکە پیشەوا دەرناکەوێت، کاتێك نەبێت

---

[1] Gary Desshrr, Human Behavaior Reston Poulishing Company< 1977.P.236.

کە گوزەری بۆ هەڵکەوێت لە بەکارهێنانی کارامەییەکانیدا، لە جێبەجێکردنی هیواکانیدا، چونکە توانستی کەسەکە تەنها یارمەتینادات لەسەر گەیشتن بە پلەو پایەی پێشەوایی، مادام گوزەرانی کاتو شوێنی تایبەتی بۆ نەڕەخسێت.

واتا: کارکەرە شارستانیەکانو سروشتی کۆمەڵەکەو شێوەی دروستبوونیو لەلایەکی دیکەوە قەبارەیو کەسێتی پێشەواکەو روکارەکانیو گیروگرفتی شوێنکەوتووەکانی، ئەمانە هەر هەمویان سەرکەوتنی پێشەوا دیاریدەکەن.

ئەگەر( فۆرد) لەسەدەی حەڤدەهەمدا، وەدەرکەوتایە، نەی دەتوانی بەهرەکانی خۆی لەدروستکردنی ئۆتۆمبیلدا، بەکار بهێنێت، چونکە زانستو تەکنەلوجیا ئەوکاتە تەواونەبوو.

**فرمانە تیۆر:**

گەلێ کەس لەباتی ئەوەی بۆ نیشانە تایبەتە جێگیرەکان بگەڕێت، لە پێشەوادا، دێت لێکۆڵینەوەی تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵو ئەو هەڵوێستەی کەپێشەوای واتێدا، دەکەن واتا: هەوڵدەدەن ئەو کردارانە دەرخەن، کەپێویستە لەسەر کۆمەڵەکە لە دەوروبەرێکی تایبەتیدا بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی پێیهەستن، ئەوکاتە بەگوێرەی فرمانی، ئەو کەسانەی کە پێیهەڵدەستنو لە گوزەرێکی دیاریکراودا، دەردەکەوون دیاریدەکرێن.

گرنگترین بانگەشەکەرەکانی ئەم تیۆرە (کاتل-Gateil)[٢] و( لیبیت-Lippit)ە، ئاوەها، ئەم پێوەرە ژمارەی پێشەواکان دیارینـاکات، وەکو/ نیشانە تیۆر، بەڵکو بنچینەی پێشەوایەتی فراوان دەکات، چونکە هەموو کەسێك دەگونجێت، لە هێندێك هەڵوێستدا ببێتە پێشەوا، بەڵکو هەرگیز پێویست ناکات یەك تەنها کەسێك ببێتە پێشەوا.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پێشەوایی جاری وا هەیە تەنها کەسێك ئەنجامی دەدات، جاری واش هەیە زیاتر لە تەنها کەسێك ئەنجامی دەدات، بەراستی بەگوێرەی زروف و فرمان و ئەوکەسانەی پێیهەڵدەستن، لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە دەگۆڕێت.

پێشەوای راستی کاردەکاتە سەر کۆمەڵەکەو چالاکییەکانی، زیاتر لەکەسێکی ئاسایی. لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵەرەکان لەسەر پێناسەیەکی دیارکراو رێنەکەوتوون. پێشەوا لەسەر رووناکی پەیڕەوی (سوسیۆمیتری) ئەوکەسەیە کە گەورەترین ژمارەی هەڵبژاردن بەدەست دەهێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم پێناسەیە تەسك و سنورداره، چونکە دەبڕێتە سەر هەڵبژاردنی راستەوانەدا، بەڵام خوێندنگەی دەروون شیتەڵی، پێناسەی پێشەوا لەسەر بنچینەی سروشتی پەیوەندییە دەستکردەکانی نێوان پێشەواو تاکەکانی دیکەی کۆمەڵەکەدا دەکات.

پێشەوا ئەو کەسەیە بە سەرنجو خۆشەویستی دەورەدەدرێت، بەڵام (کاتل) پێشەوا بەوە پێناسەدەکات، کە ئەو کەسەیە / کاردانەوەیەکی

---

(٢) رایمون کاتل – Gattell – ١٩٠٥ ، ئەمریکییەکی رەسەن ئینگلیزییە، کتێبەکانی (رابەری پێوانەی ژیری) ١٩٣٦، (دەروونزانیی گشتیی) ١٩٤١، (کەسێتی) ١٩٥٢، پێوانەی ژیریی منداڵانی شیرەخۆر لە دوو مانگییەوە تا سیی مانگی بڵاوبووە. – و -

ئاشکرای هەیە لەسەر تاکەکانی کۆمەڵەکە، ئابەوە پەیوەندی نێوان پێشەواو شوێنکەوتووەکانی پشتگوێخستووە.
لێرەدا پێویستە جیاوازیبکرێت لەنێوان پێشەوایەتیو سەرۆکایەتیدا، چونکە هێندە جیاوازییەکیان هەیە:-
١/ سەرۆکایەتی لە ئەنجامی سیستەمێکدا دێتەدی، نەك لە ئەنجامی دانپێدانانی هەر لەخۆوە، بە بەشداریکردنی کەسەکە لە بەدیهێنانی ئامانجی کۆمەڵەکە، لەلایەن تاکەکانەوە.
٢/ سەرۆك بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی ئامانجەکە هەڵدەبژێرێت، نەك بەگوێرەی پابەستبوونی بە کۆمەڵەکەوە.
٣/ سەرۆکایەتی بە کەم کرداریو کەم هەستی لە جێبەجێکردنی ئەندامەکاندا جیادەبێتەوە.
٤/ مەودایەکی کۆمەڵایەتی دوور هەیە لە نێوان سەرۆکو ئەندامەکانی کۆمەڵەکەدا.
٥/سەرۆك دەستەڵاتی لەدەرەوەی کۆمەڵە کە وەردەگرێت. بە پێچەوانەی پێشەواوە کە دەستەڵات لە کۆمەڵەکەوە وەردەگرێت.
بە شێوەیەکی گشتی پێشەوایەتی بە پاڵپشتی کەسێتی خۆیو شارەزاییو پێویستییەکانی کۆمەڵەکە سەردەکەوێت.

**جۆرەکانی پێشەوایەتی:**

پێشەوایەتی بەگوێرەی جۆری کارەکەو قەبارەی کۆمەڵەکە دەگۆڕێت، ووشەی پیشەوا، یان نوێنەر، بەپێشەوای کۆمەڵە بچوکەکانی کۆمەڵگە دەووترێت، بەڵام پێشەوا گەورەکان، پێیاندەووترێت (گەور)، ئەمیش چەند شێوەیەکی هەیە:-
١-پێشەوایەتی بۆماوەیی:واتا: بەمیرات دەگوێزرێتەوە، لە باوکەوە بۆ کوڕ، وەکو/ سستەمی پاشایەتی.

٢-پێشەوایەتی پلەوپایە، یان فەرمانبەری: ئەمە کارێکی ئاساییە لەلایەن سەرۆکەوە دادەنرێت، وەکو/چۆن لە رێکخراوە بیروقراتییەکاندا هەیە.

٣-پێشەوایەتی هێزی سەپێنراو: هەروەکو چۆن لە سستەمە دیکتاتۆرییەکاندا هەیە، کاتێک سەرۆك لەرێگەی هێزەوە بە زۆر دەسەپێنن.

٤-پێشەوایەتی دیموکراسی" کاتێك لەرێگەی پەرلەمانەوە سەرۆك، یان پێشەوا هەڵدەبژێرێت.

هەروەها پێشەوایەتی بەگوێرەی شێوازی دەگۆردرێت، چونکە پێشەوایەتی خۆسەپێن هەیە، پشت بە زاڵیو هێز دەبەستێت، ئەمە دەبێتە هۆی بەربەرەکانیو تەگەرە لەرێگەی گەشەکردنی کۆمەڵەکەدا، هەروەکو چۆن پیشەوایەتی دیموکراسی هەیە، ئەمە بە شێوەیەکی ئاسایی جەماوەری دەبێتو کارلەیەککردنی ئەندامەکان لەسەر بنچینەی هەرەوەزیو رێزی ئاڵوگۆڕ دەوەستێت.

## کاری پێشەوایەتی لەدینامیکی کۆمەڵەکەدا:

زۆر لە لێکۆڵەرەوەکان گرنگیان بە لێکۆڵینەوەی کارتێکردنی پێشەوایەتی، لە رەفتاری کۆمەڵەکەدا داوە، بەلام (لیڤین)و هەردوو خوێندکارەکەی(لیبیت)و (هیوایت) لەگرنگترین ئەو کەسانەن کە لەم مەودایەدا وەدەرکەوتوون، لە لێکۆڵینەوەکانیانەوە دەرکەوتووە، کە پێشەوایەتی خۆسەپێنو پێشەوایەتی دیموکراسی،و پێشەوایەتی بەرەڵایی کاری جیاوازیان لە سەر رەفتاری تاکەکان هەیە، بەم شێوەی خوارەوە:-

١- لە پێشەوایەتی دیموکراسیدا، بەجۆرێك کۆمەڵەکە هەر هەمووی بەشداری لە دانانی سیاسەتی کارکردنو بڕیارداندا دەکەن، بە هاندانی

پێشەواو یارمەتیدەرەکانیو هەر هەموو پێکەوە نەخشە دادەنێن پێش جێبەجێکردنی، بە راستی دەرکەوتووەکە پەیوەندییان بەهێزەو خۆشەویستیو برایەتیی هەر هەموویانی گرتۆتەوە، هەروەها دەرکەوتووەو پێیانەوە دیارە کە کارەکانیان بە رێکوپێکی دەڕوات، پێشەوا کە ئامادەبێت، یان لەوێ نەبێت، چونکە بەرپرسیی دیاریکراوەو تاکەکان سەربەستیان هەیە لە رادەربڕیندا بە شێوەیەکی ئاشکرا، هەروەکو چۆن بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی ئاشکرا دیارە.

٢- بەڵام پێشەوایەتی دکتاتۆریی، چونکە تەنها خۆی نەخشەی کاری گشتی بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵەکەی دادەڕێژێتو هەنگاو بەهەنگاو دەیخوێنێتەوە، بەبێ ئەوەی کە کۆمەڵە هیچ ئاگادارییەکیان لەبارەی نەخشە کەوە هەبێت، هەروەکو چۆن پێشەواکە، پەنا دەباتەبەر هۆکارەکانی ریشەکێش‌و تۆقاندن‌و هەرەشەکردن، لەبەر ئەوە دەرکەوتووە، کە کۆمەڵەکە باوەڕی بەخۆیی‌و کەسانی دیکەش نامێنێت، رەفتاری دوژمنکارییانەوە دەردەکەوێت، بەشێکی زۆری دوژمنکاری ئاڕاستەی پێشەوا خۆی دەکرێت، هەروەکو چۆن دەبێتەهۆی لاوازبوونی گیانی کۆمەڵایەتی، لە کاتێکدا کە پێشەوا کە دیارنەبوو هیچ کارێك ئەنجام نادرێت، یان هەر ناکرێت.

٣-بەڵام لەپێشەوایەتی بەرەڵاییدا، سەربەستی تەواوەتی لەنەخشەکێشانی سیاسیدا دەدرێت بە ئەندامەکانی کۆمەڵەکە، پێشەوای کۆمەڵەکە کەمترین بەشداری تێدا دەکات، هەروەکو چۆن بەشداری ناکات لە دابەشکردنی کارەکانداو جێبەجێکردنیاندا، بەراستی دەرکەوتووە ئەم کۆمەڵەیە، خراپترین کۆمەڵەیە، هیچ رادەیەك یەکگرتنیان تێدانییە، چونکە هیچ ئامانجێك نییە ئەندامەکان لەسەری رێکەوتبێتن.

ئـــەمجا نـــەبونی نەخشـــەو نـــەبونی ڕێکخســـتن، دەبێتـــە هـــۆی، بەیەکداهەڵشـــاخین، ســـــورنەبوون، کـــات بـــــەفیرۆدان، هەســــت بەنائومێدیکردن.

لەبـــەر بـــوونی زیـــادە سەربەســـتی، بەربەرەکانیـــەکی ناڕێـــك لـــەنێوان ئەندامەکانـــدا پەیـــدا دەبێـــت، ئەندامـــەکانی لەبازنەیـــەکی بۆشـــدا دەسوڕێنەوە، ڕۆڵی تاکەکانی تێدا دیاری ناکرێت، جیاوازی زۆر پەیدا دەبێت.

دەتـــوانین بڵـــێن: کەپێشـــەوایەتییەکە تـــەنها دەوەســـتێتە سەرکەسێتی پێشـــەواکەو هەڵوێســـتی کۆمەڵایـــەتییو کارلەیەککردنەکـــەی نێوانیـــان، واتا/کەسێتی پێشەوا ڕووکارەکانی شوێن کەوتووەکانیو گرفتەکانیان، بنـــای کۆمەڵەکـــە، تایبەتمەندییـــەکانی، ئـــەو هەڵوێســـتانەیکە کارکـــەرە سروشـــتییەکان دیاریدەکـــەن، هیچـــیان یـــەکناگرن لـــە پێشـــەوایەتی بەرەلاییـــدا. چـــونکە پێشـــەوایەتیو ســـەرکەوتنی لـــە دوتـــوێی ڕەوشـــی پێشەواکەو پەیوەندی بە ئەندامەکانەوە، هەردوکیان بە دیاریدەکرێن.

# دەروازەی شەشەم

## بەشی یەکەم

- ☐ ڕوکارەکان و بیروباوەڕەکان
- ☐ گۆڕانی ڕوکار
- ☐ پۆلینکرنی ڕوکارەکان
- ☐ پێوانەی ڕوکارەکان
- ☐ ڕێگاکانی پێوانەی ڕووکارەکان
- ☐ دیاریکردنی جێگیری ڕوکارەکان و ڕاکان
- ☐ چۆنێتی دابەشکردنی ڕوکارەکان لەنێوکۆمەڵگەدا
- ☐ بیرۆکەی پۆلێنکردنی زانستییانە
- ☐ لابەلاکانو ڕادیکالییەکان
- ☐ سنورگیرەکانو ڕادیکالییەکان
- ☐ پۆلێنکردنی ڕاکانو ڕووکارەکان بەگوێرەی بەهای کەسێتی

## روکارەکان و بیروباوەڕەکان و روکارە دەروونیەکان

**پێشەکیو پێناسە:**

روکاری دەروونـی واتایـەکی وێناییـە، وەکـو پاڵنـەری سروشـتی وایـە، بەمەبەستی گەیشتن بە زانینی هەڵوێستی خەڵکی، بەرامبەر دابو نەریت بەکاردەهێنرێت، یان زانینی روکاریان لە هێندە رەگەزێکی خـەڵکی، یان لە هێندە بیروباوەڕێکی سیاسیی.

هــەر هــەموو رواڵــەتێکی ژیــانی دەروونــی، دەچــێتە ژێــر رکێفــی روکارەکانەوە،، گرنگی ئەوەش لە رەفتاردا دەردەکەوێت.

بە راستی فەیلەسوفی ئیگلستانی سبنسەر (Spencer)[1] یەکەم کەس بــوو کــە زاراوەی (روکــار Attitude )ی لــە پەرتوکەکەیــدا (بنــەما سەرەتاییەکان) ساڵی ١٨٦٢ بەکارهێنا.

زاناکان رێنەکەوتون لەسەر دانانی پێناسەیەکی هاوبەش بۆ روکارەکانو سروشــتی، بــەڵام ئــەو پێناســەیەی کــە پەســندبێت، پێناســەکەی (ئەلبورتــەAllort ) ئــەوەی کــە دەیــوت! روکــار حاڵــەتێکی ئامــادەیی دەروونیــی و ژیرییــە، کــە لــە شــارەزاییی کەســەکەوە و لەتاقیکردنــەوە کــانێوە دەردەچــێت، ئــەوەی کاردەکاتــە ســەر وەڵامدانــەوەی تاکەکــە لەهەموو ئەو هەڵوێستانەیکە ئەو وەڵامدانەوە دەی وورووژێنێت.

(بۆگاردۆسBogardus) پێناسەی دەکات و دەڵێت ئەو ئارەزو حەزەیە، ئــەو ئامادەییەیــە کــە ئاراســتەی رەفتاردەکــاتو بەچــەند پێوانەیــەکی راســتەوانە یــان چەپەوانە دیاریــدەکات، بە گــوێرەی هێنــدە رواڵــەتێکی

---

[1] هێربارت سبنسەر (١٨٢٠ – ١٩٠٣)، ئەندازیارو وێژەوانو فەیلەسوفو کۆمەڵناسێکی ئینگلیزیە، بەبێئەوەی بچێتە هیچ خوێندنگەیەکی حکومی یان ئەهلییەوە، خۆی خۆی فێری خوێندنکرد، یەکەم کەس بوو تیۆری پەرەسەندنی داروینی راڤەکردو ساڵی ١٨٦٠ بڵاویکردەوە. - و -

ژینگەیە، کەروی تێدەکات، یان لێی هەڵدە سەمێتەوە، واتا/ جەخت لەسەر کاری ژینگەی دەرەکی دەکات لەسەر رەفتار. بەلام (ترستون Tharstone) پێناسەیدەکاتو دەڵێت/ روکار پلەیەکە لەهەستی راستە وانە، یان چەپەوانە، کە پەیوەستە بە هێندێك بابەتی سایکۆلوجییەوە.

بەلام (نیو کومب)، جەخت لەسەر رەگەزی پاڵنەر دەکاتەوە، لە واتای روکاردا، دەڵێت/ روکار حاڵتێکە لە ئامادەیی، کە پاڵنەر دەوروژێنێت، دەڵێت/ روکاری کەسێك بەرەوڕووی شتێك، ئەوەیە کە بریتییە لە ئامادەیی بۆ کارکردن، پەیکردن، بیرکردنەوە، هەستکردن، واتا/ئامادەبوون بۆ وەلامدانەوەکە هەرچی جۆرێك بێت. روکار بریتی نییە لەرەفتارەکەیان وەلامدانەوەکە، بەڵکو بریتییە لەو پاڵنەرەی کە دەبێتە هۆی رەفتارەکەو پاڵی پێوەدەنێت.

واتای وایە روکار حەزێکی دەست کەوتووە، بەرامبەر بابەتێکی دیاریکراو، وەکو/پاڵپشتکردنی، یان بەرهەڵستیکردنی، یان روتێکردنی کۆمەڵەیەکی دیاریکراو، وەکو/ هەڵویست لە هێندێك کەمایەتی رەگەزی، روکار دەستکەوتە، لەبەرئەوە دەشێ بو گۆڕان، چونکە شتێکی سۆزییە، لەمەودای دەروونی تاکدا،پەیدادەبێتو لەسەر شێوەی رەفتاروکردار دەڕوات. هەموو روکارێك رادەوەستێتە سەر باوەڕەکەی.

**بیروباوەڕ:** کۆکراوەیەکی رێکخراوی هەمیشەییە بۆ پەرەسەندنو زانین کە لە هەستکردنەوە پەیدادەبێت.

واتا/ رێکخراوێکی ژیرییە بۆ بنیاتی پەیکردنی هەستیو هۆشیو زانیاریو راکان.

لەوانەیە ئەم دوو رواڵەتە(روکارو بیروباوەڕ) تیشکدانەوەیان لەسەر کۆمەڵەکەو شێوەکانیو پلەکانیو ئەو رایەی کە لەگەڵیدا هەیەو دیاریشە، هەبێت.

لە باڵاترین تایبەتمەندییەکانی روکار، ئەوەیەکە حاڵەتێکی ژیریو دەمارگرو تارادەیەك جێگیرە، روکار تارادەیەك بەردەوامی هەیە، بۆ نموونە:- ئەوکەسەی کە روکارێکی راستەوانەی بەرامبەر نەریتە ئاینییەکان هەیە، رەفتاری لەهەڵوێستێکەوە بۆ هەڵوێستێکی دیکە بەخێرایی ناگۆرێت، هەرچەندە لەمەودایەکی درێژ خایەندا بەکاری کارتێکەرە ژینگەییەکانو دەوروبەر، ئەگەری گورانی هەیە.

روکار بەرامبەر راستییە جێگیرە بڕیاردراوەکان، ئەوانەی کە رێکەوتنیان لەسەرکراوە، نابێت، بەڵکو روکار بەرامبەر ئەو بابەتانە دەبیت کە لەسەر یەك بار جێگیرنین.

روکار، بارەکانی ژیریو زانیاریو پەیکراویو رەفتاری جۆربەجۆری مرۆڤ دەگرێتەوە، لەبەرئەوە پێویستە لەگەڵ سۆزدا تێکەڵاوی نەکەین، چونکە سۆز بەوە جیادەبێتەوە کە کەسییەو خۆییە، هەروەکو چۆن پێویستە جیاوازی بکەین لەنێوان روکارو راکەدا، چونکە روکار واتای ئامادەیی ژیرییە بۆ وەڵامدانەوە، یان نیزیکبوونەوە، یان دوورکەوتنەوە لە بابەتێك لەبابەتەکان، بەڵام( را) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە راستە، یان هەڵەیە لە باوەڕی ئێمەدا، لەبەرئەوەی روکارەکان زیاتر گشتیترن لەو رایانەی کە هۆکارن بۆ دەربڕینی سەرزاری لە بارەی روکارەوە.

روکار بەوە جیادەبێتەوە کە گریمانییە، خەملاندنییە، هێنانەپێش چاوییە، واتا/ وەکو پاڵنەری سروشتیو حەزەکان وایە، لەرێگەی ئەوەوە دەگەینە رادەی یەککگرتنو گونجاندنی راکان، هەر ئەوە دەتوانێت یارمەتیمان بدات لەسەر روونکردنەوەی راکان، چونکە بێئەو زۆر قورسە میکانزمی دەروونیو کۆمەڵایەتی روونبکەینەوە، ئەو میکانزمەی پاڵ بە کەسەکەوە دەنێت بۆئەوەی رەفتارێکی تایبەتی بکات، یان بڕیارێکی تایبەتیی بدات.

روکاری تاك، کاردەکاتە سەر پەیکردنیو هێنانەپێش چاو، بەهێزکردنی، چونکە توانستی بیرهێنانەوەی مرۆڤ بەهێز دەبێت، ئەگەر کەسەکە ئامادەو حازر بێت بۆ شتەکە.

مادام وایە روکار باری دەروونی ئەو کەسەیە کە پاڵییپێوەدەنێت، بۆ باوەڕبوون بە بابەتێکی تایبەتی، وەکو ئەوەی کەپەسندی بکات، یان پەسندی نەکات، ئەتوانرێت رادەی ئەو ویستو نەویستنە، لە رێگەی ئەو پێوانەیە وە بزانرێت، کە نیشانەی زانستی پێدەبەخشێت.

روکاریش ژینگەییو دەستکەوتە، نەك بۆ ماوەییە، ئەمەش کاتێك ڕووندەبێتەوە کە بارێکی جێگیر دەگرێتو دەچەسپێت، هەروەها لەکاتێکدا ئارەزووی مرۆڤ بۆ شتێکی تایبەتی، بۆ رووکارێکی دەروونی پەرەدەسێنێت.

تاك بەچەند رێگەیەکی جیاواز، روکارەکانی بەدەست دەهێنێت، وەکو/ چاولێکەری، وەکو/ روکاری مرۆڤی سپی بەرەو رووی رەش پێست، یان رەنگاو رەنگەکانی وولاتەیەککگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەوەی کەبەپلە جیاوازی هەیە، نەك بەجۆر، بەگوێرەی ژینگەو بۆ چونی ئەو کۆمەڵەی کە تاك پاڵی پێوەداوە، یان تاك پابەندێتی.

جاری وا هەیە تاك رووکارەکانی بەرێگەی شارەزایی تاکییەوە بەدەست دەهێنێت، یان لەرێگەی تاقیکردنەوەی کەسانی دیکەوە، ئەم دەیبەستێت بە ژیانی ئێستەیەوە، وەکو ئەوەی کە تاك حوکمبکات بەسەر نەخۆشخانەکاندا، بە پیسیو چەپەڵیو گرنگینەدان بە نەخۆشەکان، یان لەرێگەی شارەزایی هەڵچونییەوە، وەکو/ ئەو ئایندارەی کە لە ئایین وەردەگەڕێت، ئەگەر نیو چاوانی تەقی بەکارێکی زۆر کاریگەردا. روکارو بیروباوەڕ بەگوێرەی جیاوازی تەرزەکانی

رۆشنبیریی باودا، لە کۆمەڵدا، کاریتێدەکرێت، هەروەکو/چۆن لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی دیکە لەیەك کۆمەڵدا دەگۆڕێت.

ئەمەیش لە ئەنجامی رادەی پەیکردنی تاکدا، بۆ رواڵەتەکان و لێکدانەوەیان، هەروەکو چۆن نیشانەکانی کەسێتی تاك، کاردەکاتە سەر جۆری ئەو روکارانەی کەبەدەستیان دەهێنێت، کەسی شۆڕشگێر کراوەترە لە کەسی سنورگر، کەسی گۆشەگیر ئامادەیی زیاترە بۆئەوەی روکاری سنوردار هەڵگرێت، چونکە رو لە ملکەچیدەکات.

روکارە دەروونییەکان، کاردەکەنە سەر تێرکردنی ، زۆر لەپاڵنەرو پێویستیە دەروونییەکان، پێویستی بە پاڵدان بە کۆمەڵێکەوە، پێویستی بە بەشداریکردنی باری ویجدانی تێردەکەن، هەروەکو چۆن روکار کاردەکاتە سەر ئاسانکردنی ئەو وەڵامدانەوانەی، کە روودەدەن لەو هەڵوێستەی کە روکاری تایبەتیمان بەرامبەر هەیە، بۆ رەفتارێکی نوێ هەموو جارێك ناگەڕێن، کەروبەروی هەمان هەڵویست بوینەوە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەروکار گرنگییەکی زۆری هەیەلە ئاراستەکردنی رەفتاری تاکدا، بەجۆرێکی وا کەوای لێکردووە کە پلەوپایەیەکی زۆر بەرزی گرتووە، لە دەروون زانی کۆمەڵایەتیدا، زۆر نیزیکە لەوەی کە بەبڕبڕەی پشتی دابنرێت، چونکە کاردەکاتە سەر بیرهێنانەوەی تاکو هێنانەپیش چاویو پەیکردنی، چونکە تاقیکردنەوەکەی (رازران Razran) دەیسەلمێنێت، ئەوەی کەوا وێنەی (٣٠) سی کچی نیشانی کۆمەڵێك لە خوێندکاراندا، بۆئەوەی لە (٥) پێنج پلەدا، بە گوێرەی زیرەکیو جوانیو میزاژی خۆیان ریزیان کەن، بەبێئەوەی ناویان لەسەر بنوسرێت، دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ هەمان وێنەو بەهەمان ژمارە، نیشانی هەمان کۆمەڵەدرا، بۆ ئەوەی ریزیانکەن لە چەند پلەیەکدا، کە ژمارەیان دووبارە (٥) پێنج پلەبوو، بەڵام ئەمجارەیان

وێنەکان ناویان لەسەر نووسرابو، ناوەکان هێندێکیان ئیتالی بوون، هێندێکی دیکەیان ئەمریکی بوون، ئەوانی دیکە جولەکانە بوون، کەچی ئەم ریزکردنەیان بۆ وێنەکان جیاوازی هەبوو لە ریزکردنەکەی پێشویان، چونکە ئەوانەی ناوی ئیتالی و جولەکەیان لەسەر نووسرابوو، لە پلەی لای خوارەوەدا، دانرابوون، کەچی جاری پێشو لای سەرەوە دانرابوون.

ئەم تاقیکردنەوەیە ئەوە دەردەخات کەروکارەکان کاردانەوەیان هەیە، بۆ سەر پەیکردن. لەوانەیە ئامادەبونی دەروونی لە روکاردا، تا رادەیەکی دور، یان نیزیك بڕبکات، وەکو/ کارلێککردنی تاك لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی کەتییدایەتی لە ئاستێکی دیاریکراودا، بۆ نموونە کەسی تینو ئامادەیی ئاو خواردنەوەی نامێنێت کەئاوی خواردەوەو تینوتییەکەی شکا.

بەڵام ئامادەبوونی درێژ وەکو/ نەخواردنی گۆشتی بەراز لەلایەن مرۆڤی موسڵمانەوە چونکە روکارە ئاینییەکان قەدەغەی لێدەکات.

دەتوانرێت کاربکرێتە سەر روکاری مرۆڤو پەرەپێدانی. ئەمە وادەکات کە کاربکرێتە سەر، روکاری تاکەکانی یەك کۆمەڵ، بەهۆی ئەو کارکەرە کەسییانەی کە هەیەتی، یان بەگوێرەی ژینگەی کۆمەڵایەتی. کارکەرە دەروونییە فیزیۆلوجییەکان، لەکارکەرەکانی تەمەنو رەگەزو توخم، زیاتر کاردەکەنە سەر روکارەکانی مرۆڤ، بۆ نموونە/ چەندێك مرۆڤ زیرەکییەکەی بەرز بێتو چەندێك رۆشنبیرییەکەی باڵابێت، ئەوەندە زیاتر بە روکارە سیاسییەکانێوەو ئابوورییەکانێوە، ئارەزوی بەرەو یاخیبوون دەکات" بە پێچەوانەوە ئارەزووی کەسەکە رووەو هێمنیو دوورەپەرێزی دەڕوات بەبێ رەچاوکردنی تەمەنو توخم....هتد.

پـەروەردەی خێزانـی، خوێنـدنی قوتابخانـە، خوێنـدنی ئـاینی، پلـەی ئـابووری، سروشـتی پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی، ئەمانـە هەرهـەموو کاردانەوەیەکی زۆر گەورەیان هەیە لەسەر روکارەکانی تاك.

روکـار بەرامبـەر راسـتییە جێگیرەکـان، ئەوانـەی بـەلای خەڵکییـەوە لـە سەری رێکەوتون دەرناکەوێت، بەڵکو بەرامبەر ئەو بابەتانە دەردەکەوون کـە بابـەتی(جـدل)یـن گومانیـان تێداهەیـە. لێـرەدا پێویسـتە جیـاوازی بکەین لەنێوان (روکار و را) دا، روکار بریتییە لەئامادەبونێکی ژیری بۆ وەڵامدانەوە، یان ئارەزوکردن بۆ هـەر بابەتێك هـەبێت، بـەڵام (را) ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـەباوەڕمان پێـی هەیـە، واتـا: روکـار گشـتی تـرە لـەو رایانەی کە هۆکاری دەربڕینی سەرزارییین، لەبارەی روکارەوە.

روکار سێ توخمی پەیوەستی لەخۆی گرتووە،

١- تـوخمی ژیرانـە، ٢-تـوخمی ویجـدانی، ٣-تـوخمی رەفتـاری، واتا/ بیروهەستو کردار، واتـا/ روکـار بەشێوەیەکی ئاسایی بەشێکە لـە بەشێکی گەورەتر، کە چەند روکارێکی دیکەی بەرامبەر چەند بابەتێکی بەیەکداچـوی لـەخۆی گرتـووە. روکـار ناتوانرێـت تێـی بگـەین، کاتێـك نـەبێت بەشـێوەیەکی زانسـتیانە، شـیتەڵ بکرێـتو ببەسـترێت بەپلـەی تاکـەوە لەبنچـینەو هەیکـەلی کۆمەڵایەتییـەوە، ئـەوەی کەکومەڵگـەی نـاوخۆیی، یـان کۆمەڵگـەی گـەورەی لێدروسـت دەبێـت، وەکـو/ خێـزان، پیشە، چین....هتد.

بـۆ نمونـە روکـاری رووەو ئـافرەت، پێویسـتی بـەزانینی روکارەکـانی دیکـەی تاکـەکان بـەرەوڕوی کێشـەکانی دیکـە هەیـە، ئەوانـەی لەگەڵیـدا بەیەکـدا چـوون، وەکـو/دیموکراسـی، سەربەسـتی، سۆشیالیسـتی، هەروەکو چۆن ئەوە پێویستیبە دەرخستنی دۆخـی تاك هەیـە، یـان ئـەو پلـەو پایـەی کـە لـە بنچـینە جیاوازەکـانی کۆمەڵایەتیـدا هەیـەتی،

ئەوانــەش، وەکــو/ بونیــادی خێزانــی، بونیــادی پیشــەیی، بونیــادی سیاسی..هتد.

هــەموو یــان زنجیرەی ئـەو پلـەو پایانـەی، کـە تـاك لـە ئـەو بونیانانـەدا پڕیاندەکاتــەوە، کەســێتی گشــتی ئــەو دیاریدەکــەن، روکارەکانیشــی بــــەرەوڕووی رواڵەتـــــە گشـــــتیەکان راڤەدەکـــــەن، روکارەکـــــان وەلامدانــــەوەکانمان لــــە شــــوێنە جــــۆر بــــەجۆرە کۆمەلایەتییەکانــــدا ئاساندەکەن، ئەوانەی کە روکاری تایبەتیمان بەرامبەریان هەیە، چونکە پێویسـتیمان بەگـەران بـەدوای رەفتـارێکی نوێـدا نابێـت، هـەرجارێکی دیکە روبەروی هەلوێستێکی دیکەی ئاوەها بوینەوە.

واتای وایە روکار گرنگییەکی گەورەی هەیە، لە ئاڕاستەکردنی رەفتاری تاکدا، لەبەرئـەوە پایەیـەکی گرنگـی هەیـە لـەدەروونزانی کۆمەلایـەتیـدا، چـونکە کارتێکردنەکـەی لـە بـیری تـاکو گۆڕانیـو پەیکردنیـدا بەباشـی دەردەکەوێت.

بەدوای روکاردا، زنجیرەیەك لە رەفتارە جۆربەجۆرەکان دێت، وەکو یەك ریزیان دەکاتو نیشانەیان دەکاتو جێگیردەبن. واتای وایە:-

١/ کۆمەلێك لە تەرزەکانی رەفتارە جۆربەجۆرەکان دەگرێتەوە.

٢/ ریزێکــی کرێیــاوی دەنوێنێــت، هەرچــەندە ناگاتــە قــولی پالنــەر، بــەلام کۆمەلێك پالنەر تێردەکات، دەبێتە هۆی دەرکەوتنی کۆمەلە پالنەرێکی نوێ.

٣/چەند پلەیەکی جیاجیا لە تایبەتمەندییەوە، بۆ گشتایەتی دەنوێنێت، بۆ نموونــە/ تورەبــون جــاری واهەیــە تــەنها دژی کۆمــەلێکی تایبــەتی دەبێــت، جاری واش هەیە دژی هەموو بێگانەیەك دەبێت.

٤/ لـە دوتـوێی کارکـەرێکی جیـاوازدا دروسـتدەبێت، وەکـو خێزانـو کۆمەلەکانی دیکە، کۆمەلگە، شارستانییەت.

بێجگە لەوەش نیشانەکانی کەسێتی تاك‌و رادەی پەیکردنی روالەتەکان لێکدانەوەیان، تاقیکردنەوە کانیو شارەزاییەکانی هەرهەموویان، دەبنە هۆی جیاوازییەکانی روکار لەلای تاکەکەسێك، لەیەك کۆمەلدا.

بینا لەسەر ئەم بنچینەیە، کەسێتی گۆشەگیر زیاتر ئامادەیی هەیە بۆ رۆکارە سنورگرەکان (الاتجاهات المحافظة)، بەهۆی ئەوەی خاوەن ئەو کەسێتیە، زیاتر ئارەزووی ملکەچییدەکات، بەلام کەسێیتی شۆڕشگێڕ، کراوەترە لە کەسێتی سنورگیر.

هەروەها بیرکردنەوەی تەرزی ئاسایی(Stereetypes) بریارە پێشودراوەکان(Prejuges) دوبارەکارتێکردنیان هەیە، ئەمیش بەکاری سروش‌و چاولێکەری.

هەروەکو چۆن روناکبیری، بالاو زیرەکی بەرز رووەو روکارەکانی شۆڕشگێڕیو سەربەستی پالدەنێت.

**گۆڕانی رووکار:-**

لەوانەیە روکارەکان لەئەنجامی گۆڕانی شارستانی‌و کۆمەلایەتی کۆمەل‌و کۆمەلگەدا، بگورین، ئەوەش لەبەر ئەوەی تاك توانای هەیە لەسەر وەرگرتنی نەریتی بنچیینەیی نوێ، چونکە جێگیری روکارەکان، جێگیربونێکی رێژەییە، چونکە چاولێکەری، یان وەرگرتنی رای تایبەتی، یان رەفتاری نوێ تەواو نابێت، لەدوتوێی رەزامەندیو قبولکردندا نەبێت.

گوڕانیش بەچەند هەنگاوێك تەواودەبێت، بە قبولکردنی ئامرازە مادییە نوێکان وەکو/ فێنککەرەوەو جلشۆری کارەبایی، دوای ئەوە بەرەبەرە تاکەکان دەگوازرینەوە بۆ رادەیەك، کە هەولئەدەن پارێزگاری لەسەر تەندروستی خۆیان بکەن، لە دواییدا بیرو کارە نوێکان وەردەگرن‌و قبولدەکەن.

ئاوەها گۆڕانی رەفتار دەبێتە هۆی گۆڕینی نەریتە بنچینەییەکان.
روکار بەرامبەر راستیە جێگیرەکان ئەوانەی لەسەری رێکەوتوون ناگۆڕێت بەڵام بەرامبەر ئەو بابەتانەدەگۆڕێت کە بابەتی گونجاوون بۆ گومان لێکردن(موضوعات جدلیة).
بەراستی گۆڕینیی رۆکارەکان، پشت بەچەند هۆکارێك دەبەستێت، ئەو هۆکارانە وەکو/ ئەو کۆمەڵە کۆمەڵایەتییەی، تاکەکە پاڵی پێوەداوە، بێجگە لەکەسێتی ئەو کەسە کە زانیارییەکان وەردەگرێت، وجۆری زانیارییەکانیش رۆڵیان هەیە.
روکار بەرامبەر هەر روداویك بێت، هەڵویستی خەڵکی دەردەخات بەراستی گەشەپێکردنی کۆمەڵایەتی خێزانی بێت، یان پەروەردەیی(خوێندنگەو دەستگاکانی فێرکردن)، ئاینی بێت، یان سیاسی، هەروەها هۆکارەکانی راگەیاندن، هەر هەموویان بەشداری لەدیاریکردنی روکاری تاکدا دەکەن.
چۆن رواڵەتە کۆمەڵایەتییەکانو تەرزەکانی رەفتار لە هێندێك لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکاندا، وەکو/ئەسکیمو، سێبریا، دورگەی فیجی لێکدەدرێتەوە، چونکە دانیشتوان باوەڕیان بەگەڕانەوەی رۆحو ژیانی دوای مردن هەیە، لەبەرئەوە کوڕەکان پێش ئەوەی باوکەکانیان پیربنو پەکیان بکەوێت، هەڵدەستن دەیانکوژن، ، بۆ ئەوەی بە گیانو لەشی بەهێزی جارانەوە، دەست بکەنەوە بەژیان.
کۆبونەوەی روکار
جاری وا هەیە کەسێتییەکی پەرگردەبێت، جاری واش هەیە، کەسێتیەکی ئاسایی دەبێت.

## تایبه تمەندێتیو جۆشخواردنی روکارەکان

روکارەکان لە روی جۆشخواردن و قوڵبیشەوە، جیاوازیان هەیە، چونکە جاری واهەیە بە کردار، یان بەڕادان، یان بە بڕیارە پێشکاتدراوەکان، یان بە بیرۆکە تەرزدارکراوەکان، دەردەبڕدرێت وەکو/بڵێن شارپرە لەوێنە، لێرەدا بەشێك لەزانیاری هەیە، پشت بەزانیاری ژێری و راستەوخۆو دەرەکی دەبەستێت، جاری واش هەیە پشت بەزانیاری خەڵکی دەبەستن وەکو/رقبونەوە لەمرۆڤی رەش.

واتای بڕیارە پێشو دراوەکان/ ئەو بڕیارە راستەوانەیە، یان چەپەوانەیە، کە بەرامبەر کەسانو بیروڕاو شتومەك دەدرێت، بەبێ تاقیکردنەوەی کەسیی.

واتای بیرۆکە تەرزدارکراوەکان/ ئەوەیە کەبڕیار بدەیت بەسەر جۆردا، بەلایەن تاکەکانێوە[1]، یان کۆمەڵەکانێوە، یان واتاکانێوە(نیشانە دارکردن) وەکو/دڵسۆز، بەکەڵك، پاك، تەممەڵ، پیس.

<u>ئەوکەسانەی کە بڕیارە پێشکاتدراوەکان و بیرۆکە تەرزدارکراوەکان کاریانتێدەکات، ئەوانە:</u>

١-ملکەچن بۆ هێز، ٢-داوای پاراستن دەکەن، ٣/شەڕانین، ٤-توشی سۆزە ساردی بوون.

لێرەدا پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان روکارەکانی دەروونیداو هەڵوێستەکانی خەڵکیدا بەرامبەر رژیمەکان و ئەو یاسایانەی کەباون لەکۆمەڵدا، و ئەودەستە کۆمەڵایە تییانەی کەبەرپرسن لە مسۆگەرکردنی جێبەجێکردنی ئەو یاساو رێکخراوانە.

[1] وەکو لە کوردیدا دەووترێت: گایەکی ریخن گایەڵێك عەیداردەکات، بە پێچەوانەوە دەووترێت: هەموو پەنجەی دەست وەکو یەکنین. – و –

لەراستیدا هەموو رواڵەتە دەروونیەکان ملکەچن بۆ روکارەکان، گرنگی ئەمەش لەرەفتارو ئەو رایانەی کەبڵاوون لە کۆمەڵەکەدا، یان لەلای تاك، دەردەکەوێت.

روکارەکانی خوێندکاران و لاوان بەهۆی جۆرەها کارکەری جیاجیاوە، کاریان تێدەکرێتو نیزیکن لە گۆڕانو راستکردنەوەوە، چونکە ئەمانە دەستکەوتوونو سروشتیی نین.

روکار جیاوازی هەیە لەسۆز، چونکە سۆز کەسیوخۆییە، بەڵام روکار دوروونیو کۆمەڵایەتییە، پاڵ بەتاکەوە، یان کۆمەڵەوە دەنێت، بۆ ئەوەی بڕیارێکی تایبەتی، یان رەفتارێکی تایبەتی بنێت.

لە کاتێکدا کە کۆمەڵ دەگۆڕێت بۆ کۆمەڵێکی سەردەمیو پەرەپێدراو، ئەو کاتە زۆر پێویستە بۆ هۆکارەکانی راگەیاندن پەنابەرین، لەجێبەجێکردنی تەواوکاری کۆمەڵایەتیدا، بۆ ئەوەش بتوانین چەند یاسایەکی پێویست بۆ کرداری پەرەپێدان و بوژاندنەوە دابنێین.

لەبەرئەوە بە راستی هۆکارەکانی راگەیاندن، شۆڕشێکی هەڵگرساندووە لەمەودای پەروەردەدا، چونکە بەشداری لەدروستکردنی روکاری نوێدا دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە لەنێوان لایەنە مادیو نامادییەکاندا لەشارستانی گۆمەڵدا لەنگەر هەبێت.

بۆ پێشەواکانی(را)، کەسە قسەڕۆکان، وەکو/ پیاوانی سیاسەتو بیریارەکانو، پسپۆڕان، هەریەکەو لەومەودای خۆیاندا، گرنگییان هەیە لەزانیاری گەیاندندا، لەکارکردنە سەر ئەو جەماوەرەی کە باوەڕیان پێیان هەیە، پەیوەندیو کارتێکردنی ئەم بەشە بەجەماوەرەوە، لەرێگەی هۆکارەکانی راگەیاندنەوە، بەمەبەستی چەسپاندنی نەریتە نوێکان بەرەبەرە فراوان دەبێت.

بۆ ئەوەی روکارەکان لەرێگەی هۆکارەکانی راگەیاندنەوە بگۆردرێن، یان دۆخی بو راستبکرێتەوە، پێویستە، ژینگەی کۆمەڵایەتی گونجاوی یارمەتی دەری بۆ ئامادەبکرێت، وەکو/ بلاوکردنەوەی زانیاری لە رێگەی فێرکردنی تەوزیمی خۆڕاییەوە، و نەهێشتنی نەخوێندەوارییەوە، بۆ ئەوەی رێگەخۆشکەرێت بۆ هۆکارەکانی راگەیاندن، فرمانەکانیان لەهەموو رویەکەوە، بەشێوەیەکی پێویست ئەنجام بدەن.

جاریواهەیە پڕوپاگندە، لەگۆڕینی روکارەکان و ئاراستەکردنی راکاندا، کاری چاك دەکات، هێتلەر باوەڕی وابو کەلەرێگەی پاگندە کردنەوە، دەتوانێت جیهان هەر هەموو بگرێت.

لەراستیدا وانەبوو، چونکە هۆی پاگندە نەبو کە هێندێك لە دەوڵەتان وەکو/ نەمسا، تیشیکۆ سلوڤکیای(پێشو) روخا و ملکەچیکرد بۆ ئەڵمانیا، بەبێئەوەی هیچ بەرگرییەك لەخۆیان بکەن، بەڵکو بەهۆی ئەو سەرکەوتنە خێرایە دوای لەدوایەکانەوە بوو، کە ئەڵمانیا و سوپای ئەڵمانیا ئەوساکە بەدەستیاندەهێنا.

لەبەرئەوە پارتە سۆسیالستەکان بە تایبەتی لە کۆمەڵگە سۆشیالیستەکاندا دەبینین، لەسەر رۆشنبیرکردن و گەشەپێکردنی تەرزە رەفتارییەکان تاڕادەیەکی زۆر سورن، نەك لەسەر پاگندە بۆ گۆڕانی روکارەکانو تەرزە رەفتارییەکان.

بەراستی مەوداکانی گۆڕانی سیاسیو کۆمەڵایەتیی، پێویستی بە یەکگرتنەوەی نەریتو باوەڕەکان هەیە، بۆ ئەوەی لەسەر رووناکیی ئەو روکارانە دروستبنەوە کە دەبنە هۆی دروستبوونی رەفتاری ئاسایی.

ئێمەش لە کاتێکدا کە بۆ چۆنێتیی بەدەستهێنانی روکار، لێکۆڵینەوە دەکەین، تێبینی ئەوە دەکەین کە لێرەدا، سێ ئاستی بەیەکداچوی

کارتێکەر هەن، کە کاردەکەنە سەرتاك، لەکاتی روکار بەدەستهێناندا، ئەوانە پێیاندەوترێن: سنوردیاریکەرەکانی رۆشنبیریی کەسێتی:-

ئاستی یەکەم: چێوەی گشتی شارستانی:

ئەوەیە کە شارستانییەت روکارە دەروونیەکانی تاکەکان دیاریدەکات، لەمبارەیەوە هەریەکە لە (نیو کەمپ)و(سەفەهلا) لەلێکۆڵینەوەیەکدا کەکردویانە، بۆیان دەرکەوتووە، کەپەیوەندییەکی باش هەیە لەنێوان روکاری منداڵاندا بە رەو کڵێسە، روکاری باوکانیاندا روەو کڵێسە.

هەروەکو چۆن (هۆروتین)، بۆیدەرکەوتووە، کە منداڵانی سپی تەمەن بچوك، بە سەربەستی یاری لەگەڵ منداڵە رەشەکاندا دەکەن، بەبێ ئەوەی هەست بە هیچ جۆرە شەرمەزارییەك بکەن، بەڵام کەمێك کە گەورەبوون زۆر بە خێرایی توشی سزا دەبن لەسەر ئەو بەشداری کردنە لە لایەن باوکانەوە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت هۆی بەشداری نەکردنی منداڵانی سپی پێست لە یارییەکانی منداڵانی رەش پێستدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی باوکانیان لێیان قەدەغەدەکەن.

واتای وایە روکاری چەپەکی دژی رەش پێستەکان، هۆکارەکەی ناگەڕێتەوە بۆ تێکەڵاوی نێوان رەش و سپی، بەڵکو دەگەڕێتەوە، بۆ ئەو پەندوباوەی لەنێوان گەورەکاندا بڵاوە، لەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا.

ئاستی دووەم: تایبەتمەندییەکانی رۆشنبیری:

بەشێوەیەکی گشتی بیروباوەڕی خوێندکاران لەگەڵ روکاری باوکاندایە، بەڵام ئەم رێکەوتە بە تەواوەتی نییە، چونکە تێبینی ئەوە دەکەین زۆر لەخوێندکاران روکارەکانیان بەجۆرێك دەگۆڕن، کەجیاوازییەکی زۆریان

لە باوکانیان هەیە، چونکە روکارەکانیان لەبارەی کۆمەڵایەتییەوە پەسندنیە.

**ئاستی سێیەم: نیشانە جیاکەرەوەکانی کەسێتی:**

ئەم روکارە بە جێگیر دادەنرێت، جێگیربونی روکاریش بریتی نییە لە وەڵامدانەوە تایبەتییەکان، لە هەڵویستە ناتەواوەکاندا، بەڵکو کاکڵەی وەڵامەکان، بەگوێرەی ژمارەیەك لە هەڵویستە لەیەکچووەکان لەبەرئەوە دەتوانرێت روکارەکان بگۆڕدرێن.

**پۆلێنکردنی روکارەکان:**

هەموو کەسێك چەند روکارێکی جۆری و چەند روکارێکی گشتی هەیە،و دەتوانرێت پلەکانیان بپێورێت، ئەمەی دواییان ئەو روکارە بنچینەییانەیە کە کۆنترۆڵی وەڵامدانەوەکانمان دەکەن بەرامبەر بابەتەکانو رۆڵەتە جۆربەجۆرەکان.

هێندێك هەوڵیانداوە کە بیسەلمێنن روکاری جۆری بە جۆری هەڵوێستەکانو سروشتیان دیاریبکەن، لە راستیدا(هارتشۆرن Hartshorn)و (مایMay) هەوڵیان داوە، کە بەڵگەبهێننەوە لەسەر منداڵان، کە گزیو دەستپاکی لەسەر روکاری گشتی نەوەستاوون، چونکە هیچ منداڵێکیان دەست نەکەوتووەکە بە شێوەیەکی بەردەوامی گزیبکەن (کۆپییە)، هیچیشیان دەستنەکەوتووە بە شێوەیەکی بەردەوامی گزینەکەن.

هەروەها دەڵێن/ کە گزیکردنو گزینەکردن، وەستاوەتە سەر سروشتی هەڵوێستەکەو زۆرینەی جار سەر دەوروبەرو رادەی ئەو پێکەرانەی کە لای تاك هەن.

هێندێکی دیکە هەوڵیانداوە، بیسەلمێنن کە روکار گشتییە، تایبەتی یان جۆری هەرگیز نییە، واتا/پێچەوانەی رای پێشو، ئەوەش لەبەر

ئەوەی کەکارکەرێکی ووشك لە کەسێیەکەدا هەیە، کۆنترۆڵی روکارە کۆمەڵایەتییەکان و پەیهە ستییەکان لەسەر یەك ئاست دەکات.

بۆنموونە/فەرانکل زنجیرەیەك وێنەی مامناوەندی پشیلەو سەگی نیشانی(١١٠) منداڵدا، تا کۆتایی.

تێبینیکرد کە خاوەن بڕیارە دەمارگرییەکان، تا ماوەیەکی دوور تەماشای پشیلەکانیان بە سەگ دەکرد، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە روکاری دەمارگری و ووشك، کاردەکاتە سەر هەستکردنی تاك.

هەر یەکە لە (کولپ Kulp)و (داڤیدسۆن David Son) سەلماندویانەکە روکارە پارتییە سیاسییەکان گشتین، ئەویش لە رێگەی ئاڕاستەکردنی چەند پرسیارێك بەرەوڕوی (سنورگرەکان-محافظون)و (سەربەستخوازەکان-الاحرار)،بۆ ئەوەی روکاریان بەرامبەر رەگەزی، دەمارگری شۆڤێنیەت،و هەڵوێستیان بەرەوڕوی ئەمپریالزم و چەکدارکردن، و ئاشتی جیهانی بزانن، بۆیاندەرکەوت کە سنورگرەکان، بەردەوامبوون لەسەر روکارە سنوردارەکانی خۆیان، بەدرێژایی وەڵامدانەوەکانیان، بەڵام سەربەستخوازەکان، بەردەوام روکاریان سەربەستانەبوو.

هەروەها (هارتلی Hartly ) لەکاتی تاقیکردنەوەکانیدا بۆیدەرکەوت کە ئەوکەسانەی نیشانەی دەمارگرییان دژ بە پێستڕەشەکان، تێدا هەیە، هەمان نیشانەیان دژ بە جولەکەو رەنگاوڕەنگەکانو دژ بە هەموو بێگانەیەك تێدا هەیە.

بۆ نموونە/ کابرای لێکۆڵەر چەند ناوێکی گەلی خەیاڵی خستە لیستی ناوی گەلانەوە، وەکو/ گەلی (لەکل)، (دامیزان)، دەمارگرەکان، دژی ئەوانە دەمار گرتیانی.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە روکاری ووشك، روکارێکی گشتیە، جاری وا هەیە روکارەکە گشتی دەبێت، ئەگەر ئەو کەسەی کە دەمارگربێت، دەمارگردەبێت بەرامبەر جولەکەیشو عارەبیش، دژی هەموو بێگانەیەك دەبێت، جاری واش هەیە جۆری دەبێت، واتە دەمارگردەبێت تەنها بەرامبەر یەك کۆمەڵ.

جاری واش هەیە روکار راستەکی، یان چەپەکی دەبێت، قبوڵ وپشتگیری، بەراستەوانە دادەنرێت، بەڵام وەرنەگرتنو بەرهەڵستی بەچەپەوانە دادەنرێت.

جاری واش هەیە روکار کۆمەڵی دەبێت، واتا/ تەنها لەلای یەك کۆمەڵ دەبێت، جاری واش هەیە تاکی دەبێت، تەنها لای تاکە کەسێك دەبێت هەروەکو چۆن جاری واش هەیە نهێنیی دەبێت، یان ئاشکرادەبێت، یان روکار بەشدەکرێت بۆ روکاری بەهێزو روکاری بێهێز، روکاری بەهێز دەبێتە هۆی بەرهەڵستی، یان پێداگرتنی توند، بەڵام بێهیز وا لە تاك دەکات کە نارەزایی هەڵوێستێکی تایبەتی بکات، بە بێئەوەی هەڵچێتو داواڵێت.

دەروونزانی کۆمەڵایەتی گرنگیداوە بە زانینی پلەی جۆشخواردنی بیرۆکەکانی خەڵکیو راکانیانو رادەی رێکەوتنیان یان جیاوازیان، گەشەپێکردنیان لەگەڵ یەکتریدا روکارو بیرۆکە رێکەوتووەکان کەسێتیەکی بەهێزو بەڵگەدارو پالاوتەو سەلمێندراو دەگەیەنن، بەڵام رابچڕبچڕەکانو دژبەیەکەکان، بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەوکەسە، کەسێتیەکی لاوازی هەیە، و روکاری تاکەکانی دەورروبەری کاردانەوەی زۆریان لەسەری هەیە.

**پێوانەی روکارەکان:-**

پێوانەکردنی روکارەکان گرنگن بەلایەن دروستبوونی رایگشتیەوەو کاردانەوەی پروپاگندەو راگەیاندن لەسەری زۆر گرنگن. پێوانەکردنی رای گشتی لەلایەن( ترستونThurstone)ەوە لەدەوروبەری ساڵی ۱۹۳۰دا دەستی پێکرد.

لە ساڵی ۱۹۳۵دا پەیمانگەی (جالوب-Galop) بۆ روونکردنەوەی راکانو پێوانەکردنی دروستکرا، ئەو کاتە دەرکەوت کە پێویستە لە نێوان دەروونزانی گشتیو دەروونزانی کۆمەڵایەتیدا، بۆ پێوانەکردنی روکارە تاکیو کۆمەڵییەکان، هەرەوەزی هەبێت، روکارەکان بەهۆی پەیژەیەکەوە دەپێورێت، کە دووخاڵی هەیە، یەکەمیان ئەوپەڕ پلەی رەزامەندیو پەسندی دەنوێنیّ، ئەویدیکەیان ئەوپەڕیلەی نەیارییو بەرهەڵستی دەنوێنێت، لە ناوەڕاستیشدا خاڵێك هەیە بێلایەنی دەنوێنێت، ئەم خاڵە روودەکاتە لای راست بەرەو قبوڵو رەزامەندی زیاتر، رویش دەکاتە لای چەپ بەرەو وەرنەگرتنو نارەزایی زیاتر.

بەرەو رەزامەندی ⟵⟵ بێلایەنی ⟶⟶ بەرمو نارەزایی

بەرەو رەزامەندی تەواو × ———— × ———— × نارەزایی تەواو

بە راستی هێندێك زانا پەسندی پێوانەکەو رادەی کەڵکەکانیان راوێژکردووە، بۆ ئەوەی جیاوازییە جۆرییەکان، بە شێوەیەکی چەندی دەربڕن، واتا چۆنێتی پێوانەی روکارە سروشتدارە جۆربەجۆرەکان بە شێوەیەکی ئەندازەیی دەربڕێت، چونکە جاری واهەیە گرفت بۆ تۆژیارەکە دەردەکەوێت، لەکاتێکدا چەند وەلامێك دەخرێتە بەردەم کەسی لێتۆژراو، داوای لێدەکرێت، ئەو وەلامە هەلبژێرێت کە لەگەڵ راوبیروباوەڕیدا دەگونجێت، ئەوکەسە لەوەلامدا دەڵێت/ بەراستی من

نەبەتەواوەتی رازیم، نەبەتەواوەتیش نارازیم لەگەڵ ئەم وەڵامانەدا، چونکە رای من لەگەڵ وەڵامەکانی نێو ئەم فۆرمەدا، رێناکەوێت.
واتا رای من ووردەو ئاشکرایە، دەتوانم بەشێوەیەك دەری برِم لەو شێوە دەربرِینە نەچێت کە لەنێو فۆرمەکەدا هەیە.
لەبەرئەوە پێویستە ئەو کەسە تێبگەیەنرێت کە راکانی بەرِێزن، بەڵام ئامانج لە پرسیارەکان تەنها زانینی رای گەورەترین ژمارەیە بە کێشە دیاریکراوەکە، لەبەرئەوە کەسێتی لێتۆژراوەکان خۆیانمان بەلاوە گرنگیی نییە، بەڵکو تەنها راکانیان وەردەگرین.

## رێگا زانستیەکانی پێوانەی روکار:

روکارەکان بە راوەرگرتن لە نموونەیەك لە خەڵکی دەپێورێن کە لە نێوان ژمارەیەکی زۆر تاکەکانی کۆمەڵگە لێکۆڵراوەکە هەڵدەبژێردرێن، ئەم راوەرگرتنەش پشت بە ژمارەیەکی ئەوتۆ لە پرسیار دەبەستێت، کە لە دەوری بابەتێکی دیاریکراو دەسورِێنەوە، دوای ئەوە وەڵامەکان دەخرێنە بەرچاوو دیاریدەکرێنو ئامادەدەکرێن، بۆئەوەی بە شێوەیەکی ئامارییانە شیتەڵبکرێنو بگەیەنرێنە ئەنجامی مەبەست.
لە وانەکانی پێشوودا، گرنگی راوەرگرتنمان، وەکو/ ئامرازێکی لێتۆژینەوەی دەروونزانی کۆمەڵایەتی باسکرد.
لێرەدا چەند رێگەیەکی راوەرگرتن هەن وەکو/ هەڵبژاردن، پلەدارکردن، ریزکردن، بەراووردکردن، جوتە بەراوورد، رێگە تاقیکراوە پەیژەییەکان، رێگەی پێوانەکردنی پاڵنەر، رێگەی تێبینیکردنی رەفتاری راستی.
**١-هەڵبژاردن:** راوەرگرتنێکە لە بارەی کۆمەڵێك ناوەوە، یان بابەتەوە وەردەگیرێت، کاتێك لێکۆڵراو نزیکترینیان لە روکارێوە هەڵدەبژێت، دوای ئەوە دەنگەکانی هەر باسێك لە باسەکانی راوەرگرتن، بەگوێرەی

ڕێژەی سەدی دەنگەکان، دیاریدەکرێن، دوای ئەوە بابەتەکان بەگوێرەی نرخاندنی ئامارەییان، بەگوێرەی ڕێژە جیاجیاکانیان پۆلێندەکرێن.

ئەم ڕێگەیە بە ئاسانی جێبەجێدەکرێت، خێرایشە، لەبەرئەوە بە شێوەیەکی بەربڵاو بەکاردەهێنرێت، بەتایبەتی لە هەڵبژاردنی ڕامیاریدا.

بەڵام ئەو ناتەواوییەی هەیەئەوەیەکە جیاوازییەکی وورد لەنێوان بابەتەکاندا ناکات.

<u>٢-پلەدارکردن:-</u>

ئەمە پێویست دەکات، ڕادەی ڕوکارەکە پلەداری یەك لەدوای یەك لە (ئەرێوە) بەرەو (نەرێ) یان بە پێچەوانەوە بکرێت، بۆ نموونە/ ڕەزامەندم، یان تا ڕادەیەك ڕەزامەندم، ڕەزامەندنیم، تاڕادەیەك ڕەزامەندنیم، بەتەواوەتی ڕەزامەندنیم، یان نازانم دوای ئەوە ژمارەی ئەو تاکانەی (ئەگەری) یەکەمیان هەڵبژاردووە سەرژمێریدەکرێن، هەروەها ئەو تاکانەی( ئەگەری) دووەمیان هەڵبژاردووە سەرژمێریدەکرێن، دوای ئەو ڕێژەی سەدی هەر (ئەگەرێك)، بە جیا دەردەهێنرێت.

<u>٣-ڕیزکردن:</u>

بە کورتی ئەم ڕێگەیە ئەوەیە، ئەو کەسەی چەند بابەتێکی بۆ دەخرێتەڕوو، داوای لێدەکەیت، ئەو بابەتانە بەگوێرەی ڕوکاری خۆیین، یان بەگوێرەی ڕوکاری خۆینین ، ڕیزیانبکات، بۆ نموونە/ داوا لە لێکۆڵراوەکە دەکەیت، کە ئەم وانانە بەگوێرەی ئارەزوکردنیان ڕیزبکات، بەڵام دەبێت لە خۆشەویستترینیانەوە بۆلای خۆی دەستپێبکات، لە ڕقلێترینیانەوە لێبێتەوە.

(کۆمەڵناسی، ڕۆژنامەگەری، فەلسەفە، مێژوو، زمانی ئینگلیزی).

دوای ئەوە، مامناوەندی نمرەکانی وەڵامی تاکەکان دیاریدەکرێت، دوای ئەمە شیتەڵێکی بیرکارییانە دەکرێت، بۆ ئەوەی لەسەر بنچینەیەکی زانستیانە دابمەزرێت.

یەکێك لەرەخنەکانی ئەم رێگەیە ئەوەیە، کەشێوەی ئاراستەکردنی پرسیارەکان کاردەکاتە سەر رای تاکە وەڵام دەرەکە.

**٤-رێگەی جووتە بەراوورد:-**

ئەم رێگەیە لەناخی خۆیدا پشت بە جوتەبەراوورد، دەبەستێت، واتا هەر پرسیارێك لە راوەرگرتنەکەدا، بەراووردی دوشت لەخۆی دەگرێت، داوا لە(لێکۆڵراوەکە) دەکرێت فەزڵی یەکێکیان بدات بەسەر یەکێکی دیکەیاندا.

**٥-رێگەی تاقیکراوە پەیژەییەکان:-**

ئەم رێگەیە بریتییە لەوەی کەشارەزاکان کۆمەڵێك پرسیاردادەنەن، هەرپرسیارێك و هێمایەکی تایبەتی بۆ دادەنەن، واتا پەیژەیەك بۆ روکارەکان دادەنێن، بۆ ئەوەی رادەی لایەنگری کەسەکە، یان لایەن نەگری بزانن، هەروەها رێژەکەیشی، بەگوێرەی رێژەی کەسانی دیکەوە بزانن.

ئەو پەیژانەی کە روکاری پێدەپێوین، جۆریان زۆرە

١-٥- <u>پەیژەی بۆ کاردۆس (مەوداکانی کۆمەڵایەتی)</u>: بۆ پێوانەی روکارەکانی رەگەزی، بۆ زانینی پلەی پاڵپشتی خەڵکی بۆ کەمایەتییە رەگەزییە جۆربە جۆرەکان، بۆ کاردۆس ئەم پەیژەیەی لە ساڵی ١٩٢٥دا، دانا، ساڵی ١٩٢٨ جێبەجێکردوکاری پێکرد، کاتێك کە حەوت جۆرە وەڵامی پلەداری لەسەر ئەم پرسیارە تێدا نیشاندا.

پ١-ئایە قبوڵ دەکەیت بەئارەزووی خۆت تێکەڵاوی ئەم رەگەزانە بکەیت؟

ئینگلیز، ئیرلەندی، فەرەنسی، ئەلمان، ئەسپان، ئیتالی، تورك، زنجی، هندی، بەیەکێك، یان چەند ژمارەیەك لەم هەڵوێستانە:-

١/دروستکردنی چەند پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی ژنوژنخوازییەوە.

٢/ئەندامێتی لەو یانەیەی، ئەمیشی تێدایە.

٣/ماڵەکەیان بە پاڵی ماڵەکە مانەوە بێت(دراوسێتی).

٤/لەفەرمانگەکەی مندا کاربکات.

٥/وەکو من هاولاتییەك بێت لەشارەکەم.

٦/تەنها بۆ گەشت هاتبێتە وولاتەکەم.

٧/دەرکریۆ دوربخرێتەوە لەوولاتەکەم.

**ئەو ڕەخنانە لە پێوانەی بۆ کاردۆس، دەگیریت:**

١-ئەنجامەکانی ئەم پێوانەیە: ئەنجامەکانی چەند پێوانەیەکی دیکە دەنوێنێت، ئەو کۆمەڵە پێوانانەش هەریەکەیان پێوانەی گەلێکە لە گەلان، کە لە حەوت یەکە پێکهاتووە.

٢-یەکەکانی ئەم پێوانەیە پلەکانی وەك یەکنین، ئەومەودایەی لەنێوان بەندی یەکەمو دووەمداهەیە، گەورەترە لەو مەودایەی لەنێوان بەندی دووەمو سێەمدا هەیە.

٣-ئەوکەسەی کەرەزامەند بێت لەسەر یەکەی یەکەم، بەشێوەیەکی ئاسایی ڕەزامەندە لەسەریەکەکانی دووەمو سێەمو چوارەمو پێنجەم چونکە زۆرجار وایە ئەوکەسەی کە دەیەوێت کچۆڵەیەك لە ڕەگەزێکی دیکە ماره‌بکات، قبوڵی ئەوەش دەکات کە ببێتە ئەندام لەیانەکەیشداو لەو شەقامەیشدا نیشتەجێبێت.

لەبەرئەوە ڕێژەی سەدی لە یەکەی پێنجەمدا، بەشێوەیەکی ئاسایی زیاددەکات، بەلام ئەوەی کە لەسەر یەکەی شەشەمو حەوتەم

ڕەزامەنـدبێت، بەشـێوەیەکی ئاسـایی کۆمـەڵێکن لـەو تاکانـەی کـە ئارەزووی دەمارگری ڕەگەزی دەکەن.

٢-٥-ڕێگەی مەودا یەکسـانەکانی( تیرستون Thurstone )[1] : لەڕواڵەتدا لەم ڕێگەیەدا شارەزاکان کۆمەڵە پرسیارێکی روونو ئاشکرا دادەنێن لە (١١) شـانەدا، بـەبێ چـاوڕاو/١,٢,٣,٤,٥,٦,٧,٨,٩,١٠,١١ بـە زیـاتر راسـتەوانە دەستپێدەکات، بەرەو کەمتر تا دەگاتە ئەو شەشەمەی کە بێلایەنە، دوای ئەوە پێنجەکەی دیکە بەدوایدادێت بەشێوەیەکی زنجیرە بـەرەو چـەپەوانە بەرزدەبێتـەوە، ژمـارەی جارەکـانی هـەر خانەیـەك سەرژمێریدەکرێت.

بۆ یەکەم جار (تێرستون) لەگەڵ(شیف-Chafo )دا، بۆ پێوانـەی روکـار بـەرەو کڵێسـە بـەکاریانهێنا/ بـەپێی چـەند نموونەیـەکی دیـاریکراو بەکاریان هێنا، ئەوانەش:-

١١\٥ هەستدەکەم کەکڵێسە گەورەترین دەستگایە لەجیهاندا.

٥\٥ جار بەجارێك هەست دەکەم کەکڵێسە نرخێکی هەیە، جاری واش هەیە گومانم دەبێت لەوە.

١٠\٦ وادادەنێم کە کڵێسە مشەخۆرە لەسەر کۆمەڵگە.

نمرەکان ئاماژە بۆ ئەو نرخەدەکەن، کە دادوەرەکان داویانە بەم سێیە، بەلایەن دەربڕینی لەسەر لەگەڵابون، یان لەگەڵانەبوون.

بـەگوێرەی ئـەم ڕێگەیـە لێکۆڵەرەکـە نیزیکـەی سـەد رسـتە کۆدەکاتـەوە، بـەباوەڕی خـۆی رادەی پەسـندیو ناپەسـندی، لەوپـەڕەوە تـا ئەوپـەڕی

[1] لویس تیرستۆن (١٨٨٧ — ١٩٥٥)، زانایەکی ئەمریکییە، بەوە بەناوبانگە کە پەرەی بە پێوانە زیرەکییەکان داوە، بەناوبانگترین پەرتوکەکانی: ١- سروشتی زیرەکی ٢- توانستە زیرەکییەکانی بەرایی ٣- چەند لێکۆڵینەوەیەکی زیرەکیی. — و -

دەردەخات، دوای ئەوە نیشانی کۆمەڵێك لە شارەزایان دەدرێت، کە ژمارەیان لە نێوان (١٥-٣٠) کەس بن.

ئەوکاتە داوایان لێدەکرێت ئەم رستانە، دابەشکەن بەسەر هەر(١١) یانزە خانەکەدا، بەجۆرێك ئەو رستانەی کە زیاتر پەسندی لە خۆیگرتووە، لە کۆمەڵەی یەکەمدا دادەنرێت، ئەوەی کە زۆر ناپەسندیو قبوڵنەکردنی لەخۆی گرتووە لە کۆمەڵەی یانزەهەمدا دەدەنرێت، ئەوەکانی دیکە دابەشدەکرێن بەسەر کۆمەڵەکاندا بەپێی پلەی پەسندیو ناپەسندییان.

ئابەم جۆرە هەر رستەیەك شوێنی خۆی لەنێواندا دەگرێت، ئەوکاتە زۆر بەئاسانی دەژمێررێت، هەموو رستەیەك بەگوێرەی پەسندکردنیو پەسندنەکردنی نمرەی مامناوەندی، ناوەڕاستی بۆ دادەنرێت.

ئەوگرفتەی کە لێکۆڵەر لێرەدا توشیدەبێت، ئەوەیە کە ناوبژیوانەکان لەسەر هێندێك رستە رێدەکەوون، بەڵام توشی ناکۆکیدەبن لەسەر هێندە رستەیەکی دیکە، ئەوکاتە رادەی جێگیری ئەم رستانەی دوایی گەورە دەبێت، بەجۆرێکی ئاوەها پێویست دەکات، لە پێوانەکە هەڵگیرێن دەتوانین پێوانە بۆ دەربڕینە پەرتەکان مسۆگەربکەین.

دەتوانین بگەینە ئەوەی کە (٢٠-٣٠) دەربڕین هەڵبژێرین، بە یەك ئەندازە لەیەکەوە نزیکبن.

دوای ئەوە دەربڕینە هەڵبژاردراوەکان لە سەرەتاوە لە لیستێکدا دادەنرێن، لەسەر نموونەیەك جێبەجێدەکرێت، بۆئەوەی بزانین دەگونجێن لەگەڵ ئەوەی کە مەبەستمانە بیپێوین، دوای ئەوە ناوەڕاستی هەموو ئەو کێشانەی کە تاقیکراوەکە وەڵامیداوەتەوە، وەردەگیرێت، ئەو ناوەڕاستە نمرەکەی دیاریدەکات.

خراپییەکانی ئەم پێوانەیە، هێندێکیان ئەمانەن:-

١-هەوڵێکی زۆری دەوێت لەلایەن ناوبژیوانەکانەوە، بۆ ئەوەی بگەنە کێشی هەردەر برینێك، لەودەربڕینە زۆرانەی، کە دەست بە بەش بەشکردنی دەکرێت، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا پێوانەکە لەخۆیان بگرن.
٢-یارمەتیوەرگرتن لە ناوبژیوانە لایەنگرەکان، یان دەمارگرەکان، کاردانەوەی دەبێتە سەر پێوانەکە، هەرچەند ئەو لێکۆڵینەوە زۆرانەی کە لەم بارەیەوە کراون دژاودژن، لەبەر ئەوە پێویست بە لێکۆڵینەوەی زیاتر دەکات.
٣-لەوانەشە ئەو دەربڕینە وەکیەك لەیەکدورانە، کەلە چاوی ناوبژیوانەکاندا وەك یەك، لەیەکدور بن، بەڵام لەچاوی تاقیکراوەکاندا وەك یەك لەیەکدور نەبن، یان هەر لەراستیدا وەك یەکنەبن.
٤-دەگونجێت پلەی مامناوەندی کەسێك نیزیك بێت، یان وەکو پلەی مامناوەندی کەسێکی دیکە وابێت، لەگەڵ ئەوشدا بەڵگەیاندنی هەردو پلە مامناوەندییەکە لەیەك جیاوازبن.
٥-زوربەی زۆری بابەتەکان (کێشەکان) بەلای هەر پەرێکدا (طرف)، شۆڕدەبنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، ناوچەی ناوەڕاست بەچۆڵی دەمێنێتەوە، هەروەکو چۆن کێشە نادیارەکان، یان ئەو کێشانەی کە کەمتەرخەمیی، یان جێنەگیری لەسەر رایەکی تایبەتی دەردەبڕن، شۆڕدەبنەوە بەلای ناوچەی بێلایەندا، لەوێ کۆدەبنەوە.

٣-٥- رێگەی( لیکرات- Likert ) ١٩٣٢

به ئاسانیو جێگیریی ئەنجامەکانی لە رێگەی پێشو باشتر جیادەبێتەوە، روکارەکانی بەگوێرەی ئەم رێگەیە لە پەیژەیەکدا دەکرێتە(٥) پێنج پلەوە، ئەوانیش: رەزامەندم، راڕام، ناڕازیم، زۆر ناڕازیم، دژم.

**٤-٥-ڕێگەی(جۆتمان-Guttman)**

کورتــەی ڕێگــەی جۆتمــان، هەوڵدانــە بــۆ دۆزینــەوەی پێوانەیــەك وەکو/پێوانەی دیاریکردنی هێزی بینین وا بێت، بۆ نموونە: ئەگەر وتمان کە (زید) هێزی بینینەکەی ٦\٦ واتای وایە لەسەروی ٩\٦، ١٢\٦، ١٥\٦، ١٨\٦.

بۆنموونە/

١-ئەوەی هەڵگری بڕوانامەی زانکۆ بێت، واتای وانییەکە ڕۆشنبیرە.

٢-ئەوەی هەڵگری بڕوانامەی دواناوەندیی بێت، نایکاتە کەسێکی ڕۆشنبیر.

٣-ئەوەی هەڵگری بڕوانامەی ناوەندی بێت نایکات بە ڕۆشنبیر.

٤-ئەوەی کە هەڵگری بڕوانامەی سەرەتایی بێت نایکاتە ڕۆشنبیر.

٥-نەخوینەوار بە ڕۆشنبیر دانانرێت.

ڕستەیەك واتای ڕستەکانی دوای خۆی بەتاڵدەکاتەوە

ئاوەها لەڕێگەی ئەم لێکۆڵینەوانەی کە بە ئامێری وێنەگرتنێکی وا دادەنرێت، ڕوکاری سیاسی یان ئاینیی کەسەکانمان پێئەزانێنێت، لە ڕێگەیشێوە دەتوانین بگەینە، هەڵوێستە جۆربەجۆرەکانو ڕوکاری خەڵکی، هەروەها دەتوانین بگەینە زانینی جیاوازییەکان لەنێوان هەڵوێستەکانی ڕوکارەکانی کەسەکاندا.

پەیژەکە کاتێك ڕاست دەردەچێت، کەڕوکاری کەسەکە، لەگەڵ ڕەفتاریدا بگونجێت.

**٦-ڕێگەی تێبینی کرداری:**

واتا تێبینیکردنی ڕەفتاری ڕاستی تاکەکان، هەرچەندە ئەم ڕەفتارە، هەمیشە بیرکردنەوەو ڕەفتاری کەسەکە دەر نابڕێت.

### ٧-ڕێگەی پێوانەی پاڵنەر:

بریتییە لەوەی کە راڤەی هێندێك وێنەو دیمەن بەسەر بەستییەکی زۆر تەواو دەکرێت، ئەمانەش کە راڤە دەکرێن وەکو هاندەرێك وان کە پاڵ بە لێکۆڵراوەکەوە بنێت، بۆ ئەوەی کەسێتی خۆی لەدوتوێی راڤە کردنەکەوە دەرخاتو دەربڕێت، وەکو (رورشاخ Rorschach)و (تەماتیك Thematic) کەچەند نموونەی دیمەنێکی دەستبەتاڵیو خۆنیشاندانو شەڕو داماوی دەردەخەن...هتد.

لەرێگەی ئەم دیمەنانەوە دەتوانین روکارەکانی کرێکاریو چالاکی سەندیکاکانیان بناسینەوە.

### دیاریکردنی جێگیری روکارەکانو راکان

مەبەست لە جێگیری روکار (Consistence) ئەوەیەکە روکارەکە، یان راکە، یەك لۆجیکی لەباری هەیە، بابەتی جێگیری راکان زۆر گرنگە، چونکە کارێکی نائاساییە، ئێمە ئامێرێك دانێین بەشێوەیەکیو ورد، روکارەکانو راکان بپێوێت، کەچی روکارەکانو راکان خۆیان دیارو جێگیرنەبن.

کاتبەفیڕۆدان، ئەگەر پەیژەیەك بۆ(را)دا بنێین، خەڵکی بەگوێرەی ئەو پەیژەیە رای خۆیان دەربڕن، کەچی راکان خۆیان جۆشدراووجێێگیر نەبن، واتا پێویستە کە تەماشای کێشەی جێگیری (را) بکەین، پێش ئەوەی هەستین بەهەر پشکنینو پێوانەیەکو بیکەین بە زانستو، یارمەتیمنبدات بۆ ئەنجامگیریو پێشبینیکردن. لەراستیدا سنورێك هەیە بۆ لای خواروی جێگیر نەبوون لەراکانو روکارەکاندا، ئەمە یە دەیانڕەگێنێت بە رەنکی نادیاریی، یان دژایەتی کردنی هێندێکیان بۆ هێندێکیان.

جێگـر نـەبونیش بـەگوێرەی سروشـتی پرسـیارەکان و چـۆنێتی ئاراستەکردنیان و بەگوێرەی سروشتی دەوروبەرەکە زیادوکەم دەکات.
ئـەم جـێگیر نەبونـەش بەشـێوەیەکی گشـتی بـۆ دوو کۆمەڵـە هۆکـار دەگەڕێتەوە:

۱-هۆکارە دەرەکییەکان

۱-۱- ئەو هۆکارانەی کە بۆ لێکۆڵەر دەگەڕێتەوە.
۲-۱- ئەو هۆکارانەی کەبۆ کەسی لێکۆڵراوەکە دەگەڕێتەوە.
ئـەو هۆکـارە دەرەکییانـەی کـە بـۆ لێکۆڵـەر دەگەڕێتـەوە، وەکـو/ ئـەوەی پرسـیارەکانی ئاشـکراو دیارنـەبن، یـان راوەرگرتنـە کـە بەتـەنها یـەك پرسیاردەکرێت، بەڵام وەڵامەکەی نادیار بێتو چەند وەڵامێکی گرتبێتە خـۆی، وەکـو ئـەو پرسـیارەی کـە پەیمانگـەی ئـەمریکی بـۆ رای گشـتی ساڵی۱۹٤۳، بۆ راوەرگرتن کردی، کە دەڵێت/ ئایە ئارەزوی چاکسازی دەکەیت، دوای جەنگ لە ئەمریکا، یان حەز دەکەیت وڵات وەکو خۆی بمێنێتەوە؟
هێنـدێك کـەس وای تێگەیشـتن کـە مەبەسـت چاکسـازی ناوخۆییـە، هێندێك وای تێگەیشتن کـە مەبەست چاکسـازی دەرەکییـە، هێنـدێکی دیکـە وای تێگەیشـتن هونەرییـە، هێنـدێك وایـان دەزانـی مەبەسـتی چاکسازی سیاسییە، یان ئابوورییە...هتد.
لەبەر ئەوە پرسیارەکە، پێویستە تەنها یەك روکار بگرێتەوە، باشترین پرسـیارئەوەیەکە، کۆمەڵـە پرسـیارێك بێـت لەبەرئـەوەی، یەکـەم روونکردنـەوەی زیـاتر تێدایـە، دووەم بەهۆیـەوەو روکاری راستەقینەی کەسەکەیش دەزانرێت.
بەلایـەن لێکۆڵراوەکەیشـەوە، لەوانەیـە کەسەکە (رایـە)کی دیـاریکراوی هـەبێت، بـەڵام نـەتوانێت دەربڕێـت، لـە قورسـی بـاری زمانەکـەدا، یـان

لەبەرئەوەی پڕکێشینەکات دەریبڕێت، بە شێوەیەکی ئاشکرا، لەبەرئەوە پێویستە متمانەی ئەوکەسە بەدەستبهێنیتو یارمەتیبدرێت لەسەر دەربڕین.

**٢-هۆکارە جەوهەرییەکان**: ئەمانەش دەبنە سێ بەشەوە:-

١-٢-وەڵامی کەسەکە لەسەر پرسیارەکان دژاودژ دەکەوون.

٢-٢-بیرکردنەوەی کەسەکەو رەفتارەکانی دژاودژنو لەیەکناچن، ئەوکەسانەی کە رەفتارو بیرکردنەوەیان یەکێکین زۆر کەمن.

٣-٢-وەڵامەکان جۆشخواردنی لۆجیکیان تێدانییە، چونکە راکانی کەسەکە دژاودژن، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەکە، لەبەرئەوەیە کە کەسە لەکاتی تاقیکردنەوەکەدا هەست بەگرفتەکە دەکات، یان چ شێك فێردەبێت لەپێشدا نایانزانێت، یان لەبەرئەوەی کە کەسێتیەکی لاوازی هەیە، دەوروبەرەکەی زوو کاریتێدەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا بەگوێرەی بەرژەوەندیو نەریتی ئەو جیاوازن، وەکو/ئەوەی خۆی بازرگان بێتو ژنەکەی فەرمانبەر بێت، ئەو کاتە راو، روکاری دوژینگەی جیاواز دەردەبڕێت.

جاری وا هەیە لێکۆڵراوەکە وەڵامی هەڵەو ناراست دەداتەوە، چونکە باوەڕی بەلێکۆڵەرەکە نییە.

ئەوە سەیرە تێبینیکراوەکە وەڵامە هاودژەکان لای خەڵکی دەشت زۆرن، نەك لای خەڵکی شار، بەتایبەتی کاتێك کەپرسیارەکان، وەڵامەکانیان لەبارەی ئەو شتانەوەیەکە کەڵکی تایبەتییان تێدانییە، یان بەشێوەیەکی راستەوخۆ دورن لە شارەزایی کەسیەوە.

بە کورتی/ جۆشخواردنی راکانو جێگیربونیان لە دەروونزانی کۆمەڵایەتیدا، پەیوەندییان بە روکاری تاکەوە هەیە.

ئەم روکارەیشی لای کەس جێگیرو بەردەوام نابێت، لای ئەو کەسانە نەبێت، کە کەسێتییان بەهێزە، بەڵام لای کەسانی بێجگەلەوان، بۆ ماوەیەکی کەم بەردەوامدەبن، چونکە روکار هەرچەند پەیوەندی هەیە بە کەسێتی تاك و تایبەتمەندییەکانێوە، لەگەڵ ئەوەشدا نیشانەیەکی رێژەییە، واتا/ پێویستدەکات پەیوەندی هەبێت لە نێوان کەسەکەوکارەکەدا.

٣-دابەشکردنی راکان یان پۆلێنکردنیان

راکان چەند واتەیەکیان هەیە لە دەوروبەرێکەوە، بۆ دەوروبەرێکی دیکە دەگۆڕێن، لێرەدا کۆمەڵە کارتێکەرێك هەن کە ئەو رایانە دیاریدەکەن، وەکو/ نیشتمان، ئاین، هۆز، پارتی سیاسی، پیشە، نیشتەجێ...هتد. واتا/ راکانی تاك بەو کۆمەڵەی یان بەو تاقمەی کەپاڵپێوەداون دیاریدەکرێت، لەبەرئەوە پێویستە لەکاتی گەڕاندا بۆ پۆلێنکردنی راکان، لەسێ لایەنی گرنگ بکۆڵنەوە، ئەوانیش ئەمانەن:-

١-٣/ گرنگی پۆلێنکردنەیاندا، بەشکردنی راکان.

٢-٣/ رێگەی دابە شکردنی راکان.

٣-٣/ واتای کۆمەڵایەتی بۆ دابەشکردنی راکان.

**١-٣/ گرنگی دابەشکردنی راکان**

بۆ ئەوەی خشتەیەکی باشمان بۆ راکانی کۆمەڵە کەسێك دەستکەوێت، پێویستە پەیژەی رای یەکەم، ئەو رایانەبگرێتە خۆی کە زۆر لەگەڵدان، پەیژەی دووەم ئەو رایانە بگرێتە خۆی کەلەگەڵدان، سێیەمیان ئەو رایانە بگرێتە خۆی کەبێلایەنن، چوارمیان، ئەو رایانەی کەدژن، پێنجەمیان ئەوڕایانەی کەزۆر دژن.

واگریماندەکەین رای(١٠٠) سەدکەسمان لەبارەی هەڵوەشاندنەوەی تاقیکردنەوەکانی وەرزی وەرگرتووە، کۆمەڵەی یەکەم(٣٥) خوێندکارە،

کۆمەڵـەی دووەم(٤٠)چـل خوێنـدکارە، کۆمەڵـەی سـێیەم(٢٠) بیسـت خوێنـدکارە کۆمەڵـەی چـوارەم (٣)سـێ خوێنـدکارە، کۆمەڵـەی پێنجـەم تەنها(٢) دوو خوێندکارە.

ئەگـەر رای ئـازاد نـاو، لەئـەو کۆمەڵـەی کـە زۆر لەگەڵـدان، واتـای وایـە ناوەکەی لەریزی ئەوکۆمەڵەدا، دادەنەین کەزوربەی زۆریان داوای هەڵوە شاندنەوەی تاقیکردنەوەکە دەکەن، بەڵام پێنجەم لـەم حاڵەتەدا، رایەکی دەرەکـی هەیـە، لـەم کۆمەڵەیـەدا، ئـەوە کـارێکی سروشـتیە، ئەگـەر ویسـتمان رای کەسـێك پـەووردی بپێـوین، پێویسـتە لـەریزی راکانـدا دیـاری کـەین و لەناوکۆمەڵەکـەدا، ئەمەیارمـەتی ئـەوە دەدات، کـە بـۆ لیستکردنەکە بۆ ژمارەیەکی دیاریکراو بێت.

مـادام وایـە گرنگـی دابەشـکردنی راکـان، لـەوەدا دەردەکـەوێت کـەتاك شـوێنەکەی دیـاری دەکرێـت، لـەنێو کۆمەڵەکەیـدا، لەلایـەکی دیکـەوە، چۆنێتی دابەشکردنی راکان دەردەخات لەلای ئەو کۆمەڵە.

## ٢-٣-چۆنێتی دابەشکردنی راکان لەنێو کۆمەڵەکەدا:

دەتوانین راکان بەشێوەی خشتە، یـان هێڵـی سەرولێژە دابـەش بکـەین، خشتەکە بەدابەشکردنی بەسەر چەند تاقمێکدا، رێکدەخرێت، ئەویش لەرێگـەی کێشـانی دوو گۆڵـەوە، یەکـەمیان مەوداکـە، یـان کۆمەڵـەکان دەردەخات دووەمیشیان، ژمارەی جارەکان.

| کۆمەڵەکان | زۆر رەزامەندم | رەزامەندم | بێلایەنم | دژم | زۆردژم |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی کەسەکان | ٣٥ | ٤٠ | ٢٠ | ٣ | ٢ |

یـەکێك لـەکارە گرنگـەکان لـەدەروون زانـی کۆمەڵایەتیـدا ئەوەیـە، کـە دابەشـکردنی بـەگوێرەی تەمـەن، یـان توخم، یـان پیشـە، یـان مەزهـەب و یـان رۆشـنبیری دەبێـت..هتـد، لەبـەر ئـەوە جـاری وا هەیـە لـەنێو دابـەش کردنـی سـەرەکیدا، دابەشکردنی ئاوەنجیش دەبێت.

بەڵام هێڵی سەرەولێژە، جاری واهەیە لەسەر شێوەی پلەکانیی دوبارە دەبێتەوە(Histogramme)، یان لەسەرشێوەی هێڵی سەرەولێژە خۆی دەبینێتەوە.

## پلەی دوبارەبووەکان:

بەکێشانی تەوەری ئەستونی دەبێت، ئاسۆکەیان دابەشدەکرێت بۆ چەند مەودایەك(سەلەف)، یان چەند لاکێشەیەك بەتەنیشت یەکترییەوە، بنچینەکەی ئەو کۆمەڵەیان ئەو رایانە دەنوێنێت کە لەیەك جیاوازن.

بەڵام تەوەرە ئەستونییەکە، ئەوە دوبارەکانی(ژمارەی کەسەکان) لەسەر دادەنرێت، یان لەسەر شێوەی رێژەی سەدی، یان لەسەرشێوەی هێمای بەرەلا، کەهەموو راکان، یان کەسەکان دەردەخات، ئاوەها ریزە لاکێشەیەك بەدەست دەهێنین، کەبنچینەکانیان جۆرەکانیانی راکان دەردەخەن، بەلام بەرزایەکانیان، ژمارەی ئەوکەسانە دەنوێنن کەراکانمان وەرگرتوون، بەرزترین لاکێشە، زوربەترین رادەگەیەنێت (کەبەرزترین رێژەیە)، یان بلێین رازیادەکان.

کۆمەڵی مەودای لاکێشەکان هەموو یان، هەموو دوبارەکان، یان کۆمەڵی راکان دەگەیەنن.

ئەگەر بەرزایی لاکێشەکان جیاوازییان کەم بوو، ئەوە دەگەیەنێت کە دابەش بونی راکان نیزیکی یەکن، واتا راکان بەشێوەیەکی گونجاوو نیزیك لەیەکتردا بەشبون.

ئەگەر بەپێچەوانەوەبو، واتا جیاوازییەکی زۆر هەبوو لەبەرزی لاکێشەکاندا، واتای ئەوە دەگەیەنێت کەراکان دژ یەکن و لەیەکەوە دورن.

**هێڵی سەرەو لێژە، یان پەلی دوبارە:-**

ئەم بەباشتر لەپلەی دووبارە دادەنرێت، لە حاڵەتێکدا، راکان دابەشبکرێن بەسەر دوو کۆمەڵەدا، یان زیاتر، چونکە لەم حاڵەتەدا، لاکێشەکان تێکەڵاو دەبنو بەزەحمەت بەراوورد دەکرێن لە نێوانیاندا.

دەتوانین هێڵی سەرەولێژ، یان پەلی دووبارەمان لە رێگەی دیاریکردنی کۆمەڵەکانەوە لەسەر تەوەرە ئاسۆیەکە، دەستکەوێت، لە رێگەی دانانی خاڵێك لە ناوەڕاستی هەر لاکێشەیەکدا، لەلاکێشەکانی هێڵی پلەی دووبارە، بە بەرزاییەکە بەرادەی دووبارەکان بێت، بەگەیاندنی نێوان ئەوخاڵانەی خوارەوە، پەلە پێویستەکەمان بەدەسدەکەوێت.

دووبارە بوونەوەی هەر کۆمەڵەیەك، یان هەرتاقمێك، بەتەواوەتیلە مەڵبەندی کۆمەڵەکە کۆدەبێتەوە.

وا باوە کە لە وێنەکەدا، دوو کۆمەڵە بەشکرێت، یەکەمیان بچوکتر لە کەمترین کۆمەڵە دوبارەکە بەشێوەیەکی سروشتی سیفر دەبێت، ئەوەش لەبەرئەوەی پەلی دووبارەکە دابخرێت، چونکە دەکەوێتە سەر تەوەری ئاسۆکە لە هەر مەڵبەندی هەردوو کۆمەڵەکەدا.




لە راستیدا دەتوانین پەلی دووبارەمان لە پلەی دووبارەوە دەستکەوێت، چونکە خاڵەکان بریتین لە ناوەڕاستی بنچینەی سەرەوەی لاکێشەکان لە

پلەی دووبارەدا، ئەو مەودایەی کەکەو تۆتە ژێری پەلی دووبارەوە، هەمان مەودایەکەکەو تۆتەژێری پلەی دووبارەوە.

ئەگەر هێڵی پەلی شکاوە ئامادەکەین، ئەو کاتە هێڵی سەرەو لێژەی دوبارەمان وەدەست دەکەوێت. هیچ مەرج نییە کە سەرەو لێژەکە بە هەموو سەرەکانی پەلە دووبارەکە تێپەڕێت، بەڵکو بەسەکە بەگەورەترین ژمارەی ئەوخالانەی کەدووبارە راستیەکانی کۆمەڵەکاندا تێپەڕێت.

## ٣-٣-واتای دابەشکردنی راکان:

پێویستە جیاوازی نێوان دابەشکردنی تاقیکاریو دابەشکردنی نمونەیی، بزانین.

یەکەم:دابەشکردنی تاقیکاری :- بۆ ئەوەی واتای دابەشکردنی تاقیکاری بزانین، پێویستە واتای سەرەولێژەی دوبارە دیاری بکەین، واتا/ دیاریکردنی بنچینەکەی، بەرزییەکەی، تەختی هەموو لاکێشەیەك لەلاکێشەکانی، دیاریکردنی روبەرەکەی بەشێوەیەکی گشتی، بزانین.

بنچینەکەی/بنچینەکانی لاکێشەکان ئاماژە بۆ درێژی ئەومەودایە دەکەن کە پەیژەی راکەروون دەکاتەوە، واتا/هەموو ینچینەیەکی هەموو لاکێشەیەك بەبێ کۆتایی پڕێتی لەو خالانەی، کەجیاوازییە بێکۆ تاییەکانی راکان لەنێو هەر مەودایەکدا، روون دەکاتەوە.

بەرزاییەکەی/رێژە سەدییەکانی مەوداکان روون دەکاتەوە.

روبەری لاکێشەکان:-بەگوێرەی رێژەی ئەو رایانەیەکە پەیژەکە دەیگەیەنێت.

روبەری گشتی لاکێشەکە/ دابەشکردنی تەواوی راکان، دەگەیەنێت. ئەگەر هەموو لاکێشەیەکی، نێو لاکێشە گشتیەکە، دابەشکەین ئەوکاتە ژمارەیەك لاکێشەمان دەست دەکەوێت، کە بنچینەکەی تەسکتردەبێت،

لە لاکێشەکانی یەکەم، ئەوکاتە دابەشکردنی راکان بەشێوەیەکی وورتر دەنوێنێت، هەروەها دەتوانین لاکێشەکان دابەشبکەین بە بێکۆتایی.

دووەم: دابەشکردنی نموونەیی:- بۆ رونکردنەوەی واتای نموونەیی یان هێمایی (رمزی) پێویستە ئەم خاڵانە روونبکەینەوە:

١-٢/چۆنێتی گواستنەوە لەدابەشکردنی تاقیکارییەوە، بۆ دابەشکردنی هێمایی.

٢-٢/رادەی توانستی لێکدانەوە بۆ دابەشکردنی نموونەیی.

٣-٢/راستییەکانی(الماهیە) دابەشکردنە هێماییە سەرەکییەکان.

١-٢/چۆنێتی گواستنەوە لەدابەشکردنی تاقیکارییەوە بۆ دابەشکردنی هێمایی: دابەشکردنی تاقیکاری، بەسەر دابەشکردنی هێماییدا بەتەواوی جێبەجێنابێت، بە گوێرەی ئەنجامی هەردوولایان، هەروەکو چۆن لە جوگرافییەدا روودەدات کاتێك کە ئەو نەخشانەی لەسەر کاغەز بۆ رووبارەکان دەیکێشین جێبەجێنابێت بەسەر راڕەوی ئاوی روبارەکاندا، ئەوەش بەهۆی ئەو کەلێنو هۆکارە سروشتییە جۆر بەجۆرەکانەوە، هەروەها ئەو رایانەی کەبەهۆی گرفتێکی تایبەتییەوە دەستمان دەکەوێت، جیاوازی هەیە لەخشتەی چەندانی، بۆهێڵی سەرەو لێژە، یان هێڵی پەلدار، ئەوانەی وەکو شێوە سەرزارییەکانی دابەشکردنی لامی، یان لامی هەڵگێڕراو، یان لامی دووبارە، یان ئەوەی لەشێوەی لامدایە.

٢-٢/توانستی لێکدانەوەیی دابەشکردنی نموونەیی:-

١-بەشێوەیەکی سروشی، واتا بەشێوەی رێکەوت بەبێ کارتێکردنێکی بنەمایەکی تایبەتی، یان بڕیارێکی کۆمەڵایەتی بەسەر کۆمەڵەکەو، یان تاکەکاندا.

٢-رادابەشکراوەکان بەدابەشکردنێکی لامی: ئەوەش لەکاتێکدا رای هێندێك لەتاکەکان، یان کۆمەڵەکان، بەهێندێك لەبنەما کان یان بڕیارە کۆمەلایەتییەکان کارمەندبن.

جیاوازی لەنێوان ئەو دوو شێوەی پێشەوە باسکران، ئەوە جیاوازییە بەجۆرو سروشت، نەك بەپلەی، کەڵك وەرگرتن لەجیاکردنەوە لەنێوان دابەشکردنی بەشێوەیەکی سروشتی ودابەشکردنیان لەسەر شێوەی سەرەو لێژەی دووبارە بووەکان، یان بەشێوەی لامی وەکوپیتی لام..هتد، ئەوە بۆ ئەوەیە کەبزانرێت، ئەگەر ئەورایانەکاریان تێکرابێت بەچەند بڕیارێکی تایبەتی، وەکو ئەوەی ئاینی بن یان سیاسی بن...هتد، یان بۆ ئەوەیە کەبزانرێت ملکەچ نەبوون بۆ کارکەرێکی تایبەتی، بەڵکو تەنها راکانی ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵەیە دەنوێنن.

٣-٢/ راستی دابەشکردنەکانی هێمایەتییە سەرەکییەکان:

١-دابەشکردنی سروشتی راکان:-بەراستی دابەشکردنی سروشتی راکان بریتییە لە دابەشکردنی هەر کۆمەڵێك بێ ئەوەی رای تاکەکان لەلایەن یەکترەوە کاریانتێبکرێت، واتا ئەوەیە رای تاکەکان بەشێوەیەکی راستەوخۆ دابەش بێت و بەشێوەیەك لە یەکتری سەربەخۆ بن، وەکو تۆپە بچکۆلە سورو سپییەکانی یانسیب.

بەلام پێویستە ژمارەی کەسەکان تەواو بێت، راکانیش لەیەکتری سەربەخۆبن، پرسیارەکانیش لەیەکتری جیا وازو سەربەخۆبن، پرسیارەکانیش بەتەنها هیچ واتایەکیان نەبێت، بەڵکو واتا کانیان بەکۆمەڵە کانیانەوە دیاری بکرێن، لەبەر ئەوە پێویستە کەسە لێکۆڵراوەکان، پاڵبدەن بەهەمان کۆمەڵی کۆمەلایەتییەوە،

جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەی پێشەوە کارێکی قورسە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە:-

-چونکە ئەو کەسانە لەیەکتری دا نابڕێن، بەڵکو پەیوەندی بەیەکەوە هەردەکەن و کار لەیەکتری دەکەن.

-هەرگز ناتوانرێت پرسیارەکان لەیەکتری سەربەخۆ بکرێن.

-لەدوایدا هەرگز ناگونجێت راکانی ئەندامەکانی یەك کۆمەڵ، لەگەڵ یەکتری بگونجێن بەشێوەیەکی بەردەوامی، چونکە جاری وا هەیە تەنها یەك کەس ئەندامەلە چەند کۆمەڵەیەکی جیاوازدا، وەکو فەرمانگە، خێزان، یانە...هتد.

**سێیەم:دابەشکردنی لامیانە، یان سەرەولێژە پێچاوپێچەکان:-**
دابەشکردنی(لامیانە) ئەوە دەگەیەنێت کە زۆربەی زۆری وەلامەکان ناکەونە ناوەڕاستەوە، بەڵکو لە یەکێك لە لێوارەکانەوە دەبن، یان راستەوانە دەبێت ئەوکاتە لەسەر شێوەی پیتی (ل) دەبێت، یان چەپەوانە دەبێت لەسەر شێوەی(L)، واتا هێڵە سەرەو لێژەکە رووەو چەپ دەبێت.

بەلام هێڵی سەرەو لێژەی سروشتی: ئەوەیە دووبارەبووەکان، لە ناوەڕاستی هێڵەکەوە کۆدەبنەوە.

واتای دابەشکردنی لامیانە: ئەلبورت لای دوڕێیانێك، تێبینی رەفتاری کۆمەڵە شۆفێرێکی کرد، کە گڵۆپی ئاماژەی تێپەڕبوونی لێدانەنرابوو، تێ بینیکرد کۆمەڵە شۆفیرێکی کەم، خێرایی ئۆتۆمبێلەکان بەجۆرێك کەم دەکەنەوە، کە بگاتە ئاستی وەستانن، بەڵکو زۆربەی زۆریان بەشێوەیەکی ئاسایی خێراییەکانیان کەمدەکەنەوە، بەلام ئەوانەی دیکەیان هەرگیز کەمیان نەدەکردەوە، لەبەرئەوە ئەو هێڵە سەرەولێژەی کە رەفتاری ئەو کۆمەڵە شۆفێرە دەنوێنێت، لەسەر شێوەی هێڵی سەرەو

لێژی سروستی دەبێت، واتا دووبارەکان تێیدا لەناوەڕاستدا کۆدەبن، بەڵام لەحاڵەتی بوونی گڵۆپی ئاماژەی ڕۆیشتندا لەسەر دووڕیانەکە، ئەلبورت بۆیدەرکەوت لە ٩٤٪ ئۆتۆمبێلەکان بەتەواوەتی دەوستن، لە ٣٪ یان تەنها هێواشی دەکەنەوە، کاتێك نزیکی وەستانن دەبنەوە، لە ٢٪ یان کەمێك هێواشی دەکەنەوە، لە ١٪ یان هیچ بوونێك بۆ ئەو گڵۆپانە دانانێت، بەڵکو هەر بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتندا، ئاوەها سەرەولێژەکە لامیانە دەبێت، واتا دووبارەبووەکان تێیدا دەکەوونە لای ڕاستەوە.

کارەکەیش هەروا دەبێت بەگوێرەی ڕاکان واتا/ئەگەر پەستانێك، یان بڕیارێك، یان بنچینەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو هەبێت، ئەوکاتە ڕاکان بەشێوەیەکی (لامیانە) دابەش دەبن، بەڵام ئەگەر ئەوانەنەبوون و ڕاکانیش بە شێوەیەك لە یەکتری سەربەخۆ بون، ئەوکاتە دابەشکردنەکە سروشتی دەبێت، جاری وا هەیە لە شێوەی لامی دووبارەدا دەبێت، وەکو حاڵەتی تۆمارکردنی خوێندکار لە پۆلدا یان کرێکار لەکارگەدا دەبێت، ئەوانەش پێش کاتی دیاریکراو دەگەن کەمن، ئەوانەی کەدوای کاتی دیاریکراویش دەگەن هەر کەمن، لەبەرئەوە هێڵە سەرەوژێرەکە لەپڕ بەرزدەبێتەوە، دوای ئەوە لەپڕ نزمدەبێتەوە.

## پۆلێنکردنی ڕاکان و ڕوکارەکان بەگوێرەی میزاج

لە کاتێکدا کەسێك کە ڕای خۆی دەردەبڕێت، یان لە ڕای کۆمەڵەکەی دەچێت، یان ڕاکەی بەپێچەوانەوە، لەڕای ئەوان ناچێت و ڕایەکی ڕەسەن و جیاوازە، بەواتایەکی دیکە ئەم کەسە بەتاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوەو شارەزایی گشتی بەوڕایە گەیشتووە.

بەو واتایە ڕای تاك لە حاڵەتی یەکەمدا بڕیپیە لەتیشك دانەوەی ئەو ڕاگشتیەی کە بڵاوە لە دەوروبەرە کۆمەڵایەتییەکەیدا، بەڵام لە حاڵەتی

دووەمدا بەپێچەوانەوە هێزی کەسێتی خۆی دەنوێنێت، بەڵگەشە لەسەر ئەمەئەوەیە کەئەو رایە خۆیە تییەو لەکاتی لێکۆڵینەوەی کاروبارو بژارەکرنیدا بۆی دروستبووە، لەبەر ئەوە زۆر جاربە جێگیریو توندیو رەقیو پەیوەستبونەوە ئاماژەی بۆ دەکرێت، واتای وایە ئەوکەسە لەبیرکردنەوەیی و رەفتارکردنیدا ملکەچی کارتێکردنی بیرۆکە تەرزهاوێژە باوەکانی نێو کۆمەڵەکەی، یان بڕیارە پێش کاتدراوەکان نییە.

لەبەرئەوە لە دەروونزانی کۆمەڵایەتیدا زۆر گرنگە جیاوازی لەنێوان (رای) گشتییەکانو(رای) کەسییە تایبەتییەکان بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەسێك بە راستی بە شێوەیەك یان زیاتر بە رای کۆمەڵەکەیەوە کە هاتووچۆیاندەکات کارمەندە، واتا/ ئەو کۆمەڵەی کە تێیدا ئەندامەو نەریتو ئامانجەکانیو پێوانە سەرەکییەکانیو هەمو روکارەکانی لێیان وەردەگرێت، یان بەوکۆمەڵە ئەندامییەی وەکو/ خێزانەکەی، یان تایەفە ئاینییەکەی کاریتێدەکرێت..هتد.

ئەمجا لەبەر ئەوەی تاك، تەنها بەیەك کۆمەڵەوە پاڵنەداتەوە، یان پابەندنییە، بەڵکو زۆر جار ئەندامە لە زۆر کۆمەڵی لەیەك جیاوازدا، وەکو/خێزان، یانە، سەندیکا، پارت، هۆز، نەتەوە...، لەبەر ئەوە هیچ سەیرنییە کەمرۆڤ جار بەجارێك رای جیاوازو دژیەکی هەبێت، بەڵام کاتێك هاتوو قەیرانێك لەپارتە رامیارییەکەیدا وەکو/بەرپابونی جەنگ، یان لەیەکدانێك لەگەڵ دەوڵەتێکی بێگانەدا، رویدا، ئەوکاتە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی روکارە نیشتمانییەکان، ئەوکاتە ئەمیش رایەکی ئاشکراو دیاریکراوی بۆ دروستدەبێت..هەروەها راگشتیەکان بەشێوەیەکی ئاسایی بەسەر سەرەو لێژەی (لامیانە)دا دابەش دەبن، لەبەر ئەوەی

زوربەی زۆری راکان لەیەکدەچن، بەڵام دابەشکردنی راکەسێیەکان، بەشێوەیەکی ئاسایی شێوەی دابەشکردنی سروشتی وەردەگرێت.
گرنگیدان بە بابەتی پۆلێکردنی خەڵکی بەگوێرەی روکارەکانیان و راکانیان هەر لەسەردەمی (هیبوکرات)[1]ەوە دەستی پێکردووە، ئەوکاتەی کە تاکەکانی بە گوێرەی میزاجو تایبەتمەندییە کەسێتیەکانیان دابەشکردووە.
بەراستی پۆلینکردنەکەی کارێکی زۆری کردۆتە سەر پۆلێنکردنی زانستییانەی نوێی تاکەکان لە مەودای دەروونزانی کۆمەلایەتیدا.
راکانی تاکو روکارەکانیو بیروباوەڕەکانی بەگوێرەی دوو کۆمەڵەکارکەری کەسێتیو ژینگەیی، دیاری دەکرێن.
واتا/ کەسێتی تاك و روکارەکانیو، دوای ئەوە راکانیشی لەئەنجامی بەیەکداچونی ئەو هۆکارە کەسیو ژینگەییانە، دروستدەبن، جیاوازی نێوان خەڵکی لە جیاوازی نێوان ئەو کارکەرە کەسییانەوە، دەردەکەوێت.
کارکەرە کەسێتیەکانی بارەکانی فیسیۆلوجی و پێکهاتووە دەروونیەکان دەگرنەوە، هەرچەند زوربەی زۆری ئەو تاقیکردنە وانەی کەلەم بارەیەوە ئەنجامدراوون، روونیان کردۆتەوە کەهیچ جیاوازییەکی گەورە نییە لەنێوان روکارەکانی مێو، روکارەکانی نێرینەدا، ئەوەش لەکاتی ئەو راوە گرتنانەوە دەرکەوتووە، کەبۆ زانینی رادەی جیاوازی رای نێرینەو

---

[1] هیبوکرات (٤٦٠ - ؟) پ.ز – لە دورگەی (کۆس) لە یۆنان زەمین ژیاوە، یەکێکبووە لە پزیشکە کۆنە بەناوبانگەکانی جیهانی ئەو سەردەمە، لە (لارسا) کۆچیدوایکردووە. مرۆڤی کردووە بە چوار جۆرەوە: ١- کەسی میزاژ خوێناوی ٢- کەسی میزاژ زراوی ٣- کەسی میزاژ رەشاوی ٤- کەسی فلیگماتی - و -

مێینەدا بەلایەن جەنگەوە، دەرکەوتووە هەڵوێستی هەردوولایان لەوبارەیەوە یەکبووە.

بەراستی هێندێك لە لێکۆڵەرەوە ئەمریکییەکان هەوڵیان داوە، کەبیسەلمێنن، کەژنان لەبارەی سیاسییەوە لەپیاوان سنورگیرترن، بەلام تاقیکردنەوەکانیان ئەمەیان نەسەلماندووە، تەنها لەبارەی ئایینەوە نەبێت.

لەئەنجامی چەند تاقیکردنەوەیەکدا دەرکەوتووە، کەبەشێوەیەکی گشتی ژنان ئایین پەروەرترن و دروشمەکان و پێویستییە ئایینیەکان زیاتر لەپیاوان ئەنجامدەدەن.

بە شێوەیەکی گشتی جیاوازیی تەمەن و توخمو رەگەز کارناکەنە سەر راکانو روکارەکان، نابنە هۆی جیاوازییان، مادا مێ هۆکاری وەکو/ پلەی زیرەکی یان تەرزی کەسێتی بەشدارینەکەن، ئەوەش بۆنموونە، بەلام بەگوێرەی کارکەرە ژینگەییو کۆمەلایەتییەکان، وەکو/ئاستی رۆشنبیرییو ئابووریو سروشتی پەیوەندی کۆمەلایەتی، بەراستی یارمەتیدەرانی خوێندنگەی رەفتاری ئەمریکی، هەوڵیانداوە کارتێکردنو گرنگی لە دیاریکردنی روکارەکانو راکاندا بسەلمێنن، بۆ نموونە هەوڵیان داوە بیسەلمێنن کە پروتستانت، لە کاسۆلیك سەربەستی زیاترە، ئایینپەروەر، سەربەستی زیاترە لە کەسانی دیکە...هەروەها.

بەلام لەراستیدا هۆکارە ژینگەیی و کۆمەلایەتییەکانیش، ئەویش بەتەنها روکارەکانی تاك دیاری ناکەن، بەڵکو لە دوتوێی بەیەکداچونو کارلەیەککردنداو هۆکارە کەسییەکاندا دیاریدەکەن، خەڵك راکانی خۆی لە دەوروبەرەکەیدا وەکو/خێزان، رۆژنامە هاورێوە وەردەگرێت، بەلام بە شێوازی کەسێتیەکەی دەینەخشێنێت لەبەرئەوە راکانو روکارەکان بارێکی کۆمەلایەتیان هەیە، واتا/کەسەکە لەکاتێکدا رای خۆی لە

کێشەیەکی تایبەتیدا دەبەخشێت، روکارەکانی تێدا دیاریدەکات، ئەو کاتە هەڵویستی بەرامبەر رای کۆمەڵ( ئەندامیکەی رووندەکاتەوە، هەروەها لەراو روکارەکانی کۆمەلأنی دیکەش جیادەکاتەوە بەراستی ئەو کۆمەڵەی پلەو پایەی بڵندی هەیە لەچاوی ئەو تاکەدا، کارێکی زۆر گەورەی هەیە بۆسەر روکارەکانیو راکانی.

## بیرۆکەی پۆلێنکردنی زانستییانە

پۆلێنکردنی میزاجی راکان، توشی کۆمەڵە گیروگرفتێك دەبێت، چونکە ناتوانرێت کەسەکان بەگوێرەی روکاریان، یان راکانیان، بەشێوەیەکی سنوردارو رێکبکرێن.

زۆر قورسە دوو کەسی چونیەك لەراکانیانداو روکارەکانیاندا، بە تەواوەتی بدۆزینەوە، لەبەر ئەوە ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی وورد پۆلێنیانبکەین، دەبێت بە گوێرەی ژمارەی تاکەکان کۆمەڵ دابنێین، چونکە ئەوە بەس نییە کە بڵێین/ ئەو شۆڤینییەو ئەوەش سۆشیالیستییە، ئەوەیان فاشستییە، لەبەرئەوەی پلە هەیە لە نێوان تاکەکانی هەر کۆمەڵێك لەم کۆمەلأنەدا.

بەلأم دەتوانین بڵێین/ بە شێوەی گشتی پەیوەست هەیە لەنێوان روکارەکاندا، یەکەمیان هەمیشە لە راکانیدا پەرگرە، ئەوەی دیکەیان ئاساییە، یەکەمیان، لەلابەلابووەکانە، دووەمیان لەلایەنگرەکانە، یان لەخاوەن(را) چونیەکەکانە، بۆ رای زۆرینەی کۆمەڵە ئەندامەکە. زۆر جار گرفتی(را) دێتە پێشەوە، وەکو ئەوەی پەیوەندی هەبێت لە نێوان ئەو دۆخەی کە هەیە، یان بە گوێرەی چاکسازیو گۆڕانکارییە، واتا/ ریزی یەکەم لە پارێزگارە لایەنگرەکانی باری ئێستایە، ئەو ریزەکەیان لەچاکسازە شوڕشگێڕەکانە.

جاری واش هەیە پۆلێنکردنی تاکی، بەگوێرەی کۆمەڵێك نابێت، بەڵکو بەگوێرەی (خود)ی خۆیان دەبێت، واتا بەگوێرەی نەریتە بنچینەییەکانی( کەسێتی) دەبێت.

دەتوانین (راکان) بەشێوەی زانستییانە، بەگوێرەی سێ بنچینە پۆلێنبکەین:-

١-پۆلێنکردنی بەگوێرەی لەیەکهەڵسەمینەوەی میزاجەکان، واتا بۆ میزاجە هاوئامانجەکانو میزاجە لابەلاکان.

٢-پارێزگارانو سەربەستەکان.

٣-بەگوێرەی نەریتە بنچینەییەکان.

**یەکەم: میزاجە هاوئامانجەکانو لابەلاکان:-**

زاراوەی میزاجی هاوئامانجو لابەلا، تا ساڵی١٩٤٠، تەنها لە گۆڕەپانی دەروونزانیدا بەکاردەهێنرا، واتا لەبارەی نیشانە سروشتیو دەستکەوتەکانی کەسێتییەوە، لەقۆناغە جۆربەجۆرەکانی گەشەپێکردندا بەکاردەهێنرا، بەڵام دوای ئەوە لە گۆڕەپانی دەروون زانی کۆمەڵایەتیدا، لەبارەی چۆنێتی هەڵویستی تاکەوە بە رامبەر کۆمەڵ بەکاردەهێنرا.

لابەلا ئەوکەسەیە کە هەمیشە روکاری دژواری بۆ ئەو کۆمەڵە باوەی کە ئەندامە تێیداهەیە، کاتێك بەشێوەیەکی بەردەوام دژی پێوانەکانیودابونەریتەکانێتی.

بەڵام پێناسەی لابەلابەم شێوەیە، واتا تێکەڵکردن نیە لەگەڵ (رادیکاڵ)یدا، یان چاك سازیدا، چونکە لابەلا، کاتێك بەلابەلا دەژمێردرێت، کە(را) کەی بەراورد کەیت، بەرای ئەو کۆمەڵەی کەئەندامەتێیدا، وەکو:-خێزان، رێکخراوەکانی ئاینی، سیاسی،

کۆمەڵایەتی، یان پارتێکی سیاسی ئەو کاتە دەرکەوێت کە هەمیشە دژێتی.

ئەمجا ئەگەر ئەو کۆمەڵە سنورگیر بوون، ئەم دەبێتە شۆڕشگێڕ، ئەگەر راکانی ئەو کۆمەڵە چاکسازیی بو، ئەم دەبێتە سنورگیر، هەروەها بەڵام (رادیکالی) ئەو کەسەیە کە شۆڕگێڕە، هەمیشە رای چاکسازی هەیەو ئارەزووی چاکسازی دەکاتو گوێناداتە کۆمەڵەکەی هەرچۆنێك هەبێت، شۆڕشگێڕی بێت، یان سنورگیر بێت، ئەم هەمیشە، لە سستەمو دەستگا کۆمەڵایەتییە بڵاوەکاندا ئارەزوی گۆرانکاریدەکات.

لەلایەکی دیکەوە خەڵکی بە لابەلایی دانانرێت، تەنها بەگوێرەی کۆمەڵە ئەندام دارەکەیەوە نەبێت، بۆ نموونە/ ئەو بێگانەیەی کە راکانی دژواری راکانی رۆڵەکانی ئەوشارەی لێوەهاتووەو هاوئەنجامی راکانی ئەو شارەی تێیدا دەژی بە لابەلا دانانرێت.

هەروەها ئەگەر کرێکارێك هەبوو، بەرێکەوت لەگەڵ خاوەن کارەکاندا کۆبۆوەو راکانیشی دژی راکانی ئەو خاوەن کارانەبوو، بەلابەلا دانانرێت، ئەگەر راکانی هاوئەنجامی راکانی کۆمەڵە کرێکارە کەی بوو، کەئەندامە لەگەڵیاندا.

هەروەها ئەگەر تاکێك بەبێ بیرکردنەوە، رای خستەپاڵ رای کۆمەڵەکەی، بەراچونیەك، دانانرێت.

راچونیەکی، یان هاوئەنجامی یەکەم فرمانی پاریزگاریکردنە، لە سەر بنچینەی کۆمەڵەکەو مانەوەی، ئەویش بۆ ئەوەی بگاتە ئامانجە بنچینەییەکانی، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، راچونیەکی لەئەنجامی پەستانی کۆمەڵایەتی بەمەبەستی یەکبوون، راگونجاندنو دروستبوونی یەك روکاری دەردەکەوێت.

بۆ راچونیەك بوون چەند حاڵەتێکی جیاواز هەیە:-

١- باری جۆشخواردنو قبوڵی راستەوخۆ، بۆ نموونەی دابو نەریتی کۆمەڵایەتیو پێوانە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵەکە. هاوئەنجامبوونی تاك لەگەڵ کۆمەڵەکەیدا، واتای وایە لەهەموو لایەنێکەوە، وەکو لایەنەکانی ئاینی سیاسی، هونەری..هتد.

٢-ئەو بارە پێویستییەی کەباڵ بەتاکەوە دەنێت، بۆ ئەوەی رۆڵی خۆی وەکو ئەندامێك ببینێتو هاوکاریو هەرەوەزی بکات، با لەگەڵ کۆمەڵەکەیشدا نەبێت لەشێوەو نەخشەی گشتیدا.

٣-باری هاوئەنجامی رۆتینی، لەم حاڵەتەدا، تاك رێگەیەك دەگرێت، پشتی پێنابەسترێت، چونکە ئەم رەفتارە بۆیە دەگرێت، لەبەرئەوەی رەفتاری کۆمەڵەکەیە، بەشێوەیەکی چاولێکەری، بۆ ئەوەی پاریزگاری لەخۆی بکاتو بۆ ئەوەی پێیان بسەلمێنێت کەهەموو کارێکییان تەواو راستەو رەوانە، لەم حاڵەتەدا، هاوئەنجامبونەکە جۆرە خووگرتنێکە.

٤-هاوئەنجامبوون، لە ئەنجامی کرداری پەستانکردنی کۆمەڵەکەبە سەر ئەندامەکانیدا، بۆ ئەوەی رەفتاریان یەك بخاتو گوێ رایەڵیان بکاتو بێیان خاتە ژێر رکێفی خۆیەوە ئەم جۆرە(پەستانە) پێیدەووترێت (پێوانەکانی کۆمەڵی)، تاك ملکەچی دەبێت، لە ترسی سزای کۆمەڵەکە ملکەچی دەبێت.

٥-هاوئەنجامبوونی بێباری(الانتهازیة)، لەمەیاندا، کەسەکە خۆی پابەند دەکات، بەپێوانەو نەریتە کۆمەڵایەتییەکانەوە، بۆ ئەوەی بگاتە چەند دەستکەوتێکی تایبەتی خۆی.

دەتوانین لێرەدا، گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە پلەی هاوئەنجامبوونو رادەی هێزی پەستانی کۆمەڵ بە کورتی، دیاریبکەین:-

١/سەرنجڕاکێشانی کۆمەڵگەو بەهێزیی یەکگرتنیان، مەودای چالاکییانو بەدیهێنانی ئامانجەکانیان زیاددەکات، کاردانەوەیان هەیە بۆ سەر ئەندامەکانیان واتا/ ملکەچیو هاوئەنجامی (را) دەسەپێنێت بەسەر ئەندامەکانیدا.

٢/ کارلەیەککردنو پەیوەندی بەهێزی نێوان ئەندامەکان، دەبنە هۆی ئەوەی کەئەندامەکان، چاوەڕێی سزای بەهێز بکەن، ئەگەر بەپێچەوانەوە ڕەفتاریانکرد.

٣/کاردانەوەی رای زۆرینەی ئەندامەکان، بەشێوەیەکی روبەڕو، دەبێتە هۆی پەستانێکی بەهێز بۆ یەکبوونی، بەسەر کەمینەکاندا.

٤/ سزادانی لابەلا بووەکان، لە پێوانەکانی کۆمەڵەکەو ڕەفتاری زۆرینە دەبێتە هۆی ملکەچکردن، بۆ نەریتو پێوانەکانی کۆمەڵەکە.

٥/هەرچەندێك کاری کۆمەڵگە گرنگبێت، ئەوەندە پەستانی بەهێز دەبێت، بەسەر ئەندامەکانیدا، بۆ ئەوەی پابەندبن بە نەریتو پێوانەکانێوە.

بەڵام گرنگترین هۆکارەکانی لابەلابونەوەی کەمینەی ئەندامەکانی کۆمەڵەکە دەگەڕێتەوە بۆ بونی ناکۆکیو لاوازیی پەیوەندیی، بۆ ئەو کۆمەڵانەی کە تاکەکانی ئەم سەردەمەیان لەخۆگرتووە، ئەمانە جیاوازی پێوئەکاو نەریتەکانو کەڵکەکانی کۆمەڵ پاڵ بە ئەندامەکانەوە دەنێن بۆ هەڵبژاردنی ئەو راو ڕەفتارو روکارانەی کە لەگەڵ کەسێتیەکانیاندا، دەگونجێت.

ڕەفتاری لابەلا ئەو ڕەفتارە ناوێزانەی دژبە نەریتی کۆمەڵ دەگرێتەوە، بەهەموو پلەکانێوە، هەموو جۆرەجیاجیا کانێوە، چ ڕەفتاری تاوانباران بن،و چ ڕەفتاری داهێنەران بن، چونکە لەهەموو کۆمەڵگاکاندا، لەنێوان هەموو کۆمەڵەیەکدا، کەمینەیەك هەن، رێژەکەیان دەگاتە نیزیکەی١٠٪، ڕەفتاری کرداریو ژیرانەیان بە پێچەوانەی ڕەفتاری کۆمەڵەکەوەیە.

لابەلابونەوەش فرمانێکی کۆمەڵایەتی هەیە، ئەویش قبوڵنەکردنی شێوازە شارستانییە چاولێکەرییەکانە، ئەویش بەهۆی دەرکەوتنی پێویستیە نوێکانەوەیە، ئەم جۆرە لابەلابونەوەیە لەسەرەتاوە دژی زورینەی کۆمەڵەکەیە، بەڵام لەدواییدا وای لێدێت، دەبێتە رەفتارێکی هاوئەنجامی بۆ هەموو کۆمەڵەکە، چونکە پێویستی دەیسەپێنێت.

ئەمەش لەئاستی کۆمەڵگەی گشتیدا، وەدەردەکەوێت، چونکە پەیوەندی شارستانی و ئابووری رودەدات و شورشێك لە هۆکارەکانیو رێگاکانی پیشە سازیدا بەرپا دەکات و ئەوکاتە تیشکدەداتەوە لەسەر کۆمەڵەکانو پەیوەندییەکانی خێزانیو کۆمەڵایەتی.

**هێندێك کەس هەن توانای دەربازبونیان هەیە لە پەستانی کۆمەڵایەتی، بەروکارو راکانیان سەربەخۆدەبن، دەتوانین ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی ئەمە، بە کورتی باسیانبکەین:-**

١-زۆرباوەڕ بەخۆبوون: کەسانێك هەن زۆر هەستیارن بەرامبەر پەستانی کۆمەڵ، ئەمەش پاڵیان پێوە دەنێت کە لە راو پیشەکانیاندا، سەربەخۆبن و کۆمەڵیش قاییل کەن بەوەی کەئەوان لەسەر راستن.

٢-کەسانێك هەن لە ئەنجامی هێزی پەستانی رای کۆمەڵدا، دژەکرداریان بۆ دروستدەبێت و رەفتاری چەوت و چێڵ دەگرن، دژی کۆمەڵەکانیان.

٣-کەسانێك هەن دژایەتی رەفتاری کۆمەڵەکە دەکەنو لێی یاخیدەبن، چونکە دەیانەوێت رەفتارێك بکەن کە بەهرەداربێت، ئەمانە هەیانە لەبەرئەوەی خەڵکی گومانیان هەیە لەبۆچونەکانیاندا، گۆشەگیردەبنو بەرەبەرە بیروراکانیان دەپوکێتەوەو نامێنێت، کەسانێکی دیکەشیان هەن بەهۆی ئەم رەفتارە ناوێزەییەوە، بەرەو داهێنان و بلیمەتی دەڕۆن، هێندێکی دیکەشیان هەن، لە ئەنجامی دژدانەوەی باری رەووشتی

ڕەفتارەکانیان دوای مردنیان کێشێکی باش بۆ بیروبۆچوونەکانیان دادەنرێت، ئەویش بەگوێرەی دەورو بەرەکانیان.

لە گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی مرۆڤی داهێنەر، ئەوەیە کە بەچاکسازییەکی شۆڕشگێر دادەنرێت و کۆمەڵە لایەنگرێکی دەمارگریان بۆ پەیدادەبێتو پشتیدەگرنو سەریدەخەن، ئەمە زۆر راستە لە بارەی سیاسەتو زانستو هونەریشدا.

هەردوو زانا ئولبورت و هاریمان، لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە ساڵی١٩٢٥ ئەنجامیانداوە، گەیشتونەتە ئەوەی کە جیاوازی لە نێوان دوو جۆرە کەس لە لابەلاکان بکەن:-

١/ بەرهەڵستکارە نەگونجاوەکان لەگەڵ دەوروبەردا بەرهەڵستکاری لێرەدا، واتاکەی: بریتییە لە ڕەفتارێکی دەروونیو کۆمەڵایەتی، ئەم جۆرە بەشێوەی گشتی زۆرینەی بەرهەڵستکارەکان دروستدەکات، کۆمەڵێك لەمانە چەند تایبەتمەندییەکی کەسییان تێدا هەیە، وەکو/ خاوی، کۆشەگیری، نزمبونەوەی ئاستی زیرەکی، هێندێك تایبەتمەندی ئابووریو کۆمەڵایەتی، یارمەتی گەشەکردنی ئەمانە دەدەن. ئەوانە بەوە جیاوازییان هەیە دەستەڵاتداران خۆشیان ناوێن، ئارەزوی سەرکەوتنیان لاوازە، نەرمیو گونجاندنو سەقامگیریان کەمە ئەم جۆرە لە نێوان بەرهەمدارە کەمەکاندا، لەنێوان پیاواندا لەژنان زیاترن، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ژن هەڵناچێت لەبەرئەوەی کەلاوازە، چونکە کۆمەڵ دەیپارێزێت، بەڵام پیاو وانییە، کە هەستیکرد لاوازە، دەیەوێت بێدەستەڵاتییەکەی بە هەڵچونو شۆڕشکردن دژی راکانو ئەو پێوانانەی کە لە کۆمەڵەکەیدا بڵاوە دەربڕێت، بۆ ئەوەی خۆی دەرخاتو خۆبسەپێنێت، لەبەرئەوە ڕێژەی بەرهەڵستکارەکان لە ٧٠٪ی پیاوە، بەڵام لەژناندا ٣٠٪ یەهەروەها ڕێژەی بەرهەڵتکاری لەنێوان تاکەکاندا،

یان تاقانە کانی کەس و کاریان، ڕێژەی زۆرە، ٣-٤ ئەوەندە لەمندالآنی دیکە زیاترە، ئەم جۆرە هەمیشە بەرهەڵستی رای کۆمەڵەکەیان دەکەن.
٢/ئەوبەرهەڵستکارانەی کە راکانیان رەسەنە، ئەوانەن کەبە کەسێتی بەهێزو نیشانە بەهێزەکانی بەناوبانگن، ئەمانە زۆر جار بەر هەڵستکارن، بەڵام بەشێوەیەکی هەمیشەیی نییە.
کور نهوزەر(Cornhauseor) لە ماوەی پێنج ساڵی رەبەقدا هەستاوە بە تێبینی پەرەسەندنی رای ئەوخوێندکارانەی کە پەشێونو لێکۆڵینەوە دەکرێن، بۆیدەرکەوتووە کە ئەم جۆرە شوێنکەوتوانە بەرهەڵستیکردنی رای کۆمەڵیان زیاترەو، پابەندیشنابن بە پێوانەی نەریتی کۆمەڵەکەوە، هەموو کارێك دەگێڕنەوە بۆ وتووێژ.
دووەم: سنورگیرەکان و سەربەستەکان:-
سنورگیر ئەوکەسەیە کەحەز لەگۆڕانکاری ناکات، بەڵکو حەزدەکات سستەم و دەستگا کۆمەڵایەتییەکان، هەرهەموو وەکو/ خۆیان بمێننەوە، بەبێ دەستکاریکردن، بەڵام کەسی رادیکاڵ/ ئەو کەسەیە هەمیشە حەز بە گۆڕانکاریو چاکسازی دەکات لە هەموبارەیەکەوە.
گرنگیدان بەم بابەتە لەسەردەمێکی دورەوە دەستپێکردووە، بەتایبەتی لەبارەی رەوشتی و سیاسیەوە، بەڵام لێکۆڵینەوەیەکی بابەتی دەروونی کۆمەڵایەتی لەمبارەیەوە نەکراوە، تا ساڵی(١٩٢٢) نەبێت.
دەتوانین جیاوازی نێوان دوو قۆناخ بکەین لەم لێکۆڵینەوەیەدا:-
١-قۆناغی لێکۆڵینەوە بەگیانێکی بایۆلوجیو دەروونیەوە.
٢-قۆناغی لێکۆڵینەوەی دەروونی و کۆمەڵایەتی.

**قۆناغی یەکەمیان:-**

**جارێکیان (مور-Moor) پرسیاری لە خۆی کردو وتی/ تۆ بڵێیت:- کەسانێك هەبن بە تایبەتی میزاجێك یان ئارەزوویەکی رادیکالییان هەبێتو کەسانێکی دیکە هەبن، بەسروشت سنورگیربن، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، هات/ لە نێوان(٢٢٥) کەسدا(٣٠) کەسی زۆر رادیکالی هەڵبژارد، لەگەڵ (٣٠) کەسی سنورگیردا، ئەمجا هات بەراووردی لەنێوان هەردوو نموونەکەدا کرد، لە کۆتاییدا گەیشتە ئەم ئەنجامە:-**

**١-١- لەبارەی زیرەکییەوە، جیاوازییان نەبوو.**

**١-٢- لەبارەی سۆزتیژ ییەوە، هیچ جیاوازییەکیان نەبوو.**

**١-٣- بەڵام رادیکالی بەم نیشانانەجیادەکرایەوە، بەسروشتی خۆی حەزی بە نوێکردنەوەی گۆڕانکاریدەکرد، بە شێوەیەکی هەمیشەیی، توانایەکی زۆر گەورەی هەبوو لەسەر گونجاندنو پەسندکردنو گۆڕانکاریی.**

**١-٤- بەڵام سنورگیرەکان، دژدانەوەی کرداریان خێراتری بەهێزتربو لە رادیکالیەکان، ئامادەییان زیاتربو بۆ ئەوەی رای خۆیان دەبڕن، توانایان لەسەر بەرهەڵستی دژی زۆرینەی رادیکالییەکان.**

**لەگەڵ ئەوەشدا تاقیکردنەوەکەی (مور) لەلایەن (واشبورن-Washburn)ە دوبارەکرایەوە، بۆ دڵنیابوون لەئەنجامەکەی، کەچی دەرکەوت، بەپێچەوانەوەیە، واتا! سنورگیرەکان، توانای گونجاندنو رێکەوتنیان لەگەڵ دابونەریتو چاکسازی نوێدا بەهێزترە، دژەکردار لای سنورگیرەکان، بەهێزترو خێراترە، وەك لە لای رادیکالەکان.**

## قۆناغی دووەمیان:-

لێکۆڵینەوە دەروونیە کۆمەڵایەتییەکان :- ئەو لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوانەی کە لەم بارەیەوە کراوون، ئەم ئەنجامانەی دەرخستووە:-

١-٢-ڕێژەی رادیکاڵی لەنێو پیاواندا زیاترە، وەك لەژنان.

٢-٢-ڕێژەی رادیکالی لەنێو منداڵە تاقانەکاندا زیاترە.

٣-٢-منداڵی نۆبەرە لەبراو خوشکەکانی زیاتر رادیکالیترە، لەو خێزانانەی کە ژمارەی منداڵیان زۆرە.

٤-٢-رادیکالی لەنێو چینی هەژاردا زۆرترەو لە نێو چینی دەوڵەمەندا کەمترە.

٥-٢ڕێژەی رادیکالی لەنێو ئەو کەسانەدا زیاترە، کە لە منداڵیدا ژیانێکی چەرمەسەریو داماوییان بەسەر بردووە.

٦-٢-ڕێژەی کەسانی رادیکالی لەنێو دانیشتوانی شارە نوێکاندا، یان گەورەکاندا، زیاترە، وەکو دانیشتوانی شارە کۆنەکان، یان بچوکەکان. چونکە پەیوەندی لەشارانی بچوکدا بەهێزترە، هاتوچۆی یەکترو بینینی یەکتر زیاترە.

٧-٢- تاك لە تەمەنی منداڵییەوە تا تەمەنی(١٦)ساڵی ئارەزووی سنورگیرانەی هەیە، دوای ئەوە، تا تەمەنی(٢٢) ساڵی دەبێتەوە رلدیکالی، لە تەمەنی (٢٢) ساڵی بەدواوە، جارێکی دیکە ئارەزووی دەگەڕێتەوە بۆ سنورگیرانە.

ئەگەر هێڵی سەرەو لێژە بکێشین بۆ هەردوو روکارەکە، هێڵێکی سەرەولێژەی لامی هەلاو گێڕاومان بۆ حاڵەتی یەکەم وەدەستدەکەوێت، بەلام لە حاڵەتی دووەمدا، هێڵیکی سەرەولێژەی لامی رووتمان وە دەستدەکەوێت.







به کورتی کەسی سنوردار/ ئەو کەسەیە کە حەزدەکات، پارێزگاری ئەو کاروبارە باوە بکات لەکۆمەڵگەکەیدا، بۆئەوەی، وەکو خۆی بمێنێتەوە بەڵام کەسی رادیکالی خاوەن ئەوروکارەیە کە ئارەزوی گۆڕان و چاکسازی دەکات .

پێویستە هەردوو واتای رادیکالیو بەرهەڵستکار تێکەڵوپێکەڵ نەکەین، چونکە بەرهەڵستکار هەمیشە راکانی دژی رای کۆمەڵەکەیەتی بەواتا/ رادیکالییە لە کۆمەڵگەی سنورداردا، بەڵام سنورداره، لە کۆمەڵگەیەکی رادیکالیدا، بەڵام کەسی رادیکالی تەنها لە کۆمەڵگەی سنورداردایە، بەرهەڵستیدەکات، ئەگینانەء.

**سێیەم/ پۆلێنکردنی راکان و روکارەکان بەگوێرەی بەهای کەسێتی:-** زانای ئەڵمانی(سیرنجەر) ئەم بابەتەی لە فەلسەفەوە، گواستۆتەوە، بۆ دەروونزانی، کاتێك کە تیۆرەکەی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بڵاوکردەوە، کاتێك کەهەوڵیدا، کەسەکان بەگوێرەی روکارەکانیان بکاتە چەند تەرزێکی جیاوازەوە، ئەم زانایە لەلێکۆڵینەوەی مێژووی چەند کەسێتیەکەوە، ولە تێبینی کردنی رەفتاری کۆمەڵە تاکێکەوە لەژیانی رۆژانە یاندا، گەیشتە ئەم پۆلێنکردنە.

کاتێك کە خەڵکی بە گوێرەی روکارەکانیان لە شەش تەرزدا، پۆلێنکردن، ئەوانەش ئەمانەن:-

**١-تەرزی تیۆری:** ئەوکەسەیە کەنیشانە تیۆرییەکان کاری تێدەکات و روکاری بەرەو زانیاری و زانست و دەرخستنی راستی دەڕوات.

ئەم جۆرە تەرزانە یان فەیلەسوفن، یان زانانو پسپۆڕن لە زانستیەکی تایبەتیدا، ئەگەر هاتو رۆژێك لە رۆژان دەستیان لە دەستەلات گیربوو بۆ بەرژەوەندە زانست و زانیاریو دەرخستنی راستی بەکاریدەهێنن.

**٢-تەرزی ئابووری:** ئەوکەسەیە حەز بەدەستهێنانی کەڵك وقازانج دەکات، ئەگەر هات و رۆژێك لەرۆژان دەستی لەدەستەڵات گیربو، بۆ گەشە پێدانی باری ئابووری وڵات بەکاری دەهێنێت.

**٣-تەرزی کۆمەڵایەتی:** ئەم تەرزە خەڵکی خۆشدەوێتو ئەم بەهایە لەنێو خەڵکیدا، بەتایبەتی رۆشنبیران بڵاودەکاتەوە، هەوڵدەدات خەڵکی

بەختیاربکات، نەك سامانیان لێ بکێشێتەوە، ئەگەر رۆژێك لە رۆژان بۆی رێکەوت و هەلی قۆستەوە، بووە یەکەم دەستەلاتداری وولات، هەوڵدەدات بەختیاریان بکات، نەوەك دەستەلات بگرێت بەسەریانداو بەرهەمەکانیان بخوات.

٤-**تەرزی جوانپەرستا**: ئەو کەسەیە کە حەز بە رێکوپێکی دەکات واتا نیشانەکانی جوانی کاریانتێدەکات ئەگەر هاتو بۆی رێکەوتو دەستەلاتی وولاتی کەوتە دەست، بەکاریدەهێنێت بۆ پێشخستنی لایەنی چەشتنی جوانی لە گەشە کردنی باری دەروونی خەڵکیدا.

٥-**تەرزی سیاسی**: ئەمە حەز بە دەست بەسەراگرتن وبەستنی پەیوەندی کۆمەلایەتی لەگەڵ خەڵکیداو، دەیکاتە هۆیەك بۆ سەرکەوتنو وەرگرتنی دەستەلاتی سیاسی لە وولاتدا، بە واتایەکی دیکە ئامانجی ئەم تەرزەکەسە کونترول کردنو زاڵ بونەبەسەر خەڵکدا، ئیتر لەبارەی سیاسییەوە بێت، یان لەبارەی ئابوورییەوە بێت، یان لەبارەی کۆمەلایەتییەوە بێت.

٦-**تەرزی ئایتی**: ئەو کەسەیە کە نەریتە ئایینەکان کاریتێدەکات، ئەمەش واتای وانیە کە ئەو کەسە هەمیشە ئایینپەروەرە، بەڵکو جاری وا هەیە ئەو کەسە گومڕاو بێباوەڕە،

دەتوانین ئەم تەرزە ئاینییە بکەین بەدوو جۆرەوە:-

١/ ئایینداری.

٢/ سۆفیگەرو لەژیانبڕاوو خۆنەویستو ئارەزووشکێن.

بەلاّم ئەم شەش تەرزە کەسەی کە (سرینجەر) پۆلێنیکردوون، ناتوانین بڵێین:—هەر تەرزەو پوختن، بەلاّم هەر یەکەو زۆرینەی نیشانەکانی خۆی بەسەردا، دادەبڕێت، لەگەڵ ئەوەشدا نیشانەکانیان، یان تەرزەکانیان بەیەکدا دەچن، بۆ نموونە:ئەم جۆرەو شێوەی ئەم جۆرانەشیان لێدروستدەبێت.

١- تیۆری جوان پەرست.

٢- سیاسی، ئابووری.

٣- ئاینی کۆمەڵی.

ئەم تەرزانە بەناوبانگن، ئێمە بەدەگمەن، تیۆری کۆمەڵی یان ئاینی جوانپەرست، یان ئاینی ئابووری، یان ئاینی سیاسیمان دەستدەکەوێت، بۆ نموونە/ تەرزی ئابووریو سیاسی لەگەڵ جوانپەرستی ئایینداردا هەرگیز ناگونجێت.

هەروەها ئەم نەریتانە یان ئەم بەهایانە، روکاری مرۆڤو راکانیو رەفتارەکانی دیاریدەکەن. ئەم تەرزانە لە رێگەی رۆژنامەخوێندنەوەو جۆرەکانیو، لە رێگەی جل لەبەرکردنەوە، دەردەکەون، هەروەها واتای بەختیاریی، رۆڵی سەرۆکو پێشەواو نیشانەکانیان، وەدەردەکەوون.

# دەروازەی شەشەم

## بەشی دووەم

- سروشتی مرۆڤایەتیو کارتێکەرە کۆمەڵایەتیەکان
- روونکردنەوەی دەروونیی کۆمەڵایەتی بۆ رەفتاری سۆز
- پەیکردنو بیرهێنانەوە
- کاریگەری شارستانی لەسەر بیرهێنانەوە
- زیـــرەکـــی
- جۆرەکانی زیرەکی

## سروشتی مرۆڤایەتییو کارتێکەرە کۆمەڵایەتییەکان

## رەفتاری مرۆڤییو کارتێکەرە کۆمەڵایەتییەکان

بە راستی مەبەست لەگونجاندنی تاك لەگەڵ ژینگەی کۆمەڵایەتیدا، جیاوازی فرمانە دەروونیەکانە بەگوێرەی دەوروبەری کۆمەڵایەتیوشارستانی تاکەکە.

هەر چەند دەروون زانەکان ئەم راستیە دەزانن، بەڵام گرنگی پێنادەن، لەم بەشەدا تاوتوێی هێندێك لەجۆرەکانی رەفتاری تاك دەکەین کە بەگوێرەی کۆمەڵگەو شارستانیەت دەگۆڕێن.

**رەفتاری سۆزی:**

یەکێك نەزانێت، وادەزانێت سۆزەکانی مرۆڤ هیچ جۆرەکارکەرێکی کۆمەڵایەتیو شارستانی، کاریان تێناکات لەگەڵ ئەوەشدا وانییە، چونکە سۆزەکانی مرۆڤ هەروەکو زمانی وان، بیرۆکەکانی کەسەکەو روکارەکانی دەردەبڕن، لەبەر ئەوە ئەو سۆزانە، لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە، لە شارستانییەکەوە بۆ شارستانییەکی دیکە دەگۆڕێن، ئەویش بەگوێرەی داب و نەریت و پێوانەی کۆمەڵایەتی.

جاری واهەیە ئاماژەکردنو گلّماندنیش لە دەوروبەرێکەوە، بۆ دەوروبەرێکی دیکە دەگۆڕێن، ئەو زەردەخەنەی کە لە زوربەی زۆری شارستانییەکاندا، دەربڕینە لەخۆشی، کەچی لە وولاتی ژاپۆن، دەربڕینە لە شەرمەزاری کەسەکە، لەلای (ساموریی-Samorai)یەکان ژن کاتێك زەردەخەنەدەیگرێت، کە مردنی کوڕەکەی، یان مێردەکەی ببستێت کە لە جەنگدا کوژرابێت، هەروەکو چۆن ژنە عارەبەکانیش لە هێندە هۆزێکی کۆندا، بەهەمان روداو دڵخۆش دەبوون.

تفکردنە ئەرز کارێکی ناڕێکە لە خۆیدا، کەچی لای هێندە گەلێکی کۆن کارێکی پیرۆزە.

لە وولاتی نێجەر ئەگەر ژن منداڵی دوانەی ببێت، بە کارێکی ناپەسندی دادەنێن، لە دێڵتای نێجەر هەر دەیکوژن، ئەگەر نەیشی کوژن تامردن بە ڕوزەردییو شەرمەزاری دەمێنێتەوە، چونکە کارێکی ناهەمواری لەدەست قەوماوە، ئەویش منداڵی دوانەی بووە، بەڵام لە وولاتی کامیرون بە ڕوداوێکی زۆر خۆشی دادەنێن هۆزەکە شەر هەمووی ئاهەنگدەگێڕێت، ناوی باوکو دایکەکە بەناوی خۆشتر دەگۆڕن، چونکە پلەوپایەیان بەرزبۆتەوە، باوکەکە دوو بازی بەند لەقۆلیا دەبەستێت، دایکەکەیشی دووگەردانەی جوان لەملدەکات.

هەروەها ئەو مردنەی دەبێتە هۆی بانگهەڵدانو شیوەنو ڕۆڕۆ، لای زۆربەی زۆری گەلان، کەچی دەبێتە هۆی شاییو خۆشیو هەڵپەڕکێ لای (ئەسکیمۆ)کان.

لای هێندە هۆزێك واباوە،کە پێویستە لەسەر کوڕ باوکەکەی بکوژێت، پێش ئەوەی بکەوێتە تەمەنی پیرییەوە، چونکە باوەڕیان وایە ژیان هەر بەردەوامە، مرۆڤ لەدونیا بەهەمان هێزی لەشو ژیری ئەم دونیاوە لەو دونیای کۆتایی دەژی.

بەهەمان شێوە نە هەڵچونی خۆشەویستییو نە هەڵچونی ڕقەبەریی بەشێوەیەکی بەردەوام نییە، لە دورگەی (مارکین)دا.

لەمانەی پێشەوە بۆمان دەرکەوت کەرەفتاری سۆزی، تەنها سروشتی مرۆڤایەتی دەستنیشانیناکات، بەڵکو هوکارەکانی کۆمەڵایەتیو شارستانیش کاریتێدەکن.

مادام وایە ڕوونکردنەوەی دەروونییو کۆمەڵایەتی چییە بۆ سۆزدەربڕین؟

## ڕوونکردنەوەی دەروونییو کۆمەڵایەتی بۆ ڕەفتاری سۆز

دەروونزانەکان باوەڕیان وایە کە ڕەفتاری سۆزیو ڕواڵەتەکانی هاوڕێی، کارێکی سروشتییە، بۆ سەلماندنی ئەم بۆ چونەیان چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە:-

(ئاش-Asch)پشت بەوتاقیکردنەوە دەبەستێت کە بریتییبو لەوەی کە کۆمەڵە وێنەیەکی مرۆڤی بیناو(چاوساخ)،کۆمەڵێکی دیکەی مرۆڤی نابینا، نیشان کۆمەڵێك خوێندکار داوە، بەڵام لەچەند حاڵەتێکی جۆربەجۆردا، وەڵامەکانیان ئەوەبووە کە دەربڕینی سەردەمو چاوی هەردو کۆمەڵەکەلە یەکدەچن، بەڵام(لابار-Labarro) کە زانایەکی ئەثنولوجی بووە، ڕای وایە کە زمانێکی سروشتی نییە، سۆز دەربڕێت، بەڵکو کاردانەوەیەکی کۆمەڵایەتییە، چونکە مرۆڤ، کاتێك: خۆشی، ئازار، ڕق، خۆشەویستی، ترس، دەردەبڕێت، جۆری ئەو هەڵویستو بارە دەردەبڕێت کەپێیدا تێپەڕیوە، واتا کۆمەڵگە ئەو نەریتانە دیاریدەکات، ئەو ڕەفتارانە ڕێکدەخات، هەرچەند تاك لە زۆر حاڵەتدا ناتوانێت زاڵبێت، بەسەر سۆزە بەهێزەکاندا.

بەراستی جیاوازی نەریتی شارستانی لەکۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە، بۆتە هۆی جیاوازی سۆزەکانو چۆنێتی دەربڕنییان، بۆ نموونە/ لە کۆمەڵگەی ئەوروپیدا خەڵکی وا ڕاهاتووە کەبەسەر بەستی سۆزەکانی دەربڕێن، بەڵام لەڕۆژهەڵاتدا سنورردادەنرێت بۆ ئەو دەربڕینە، چونکە هەستو سۆزەکە بەگوێرەی ئەو کۆمەڵگەیە دەردەبڕرێت.

بۆ نموونە/ لە ڕۆژهەڵاتی(غینیا) نەسەبی منداڵ دەگەڕێتەوە بۆ دایکی، میراتگریش کوڕ نییە، بەڵکو خوشکەزایە، واتا: دابونەریت سۆزی باوکێتی لە کوڕەوە، دەگوێزێتەوە بۆ خوشکەزا.

دەروونزانی کۆمەڵایەتی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کۆمەڵگە هەستی دەروونیو چۆنێتی دەربڕینی دیاریدەکات، ئەو ئازارەی کە مردن لە کۆمەڵگەی ئێمەدا دروستیدەکات، لەبەرئەوەیە کە ئەو مردووە، خۆی لە خۆی دەڕواتو کەس جێگەی ناگرێتەوە، زەرەرێکەو پڕنابێتەوە، واتا: کۆمەڵگە دەورەکان بەسەر خەڵکیدا وەکو شانۆ دابەشدەکات، کەس ناتوانێت دەوری کەس ببینێت.

لەبەر ئەوە کۆمەڵگە ماتەمینی خۆی بەمردنی ئەو کەسەدەردەبڕێت، هەروەکو چۆن ئەندامانی خێزانەکەی ماتەمینی خۆیان دەردەبڕنو پرسەی بۆ دەگرن، کەسانی خزمو ئاسیاو سەرخۆشییان لێدەکەن. بەڵام کۆمەڵگە سەرەتاییەکان، ئەو رۆڵەی مردووەکە بینیویێتی، یەکە یەکە دەیدات بەسەر کەسانێکی دیکەدا، وەکو مامو‌خاڵ، چونکە کە باوکەکە مرد یەکێك لەبراکانی ژنەکەی مارەدەکات(نەسەب)ی کوڕەکە بەو شێوەیە لە باوکەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مامی یەکەم، دوای ئەو بۆ دووەم، بۆسییەم، لەبەرئەوە کوڕەکە بەمردنی باوکی ماتەمین نابێت، چونکە جێگەی چۆڵ نابێتو یەکێکی دیکە جێگەی دەگرێتەوە.

ئا ئەمەو جۆری ئەمانە، دەبێتە هۆی جیاوازی کۆمەڵگاکان لە دەربڕینی ماتەمینیدا، هێندێکیان لە ماوەی ماتەمیندا بەرۆژو دەبن، هێندێك هەن، ئەندامێکی لەشیان دەبڕن، بەڵکو لە زۆر کۆمەڵگای کۆنو سەرەتاییدا، زیندویان لەگەڵ مردووەکەدا شتووە لەگەڵ ئەویشدا ناشتویانە، ماتەمینی لە لای هێندێکی دیکە چەند کاتژمێرێك دەخایەنێت، دوای ئەوە هەر کەس دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆی، کاری ئاسایی خۆی دەباتبەڕێوە.

لەبەر ئەوە هەرگیز دروستنییە، کە راڤەی ماتەمینی بکەین بەوەی کە لە ئـــەنجامی پاڵنـــەرێکی سروشـــتیدا رودەدات، بـــەڵکو لەئـــەنجامی کەڵەکەکردنو بنچینەی کۆمەڵایەتیو شارستانیدا بەرپادەبێت.

لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەرچەند لایەنێکی شەریکی هەیە لە رەفتاری مرۆڤدا، کە بە پێکهاتەی فیسیۆلۆجی توێکاریی، بۆ کەسانی لەیەکچوو دیاریدەکرێت، بەلام شارستانیش لەلایەن خۆیەوە، ئەویش کاردانەوەی تێدا هەیە، وای لێدەکات کە لە کۆمەڵگەیەکەوە، بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە جیاوازبێت.

## پەیکردنو بیرهێنانەوە

دەروونزانی کۆمەلایەتی، دەستیکردووە بە باسی ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە دەروونزانی گشتیەوە هەیە، وەکو/پەیکردن، بیرهێنانەوە، ئەو هەستکردنەی بە رواڵەتێکی تاکی دانانرێت، بەڵکو ملکەچی کاردانەوەی هێندێك هۆکاری کۆمەڵایەتیو شارستانیدا دەبێت، بۆ نموونە/ هێندیك هۆز لە ئەفریقای رەشدا هەن، ئەندامەکانیان جیاوازی لە نێوان رەنگەکراوەکاندا، وەکو/سور، پرتەقاڵی، زەرددا، ناکەن، هێندە هۆزێکی دیکە هەن جیاوازی لە نێوان سەوزو قاوەییو، رەشدا ناکەن.

(مالینۆتسکی-Malinowisky)[1] تێبینیکردووە کە (توبیریاند- Toberianbs) یەکان، منداڵ ناشوبهێنن بە دایکیۆە، یان بە خوشکیۆە، یان بە برایەوە، بەڵکو تەنها دەیشوبهێنن بە باوکیۆە، تەنها

[1] مالینوتسکی (١٨٨٤ – ١٩٤٢)، زانایەکی پۆڵەندییە، گەورەترین پسپۆڕ بووە لە زانستی ئەنثر ۆپۆلۆجیا، ساڵی ١٩١٤ توانی حکومەتی ئوستراليا قایلبکات، کە یارمەتیبدات لە لێکۆڵینەوەی دانیشتوانی دورگەی تۆبریاندا، دوایی روویکردە لەندەن، بووە مامۆستا لە زانکۆی لەندەن. - و -

کاتێك نەبێت، کە مەبەستیان سوك کردنی بێت، ئەوکاتە دەیشوبهێنن بە دایکێوە، یان بە یەکێك لە خاڵوانێوە.

(کروشت، کرنیش فیلم-Krushet Krutch Feelm) باوەڕی وایە کە دوو کۆمەڵە هۆکار هەن هەست دروستدەکەن، یەکەمیان، هۆکاری کۆتاییە لە کۆئەندامی دەماردا جێگیرە، ئەوەی دیکەیانی فرمانییە، بەهۆی پێویستی، میزاج، بیرهێنەرەودی کەسێتی دەردەکەوێت.

هەروەها(لیڤین،شیف، میرفی-Lewin, Chafe,Murphy) هەستاوون کۆمەڵێك لە وێنەی نائاشکرایان، بە رەنگاورەنگی رەشو سپیو، بە رەنگی دیکە، نیشان کۆمەڵێك لە خوێندکاری برسی داوە، دوای ئەوە نیشانی کۆمەڵێك خوێندکار کە لە نانخواردن بوونەتەوە داوە، بۆیان دەرکەوتووە، کۆمەڵەی یەکەم جۆرە شتێکیان لە وێنەکاندا بەدیکردووە کە بخورێت، وەکو/ سەندەویچ، زەلاتە، شەربەت،بەلام کۆمەڵەی دووەم شتی جیاوازی دیکەیان تێدا بەدی کردووە...هتد

پێوانە بەڵەمەرەکەبەکەی رورشاخیش هەمان شێوەو ئەنجامی هەیەو چونکە کەسەتاقیکراوەکە جۆری کەسێتی خۆی لەدوتوێی ئەو تاقیکردنەوەدا دەردەخات، هەروەکو چۆن نەریتی شارستانێتیو کۆمەڵگەکەی دەردەخات

هەروەها(زیللیك-Zellig ) بۆئەوەی رادەی کاری رووکاری مرۆڤ بزانێت لەسەر پەیکردن(الادراك)، هەستا تاقکردنەوەیەکی شیکارەکانی راهێنانی بەبەرچاوی خوێندکارانی دیکەی هەموو پۆلەکەوە ئەنجامدا، لە سەر دوو کۆمەڵە خوێندکار لە یەك پۆلی خوێندندا، بە جۆرێك کۆمەڵەیەکیان خۆشەویستنەبون، و کۆمەڵەی دووەمیان خۆشەویستبوون، کۆمەڵەی یەکەمیانی فێرکرد کە بە هەڵەنەکردن دەست

پێبکەن، هەروەکو چۆن کۆمەڵەی دوومیانی فێرکرد کەبەهەڵەکردن دەست پێبکەن.

کە کاتێك هەردو کۆمەڵەکە لە شیتەڵکردنی راهێنانەکان بوونەوە، ئەوساکە لە خویندکارەکانی دیکەی پۆلەکەیان پرسی، واتا/ئەوانەی کە لەهیچ کۆمەڵەیەکدا نەبوون، تەنها تەماشاکەربوون، لەوەڵامی پرسیارەکەدا وتیان کۆمەڵەی یەکەم هەڵەی زۆریان کردووە، و کۆمەڵەی دووەم هەڵەیان نەکردووە، واتا/ هەڵەکانی کۆمەڵەی دووەمیان پۆشیبوو.

لەمەوە بۆیدەرکەوت کە روکارو بڕیاری پێشوتر کاردانەوەی هەیە لەسەر پەیکردنی تاك، هەروەکو چۆن:- بڕیاری نزم (Strcotypes) کاری خۆی دەکات.

زانایەك بەناوی(رازران-Razran ) وێنەی(٣٠) کچی نیشان بەکۆمەڵێك لەخوێندکاردا، داوای لێکردن، بەگوێرەی جوانی، ریرەکی، میزاج، حەز بەسەرکەوتن، لە پێنچ پلەدا ریزیانکەن...هتد.

دوای تێپەڕبوونی دوومانگ، بۆ جاری دووەم نیشانی دانەوە، بەڵام ناوی هەر یەك لە کچەکانی گۆڕی بە ناوێکی ئیتالی، یان جولەکەی یان ئیرلەندی، یان ئەمریکی، بۆی دەرکەوت ئەو وێنانەی ناوی جولەکەو ئیتالییان پێوەیە لەپلەی چوارەمو پێنچەمدا دانراون.

بۆیدەرکەوت، کە هەستکردنی مرۆڤ کاردانەوەی هەیە لەسەر تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵی ئەندامدار، هەروەها حاڵ وایە بەلایەن هەستکردنی کاتەوە، لەلایەکەوە تێبینی ئەوە دەکەین، کەکرداری خواردن، نوستن، بێداربوونەوە، لەکاتی دیاریکراودا، بە رێکی ئەنجامدراوون، لەگەڵ ئەوەشدا لەلایەکی دیکەوە، ملکەچیشە بۆ کاردانەوەی هۆکارە کۆمەڵایەتیو شارستانییەکان، لەکۆمەڵێکەوە بۆ

کۆمەڵێکی دیکە، لەشارستانییەکەوە بۆ شارستانیەکی دیکە دەگۆڕێن، واتا: ئێمە ناتوانین کەبڵێین: واتای کات، تەنها بۆ هۆکارە تەندارەکان ملکەچە، بەڵکو هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانیش کاریتێدەکەن.
هۆکارەکانی کاتی، پلەیەکی زۆر گرنگی هەیە لەکۆمەڵگە پەرە پێدراوەکاندا، تاك و کۆمەڵ بەهۆی هۆکارەکانیانەوە زۆربەووردی، دیاریدەکەن، بەلام کات ئەو گرنگییەی پێنادرێت لای کۆمەڵە کانی دیکە، وەکو/هێندییەکانی سۆلتۆ، ئەوانەکە جیاوازییەکانی کات نازانن، بەڵکو بەهۆی روداوی سروشتی تایبەتەوە، وەکو/شەختە توانەوە، یان دەرکەوتنی مەلە کۆچکەرەکانەوە، کات دیاریدەکەن، هەروەکو چۆن لە کالیفورنیا، تەمەنی خۆیان نازانن، لە(مدغشقر) کات دیاریدەکەن بە کوڵی چێشتێکی برنج، کە نیوکاتژمێردەخایەنێت، هەروەها پەیکردنی کات بەتاقیکردنەوەی کەسی، کۆمەڵیلە تەنها کۆمەڵگەیەکیشدا، دەگۆڕێت، واتالە تاکێکەوە، بۆ تاکێکی دیکە بەگوێرەی سستەمی چینایەتی دەگۆڕێت.
مەبەست لەدیاریکردنی کات، رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتییە، لەبەر ئەوە سورتکن(Sorokin) و میرتون(Merton)، زاراوەی (کاتی کۆمەڵایەتی) بەکاردەهێنن، بۆ ئەوەی جیاوازییەکەی لەکۆمەڵگەیەکەوە، بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە بزانن.

## بیرهێنەرەوە

بیرهێنەرەوە ئەوەندە بە هێزەوە خۆشیخواردووە بە پەیکردنەوە، بە شێوەیەکی ئەوتۆ تێکەلاویبووە، زۆر بە زەحمەت هۆکاری گۆڕینی هەواڵ، لەکاتی گواستنەوەیدا لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەدۆزرێتەوە، ئایە بەهۆی لاوازی بیرهێنەرەوەیە؟ یان هۆکەی

لەبیرچونەوەیە؟ یان هۆکەی شێوەی پەیکردن و وێنەدارکردنە بە خەیاڵ، یان بیناییکردنە؟

دەروونزانەکان باوەڕیان وایە کە کرداری فێربوون، پشت بەبیرهێنەرەوە دەبەستێت، ئەویش بەیوەستە بەکۆ ئەندامی دەمارەوە، بەلام ئەوتاقیکردنەوانەی کە ئەثنۆلوجیەکان و دەروون زانە کۆمەلایەتییەکان ئەنجامیانداوە، ئەوەیان سەلماندووە، کەبیر هێنەرەوە کۆمەڵە هۆکارێکی کۆمەلایەتی کاری تێدەکەن.

جارێکیان (زیللیك-Zellig)، پڕ لیستیك لەو سیفاتو نیشانانەی کە لە جۆرەها سەردەمدا، لە باشو لە خراپ کە بەسەر ژناندا هەڵدراوە، کۆکردەوە، دوای ئەوە نیشانی کۆمەڵێك لە پیاوانو ژناندا، دوای هەفتەیەك داوای لێکردن کە بە بیر خۆیانیان بهێننەوە، بۆیدەرکەوت، ژنەکان تەنها سیفاتە باشەکانیان لەبیرە، بەلام پیاوەکانیان سیفەتە خراپەکانیان دەهاتەوە بیر.

بەمە بۆیدەرکەوت کە مرۆڤ هەمیشە ئەوزانیارییانەی دێتەوەبیر کە لە بەرژەوەندییەتیو بە بۆچونی خۆی دەریدەبڕێت، بەلام ئەو زانیارییانەی کە دژی بۆچونی خۆی بێت، هەمیشە نیزیکە بۆ لەبیرچونەوە.

بێجگە لە هۆکارە کۆمەلایەتییەکان، روکارە دەروونیەکانیش، کاردەکەنەسەر بیرهێنەرەوە زانایەك بەناوی(مارکولی) پەیژەیەکی بۆ پێوانەکردنی رادەی کاری بڕیاری پێشتر لەروکاری مرۆڤە سپیەکاندا بەرەوڕوی رەش پێستەکان دروستکرد، دوای ئەوە دوو کۆمەڵە رستەی بۆ سپیپێستەکان خوێندەوە، کۆمەڵەی یەکەم باسی چاکەی ئەوانی دەکرد، کۆمەڵەی دووەم باسی خراپەی ئەوانی دەکرد، دوای تێپەڕبونی هەفتەیەك داوای لێکردن کە رستەکان بهێننەوە بیری خۆیان، بۆیدەرکەوت ئەو سپی پێستانەی کە رەگەزپەرستن، تەنها ئەو

رستانەیان لەبیرماوە کە باسی خراپەکانی رەش پێستەکان دەکەن، بەڵام ئەوانەی کە شۆڤێنیو رەگەزپەرستنین ئەو رستانەیان لەبیربوو کە باسی چاکەکانی رەش پێستەکانیان دەکرد. لەراستیدا ئەمە لەگەڵ رای (فرۆید)دا رێدەکەوێت، ئەو رایەی کەدەڵێت/پەستان و خەفەکردنی زۆر دەبێتە هۆی لەبیرچونەوە، واتا/مرۆڤ ئەو زانیارییانەی لەبیر دەچێتەوە کەحەزیان لێناکات، لەبەر ئەوە لەچەقی نەستیا دەیانشارێتەوە ئەمەش بۆئەوەی هەست بە سەرنەکەوتنو ئازارنەکات، بەپێچەوانەی ئەوەوە، ئەو زانیارییانەی دێتەوە یاد کەدڵ خۆشی دەکەن وکەیفی پێیان دێتەوە.

هەروەها(ولیام سنون)و(پارتێلیم) هەردوکیان سەلماندویانە کە بابەتی بیرهێنەرەوە، بە هۆکارەکانی دەروونیشو کۆمەڵایەتیش لەیەك کاتدا دیاریدەکرێت، لە تاقیکردنەوەیەکدا، کە بریتیبو لەوەی، داوایانکرد لە کەسێك چیرۆکێکی ئەفسانەوی بە دوو رێگە بۆ کەسێکی دیکە بگێڕێتەوە، رێگەی یەکەمیان ئەوەیە کە دوای نیو کاتژمێر لە بیستنی ئەمیش بیگێڕێتەوە، رێگەی دوومیشیان ئەوەیە دوای هەفتەیەك بۆ کەسێکی دیکەی بگێڕێتەوە، ئەمیش بۆ کەسی سێیەمی بگێڕێتەوە هەروەها.

لەئەنجامدا دەرکەوت کە چەندێك ماوەی گێڕانەوەکە درێژبێت، ئەوەندە گۆڕان لە روداوەکانو ناوی کەسەکاندا، رودەدات، هەروەها دەرکەوت جار لەدوای جار چیرۆکە ئەفسانەوییەکە، کورت تردەبێتەوەو واقعیتر دەبێت، ئەم ئەنجامانە ئەوە دەگەیەنن، کە ووتووێژکردنی خەڵکی لەگەڵ یەکتریدا، ملکەچدەبێت، بۆ کاردانەوەی کۆمەڵایەتیو دەروونی.

## کاردانەوەی شارستانییەت، لەسەر بیرهێنەرەوە:

زانایەك بەناوی (بارتلێت)، تێبینیکرد مرۆڤ ئەو شتانەی لەبیرناچێتەوە کەچاوی پێیاندەکەوێت، لە شارستانییەکانی دیکەدا، کە نرخو واتای تایبەتی هەیە لە شارستانیەکەی خۆیدا، بۆ نموونە/ سەرۆك هۆزی (سوازین)ی ئەفەریقای باشور کاتێك لەو دیدەنییە گەڕایەوە کە لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئەندامەکانی هۆزەکەیدا ئەنجامیدابوو بۆ ئینگلستان، وێنەی ئەو پۆلیسە هاتوچۆیەی کە لەکاتی رێکخستنی هاتوچۆدا دەستیبەرزکردبۆوە، هەرگیز لە یادی دەرنەدەچوو هەر بیریلێدەکردەوە، چونکە شێوەی دەست بڵندکردنەوەکەی، لە شێوەی سڵاوکردنی وڵاتی خۆیانی دەکرد.

دەروونزانەکانی کۆمەڵناسی (بیرهێنەرەوەی کۆمەڵی) بەوە دەڵێن: کە خێزانێك، یان نیشتمانێك یان ئایینێك..هتد، بەشداریتێدابکات.

(هالفاکس Halwachs) رای وایە کە سێ یاسا هەن، ئەو جۆرە بیرهێنەرەوەیە رێکدەخەنو پارێزگاری لەسەر دەکەن، ئەوانەش ئەمانەن:

**١-یاسای کۆمەڵبوون** : واتا کۆبوونەوەی ئەو روداوانەی کە پەیوەندییەکی دیاریکراویان هەیە، لە یەك شوێندا، با تاڕادەیەکی کەمیش لەیەك دووربن، چونکە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ئەم جۆرە لەبیرهاتنەوانە، هەروەکو چۆن ئەمە هەیە لە شوێنە پیرۆزەکاندا.

**٢-یاسای پەرتبوون:** ئەمە بە پێچەوانەی یەکەمەوەیە، واتا پەرتبوون یان بەشبەشکردنی ئەوەی کە تایبەتە بە کۆمەڵێکەوە بۆ چەند رەگەزێك، هەر یەکەو شوێنێکی تایبەتی هەبێت، بۆئەوەی پەیوەستبێت بە بیرهێنەرەوەی تاکەکانەوە لە شوێنو حاڵەتی جیاوازدا.

**٣-یاسای دووقۆڵی:** واتا/ شتەکە دوو شوێنی جیاوازی هەیە، لەبەرئەوەی بیرکەوتوەکە تایبەتە بە چەند کۆمەڵێکی لەیەك جیاواز، هەریەکەو دابو

نەریتی ئایینیو شارستانی جیاوازیان هەیە، هەروەها ئەوکاتە کەسەکە چاوی دەکەوێتە شتەکە بە شێوەیەکی رەها پەسەندیناکات، بە گوێرەی شارەزاییو تاقیکردنەوەی تایبەتی خۆیو ئەو کۆمەڵەی کە ئەم ئەندامە تێیدا دێتە یادی.

زیرەکی: دەروونزانەکان زیرەکی بە توانستێکی گشتی دادەنێن کە لە رێگەی فێربوونەوە وەردەگیرێت، بەگوێرەی رای ئەوان بەهرەیەکی سروشتییە، بەڵام بەهۆی هۆکارە کۆمەڵایەتیەکانەوە دیاریدەکرێت، بە راستی کارلەیەککردنی کۆمەڵایەتی، تارادەیەکی گەورە پشت بەزیرەکی مرۆڤایەتی دەبەستێت.

زیرەکی تەنها بۆ هۆکارە سروشتییەکان ملکەچ ناکات، بەڵکو بەهۆکارە کۆمەڵایەتیەکانیش کارمەند دەبێت.

زیرەکی فەرمانێکی تایبەتی نییە، بەڵکو نیشانەیەکە، یان با بڵێین / سیفەتێکە خەڵکی پێنیشانەدار دەکرێت، لەکاتێکدا کەدەڵێت/ فلانەکەس زیرەکە، مەبەستمان ئەوەیە لەبارەی کۆمەڵایەتییەوە بەهرەیەکی پەسندی هەیە، ئەمەیشە وامان لێدەکات، رەفتارەکەی بەزیرەکی نیشانەدار بکەین.

واتای زیرەکی لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە دەگۆڕێت، ئەم گۆڕانە بۆتە هۆی ئەوەی کە پێناسەکەشی بگۆڕێت، (ستێرن-Stern ) پێناسەی بەوە دەکات، کە توانستە لەسەر گونجاندن، لە هەڵوێستە جیاجیاکاندا.

تیرمان(Terman) پێناسەی دەکات، کەتوانستە لەسەر بیرکردنەوەی رووت، واتا ئەوبیرکردنەوەی کەتەنها پشت بەهێماکانی زمانو واتاکانی شت دەبەستێت.

کلفن پێناسەیدەکات کە توانستە لەسەر فێربوون، بەڵام، سوراندایك (Thorndike)، رای وایە کە شتێك نییە پێیبووترێت زیرەکی گشتی، بەڵکو کۆمەڵێك توانستی تایبەتی سەربەخۆی لەیەکجیا هەن، زیرەکیش بریتییە لە مامناوەندی ژمارەیی(المتوسط الحسابي)بۆ ئەم توانستانە لای تاك، لەگەڵ ئەوەشدا سوراندایك، جیاوازی لە نێوان سێ جۆرە زیرەکیدا کردووە، لەسەر ئەو بنچینەیەی کە لەسروشتی گیروگرفتدا، یان لە هەڵوێستدا، یان لەو بابەتەی کە دەیگرنەوە لەیەك دەچن:

١-**زیرەکی سەرزاری:** کە لەچەند توانستێك پێکهاتووە، کە مرۆڤ لە چارەسەرکردنی واتا و هێماکانیو وشەو ژمارەدا، بەکاریدەهێنێت.

٢-**زیرەکی زانستی:** ئەویش لە چەند توانستێك پێکهاتووە، کە مرۆڤ چارەسەری شتو هەڵوێستە هەستکراوە ئاشکراکانی پێچارەسەردەکات.

٣-**زیرەکی کۆمەڵایەتی:** لەو توانستانە پێکهاتووە، کە کاردانەوەکانییان لە کردەوەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، دەردەکەوێت.

وای بۆدەچێت کە ئەم سێ جۆرە زیرەکییە لە یەکتری جیاوازنو تاڕادەیەکی زۆر سەربەخۆن، ئەوەی کە زیرەکی کۆمەڵایەتی باڵای هەبێت، لەوانەیە لە خوار مام ناوەندییەوە بێت لە زیرەکی سەرزارییو لە زیرەکی زانستیدا.

# فەرهەنگۆك

| وشە | واتاکەی | وشە | واتاکەی |
|---|---|---|---|
| پیتی «- ا -» | | | |
| ئاپوورە | الحشود | ئارەزووکاری | الهوس |
| ئابوریزانەکان | علماء الاقتصاد | دەیڕەنگێنێت | یصبغها |
| ئاشنا (مەعمیل) | (العمیل الذي یعالج نفسیا | ئەرێ | (بلی) للإثبات بعکس (نەرێ) للنفي |
| ئاڕاستەکار | الموجه | ئارەزووشکێن | الزاهد |
| ئامێر | الوسیلة | ئامراز | الاداة |
| ئافەرین | کلمة استحسان، تستعمل عادة للأصغر من الشخص المتکلم. | | |
| پیتی «- ب -» | | | |
| بینابوون | الاستبصار | بیرۆکە تەرزدارەکان | الافکار المنمطة |
| بەهرە | الموهبة، إلهام | بەخێوگە | الحقل |
| بوار | المجال، المعبر المائي في الأنهار | بیریار | صاحب الفکر، الفکرة |
| بەگوێدادان | إیعاز | بەرامبەرین | المقابلة |
| بەرزبۆوە، بەرزدەبێتەوە | سما، یسمو | بیرهێنانەوە | التذکر |
| بەراوردکاریی | إستبار، المقارنة | بەیەکداهەڵکاڵین، هەڵشاخان | المناوشة |
| بەڵگەنامە | الوثائق | بیرهێنەرەوەی کۆمەڵی | الذاکرة الجمعیة |

| | | | |
|---|---|---|---|
| بەس | يكفي | بیرکۆ | الذاكرة الجمعية |
| بنکە | القاعدة | بەربەری، دەشتەکی، گوندەکی | أهل الريف |
| بنچینە | القاعة، الاساس | بارودۆخ | الوضع |
| بینگە | العيادة | بەرنامەی لێکۆڵینەوە | منهج البحث |
| باو | العرف | بریارە پێشکاتدراوەکان | الاحكام المسبقة |
| بزوتنەوەی کۆمەڵزانی | علم دينامية الجماعة | بێزاندن | الازدراء |
| بیرکردنەوەی تەرزی ئاسایی | التفكير النمطي الاعتيادي | بەرنامەی تاقیکاریی | المنهج التجريبي |
| بڵندبۆوە، بڵندەبێتەوە | ارتفع، يرتفع | بیرۆکەی جڵەوگرەوە | الفكر الضابط |
| «پیتی - پ -» | | | |
| پێکەوەلکانی لۆجیکی | التلاحم المنطقي | پێویستی هەنوکەیی | الحاجات القائمة |
| پلە دووبارەبووەکان | المدرج التكراري | پابەندبوون | الالتزام |
| پەیرەوی لێکۆڵینەوە | منهج البحث | پێوانەکانی چەندی | المقاييس الكمية |
| پشك، خۆوبەخت | القرعة | پەیرەوی تاقیکاری | المنهج التجريبي |
| پەیپێبردن | الإدراك | پاگندە | الدعاية |
| پەیبردن | الإدراك | پروپاگندە | الدعاية |
| پلەبەندی، پلەدارکردن | تدرج | پێشەوا | القائد |
| پاشینە، پاشخان | الخلفية | پەیوەندی دەستکرد | العلاقات الافتعالية |
| پۆلاندنی دیاریکراو | تصنيف محدود | پێشەوایەتی بەرەڵا | القيادة الفوضوية |

| | | | |
|---|---|---|---|
| پۆلاندنی سنوردار | تصنيف محدود | پەیوەست | الارتباط |
| پێوانە کۆمەڵایەتییەکان | المقاييس الاجتماعية | پێوانەکانی کۆمەڵایەتی | المعايير الاجتماعية |
| پێوانەی روکارەکان | قياس الاتجاهات | پوخت | النقي |
| پەڕ | طرف | پێکهاتە | مركب |
| پەلکاری دوبارە | الضلع التكراري | پاڵنەر | الدافع |
| پاساو | تبرير | پاڵنەری سروشتی، پێکەر | الغريزة |
| پشکنراو | مفحوص | پاکیزە | العفة |
| **پیتی ﴿- ج -﴾** | | | |
| جوتە بەراورد | المقارنة الازدواجية | جۆکەرەوە | مميّز |
| جەماوەر (بەشێوەیەکی بەردەوام کۆدەبنەوە) | الجمهور | جەختکردنەوە | التأكيد |
| جۆشخوارد | الالتحام | جۆر | نوع |
| جودایی | امتياز | جڵەوگرەوە | الضابطة |
| **پیتی ﴿- چ -﴾** | | | |
| چاکسازی | راديكالي | چاولێکەری | تقليد |
| چاوپێکەوتن | المقابلة | چێوە پێشینەیی | الإطار المرجعي |
| چەپەوانە | الأعسر | چۆنێتی | كيفية |
| **پیتی ﴿- د -﴾** | | | |
| درمی لەیەکچون | العدوى التماثل | دزێو | بشع |
| دۆزەر، یان دۆزیار | مكتشف | داجمان | الاندفاع نحو الأسفل |

| | | | |
|---|---|---|---|
| درمي فيكرى | العدوى الفكرية | دامركاندن | القمع |
| دەرفەت | الفرصة | دەمارگرى گشتى | متعصب إزاء أكثر من جماعة كالزنوج واليهود |
| دووپاتكردنەوە | تأييد | دەمارگرى جۆرى | متعصب إزاء أكثر من جماعة واحدة كالزنوج |
| ديارگە | رصد | دەروونزانى كۆمەڵ | علم النفس المجموع |
| دەمارگيرى رەگەزى | التعصب العنصري | دەروونە پێكهاتەكان | المكونات النفسية |
| دژوار، دژاودژ | متضارب، متناقض | دروستبووەكانى دەروونى | المكونات النفسية |
| دەمارە روكار | الاتجاه العصبي | دابەشكردنى نموونەيى | التوزيع النموذجي |
| دژ، دژڕۆ | معارض | ديمەن، شێوە | الشكل |
| داماو، زەبون | البائس | دەروونزانى كۆمەڵايەتى | علم النفس الاجتماعي |
| داكشا بۆ لاى | انجذب إليه | دەروونزانى پەتى | علم النفس الصرف |
| دێبەرى، كێڵگەيى | الحقلي | دوتوێى | خلال |
| دەمڕاست | الصدوق | دەلەئاست | لحظة |
| دابەشكردنى سەرەكى | التوزيع الرئيسي | دەروونزانى گشتى | علم النفس العام |
| دابەشكردنى ناوەنجى | التوزيع الثانوي | دەروونزانى بۆشايى (ئاسمانەوانى) | علم النفس الفضاء |

| | | | |
|---|---|---|---|
| دابەشکردنی تاقیگەیی | التوزیع التجریبي | دەروونزانی وەرزشی | علم النفس الریاضیة |
| دەروونزانی تاکی | علم النفس الفردي | دەروونە گرێ | العقد النفسیة |
| «پیتی - هـ -» | | | |
| هزر | حدس | هەڵوێستی پشکنین (بەدواداگەڕان) | الموقف التحقیقي |
| هەڵفریواندن | الإغراء | هەڵەشە | عشوائي |
| هاوڕەگەزی | تجانس | هێزی بگر، یان راگر | قوة ضابطة |
| هەڵبژاردنی تێکهەڵکیش | الاختیار المزدوج | هێڵی سەرەولێژ | الخط المنحني |
| هەڵچوون | انفعال | هێڵی بەرەولێژ | الخط المنحني |
| هەواڵداری | الأخباري (الأسئلة التي ترسل بالبرید) | هێنانەپێش چاو | تصور |
| هەڵوێستی بڕیار | الموقف الحازم | هۆگرکردنی کۆمەڵایەتی | تأنیس الاجتماعي، أو تطبیع الاجتماعي |
| هەڵوێستی کۆمەک | الموقف الإسنادي | هاندەری ناوەکی | باعث |
| هەڵوێستی نرخاندن | الموقف التثمیني | هاوئەنجامبون | مطابقة |
| «پیتی - و -» | | | |
| وێناکردن | تصور | وریاکەرەوە | المنبه |
| ورووژێنەر | مثیر | وابەستە | مقید |
| ورووژێنەری ناوەکی | الباعث | وشکە روکار | الاتجاه الجامد |
| وەتیرە | نسق | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| **پیتی - ی -** | | | |
| یاسای پەرتبون | قانون التجزئة | یەکدەلەئاست | لحظة واحدة |
| یاسای دووقۆڵی | قانون الثنائي | یەکە | وحدة |
| یەك | واحدة، | | |
| **پیتی - ك -** | | | |
| کولتـــــور دیاریکـــەرکانی کەسێتی مرۆ | المحـــــددات الثقافيـــــة للشخصـــــية الانسانية | گوزارشت | التعبير |
| کەلێن | الهوة | گرۆ | المجموع |
| کارا، کارکەر | العامل | گریمانی هۆکاری | فروض سببي |
| کارلەیەککردن | تفاعل | کەسێتی پەڕگر | الشخصـــــية المتطرفة |
| کەسی پشکنیار | المحقـــــق (الفاحص) | گێرەشێوێنی | الشغب |
| کەســـــی پشکێندراو | الشـــــخص المفحوص | کۆمەڵگــــــەی نیشتەجێی زۆرەملێ | المجمعـــــات السكنية القسرية |
| کەمایەتییـــــە رەگەزییەکان | الاقليـــــات العنصرية | کۆمەڵە کەسێك | فئة من الناس |
| گشـــت (جـــار نـــــەجارێك کۆدەبێتەوە) | العموم | گەلاڵە | المجمل |
| کۆمەڵگـــــە هاورەگەزەکان | المجتمعـــــات المتجانسة | گوژمبەر | مندفع |
| کۆمەڵگـــــە فرەرەگەزەکان | المجتمعات الغير متجانسة | کۆمەڵگـــــە گونجاوەکان | المجتمعـــــات المتجانسة |

## ﴿ پیتی – ل – ﴾

| | | | |
|---|---|---|---|
| لکاندن | تلاحم | | |
| لەیەکچون | مشابە | لیکۆڵینـــــەوە ماڵەکراوەکان | الدراســـــات المسحية |
| لەوانەکاری یەکەم یان ئەگەری | الاحتمال الاول | لیکۆڵینـــــەوە روپێوکان | الدراســـــات المسحية |
| لابەلاکان | المنحرفون | لاساری | الشقاوة، الجنوح |
| لایەنگرەکان | المؤيدون | لاوەکی | العرضي |
| لۆجیکی لەبار | منطق منسق | لاسدان | إحتيال |
| لێکۆڵینـــــەوە پشکنەکان | الدراسات الكشفية | | |

## ﴿ پیتی – م – ﴾

| | | | |
|---|---|---|---|
| مشتومڕ | مناقشة، خلاف | میزاجـــــــە چونیەکەکان | الأمزجة المتشابهة |
| میتۆد | منهج | ماتەمینی | الحزن |
| متمانە | اعتبار، ثقة | مەودا (سەڵەف) | مرحلـة، المسـافة، المجال |
| مت | كامن | ململانێی بیروباوەڕ | النزاع العقائدي |
| مەزندە | افتراض | مسۆگەرکردن | الضمان |
| مۆدە | الموضة | مـــــــاڵینی کۆمەڵایەتی | المسح الاجتماعي |

## ﴿ پیتی – ن – ﴾

| | | | |
|---|---|---|---|
| نیشتەجێ | السكن | رۆڵەی نۆبەرە | الابن البكر |
| نامۆیی | الغربة | ناوابەستە | غير مقصود |
| نادیاری | الغموض | ناکۆك | مختلف |
| نیشـــــانە کەسییەکان | السمات الشخصية | نەشیاوی | عدم الكفاءة، عدم اللياقة |

| | | | |
|---|---|---|---|
| نموونه | العينة | نموونەی هاوڕێکاری | العينة المصاحبة |
| نموونەی لەوانەکاری | العينة الاحتمالية | نموونەی لەوانەکاری هەڵەشەیی فرەقۆناغ | العينة الاحتمالية العشوائية متعددة المراحل |
| نموونەی لەوانەکاری هەڵەشە چینایەتی | العينة الاحتمالية العشوائية الطبقية | نموونەی ڕوبەری، یان ئەستێڵی | العينة المساحية أو الحوضية |
| «پیتی - س -» | | | |
| سەرتۆپ | ممتاز | سەربەستیخوازەکان | الأحرار |
| سۆز | العاطفة | ئازادیخوازەکان | الأحرار |
| سیستمە کۆمەڵایەتییەکان | الأنظمة الاجتماعية | ساختەچێتی، گزیکاری | تزوير |
| سوربوون | الحرص | ساختەکردنی پاسەپۆرت | تزوير جواز السفر |
| سۆزساردی | البرود العاطفي، أو قصور عاطفي | سڕکارنۆشی | تعاطي المخدرات |
| سنوردیارکەرەکانی ڕۆشنبیریی کەسێتی مرۆڤ | المحددات الثقافية للشخصية الانسانية | سەرتاپاگیر | شامل |
| ستریۆتایپ | الفكر الاجتماعي | سەرزۆری، ژمارەزۆری | كثرة العدد |
| سنورگر (سنورگیر) | محافظ | سەرکردایەتی بەرەڵا | الرئاسة الفوضوية |
| پارێزگر | محافظ | | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ﴿ پیتی – ف – ﴾ | | | |
| فره رێیان | ملتقى الطرق | فێرکردنی تەوزیمی (فێرکردن بەزۆر) | التعليم الإلزامي |
| ﴿ پیتی – ق – ﴾ | | | |
| قسەڕۆ | صاحب الكلمة المسموعة | قاوداخستنی ئاواتخوازی | الإشاعة المتمنية |
| قاوداخستن | الإشاعة | قاوداخستنی دەهۆڵی ماتەمینەکان | إشاعة دقة الأسافين |
| قاوداخستنی زنوقبەر | الإشاعة المروعة | قۆزەرەوە | المستلم |
| ﴿ پیتی – ر – ﴾ | | | |
| رێگەی تێکهەڵکێش | الطريقة المزدوجة | روکاری تاکی | الاتجاه الفردي |
| رێگەی پشك | طريقة القرعة | رای گشتی | الرأي العام |
| رێگەی یەکەی نموونەیی | طريقة الوحدة النموذجية | رێگە تاقیکراوە پەیژەییەکان | طريقة السلالم المجربة |
| رەوش | الخصائص | رێگەی پێوانەی پاڵنەر | طريقة قياس الدوافع |
| رەفتار | سلوك | راوێژ | استشارة |
| رەووشت | أخلاق | ریشەکێش | الاجتثاث |
| رەمەك | الغريزة | روکارە رەگەزییەکان | الاتجاهات العنصرية |
| روبەڕوو | المواجهة | راستەوانە | الأيمن |
| رەوا | الحق | رەفتاری ئاپۆرەیی | السلوك الحشدي |
| روپۆش | القناع | روونبوونەوە (بلوردرێن) | تبلور |
| روکار | اتجاه | رێگەی مەلابەزێنی، | الطريقة الجدلية: وهي |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | یان ڕێگەی بەرامبەر بەزێنی | تقدير الشيء وايجاد ضده أو نقيضه، ثم خلق العلاقة او التآلف بينها، فالعقل يدرك الفكرة، ثم يستعرض قهرا ضدها، ثم يؤلف بينها |
| روکاری راستەکی | الاتجاه الإيجابي | روکاره پەیهەستییەکان | الاتجاهات الادراكية |
| روکاری چەپەکی | الاتجاه السلبي | روکاری کۆمەڵی | الاتجاه الجماعي |
| روکاره پەستییەکان | الاتجاهات العصبية | دەماره روکارەکان | الاتجاه العصبي |
| رەفتارگیریی | السلوك الجانح | رکێف، ئاوزەنگی | سيطرة |
| روتکردنەوە | سلب | ریشەکێش | القلع |
| ریزکردنی رێك | ترتيب مضبوط | رەفتار ناوێزه | السلوك الشاذ |
| رەگەزپەرست | عنصري (شوفيني) | را بێلایەنەکان | الآراء المحايدة |
| را زۆردژەکان | الآراء المعارضة جدا | را لایەنگرەکان | الآراء المؤيدة |
| ﴿ پیتی – ش – ﴾ | | | |
| شوێنکەوتن | المتابعة | شیتەڵکردنی ناوەرۆك (لە شیکردنەوەی تاڵ تاڵەوە هاتووە، شیکاریشی پێدەوترێت | تحليل المضمون |
| شیتەڵکردنی دەروونی | التحليل النفسي | شێواز (وەتیره) | نسق |
| گرانفرۆش | التلاعب بالأسعار | یاریکردن به نرخ | التلاعب بالأسعار |
| شۆڤێنی (رەگەزپەرست) | عنصري | شێوازه چاولێکەرییه | الاشكال الحضارية |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | شارستانییەکان | التقليدية |
| شەختە | جليد | شێوەی چەندی | الأسلوب الكمي |
| شێوەی چۆنی | الأسلوب الكيفي | | |
| ﴿پیتی – ت –﴾ | | | |
| توێژەر (پشکێنەر) | المحقق | تێڕامان | استبطان |
| تێوەچوون (واتا گونجاندن) | إندماج | تاقیکراوە | مجرب |
| تێبینی ڕەفتاری راستی | ملاحظة السلوك الواقعي | توانای ڕەخساو | الإمكانيات المتاحة |
| تەرز (هەموو ڕەفتارێکە کۆمەڵگە بیکاتە خوو) | نمط | تەرزی کەسێتی | نمط الشخصية |
| تینکار (کاریگەر) | المؤثر: وهو غير العامل | تەرزی کۆمەڵایەتی | النمط الاجتماعي |
| تەقس (وشەیەکی یۆنانییە) | الطقس | تاقیکراوە بەسەرابڕاوەکان | الاختبارات الاسقاطية |
| تۆقاندن | الإرهاب | تەرزی ئابوری | النمط الاقتصادي |
| ﴿پیتی – خ –﴾ | | | |
| خوێندنگەی ڕەفتاری نوێ | المدرسة السلوكية الجديدة | خۆوبەخت | القرعة |
| خەڵەتاندن | احتيال | خۆگۆڕین | انتحال الشخصية |
| خاو | الخامل | خەواندنی موگناتیسی | التنويم المغناطيسي |
| خۆپاڵدان | الانتماء | خەڕۆ | منهمك |
| خرۆشاندن | تهيج | | |

# گرنگترین سەرچاوەکان

١- الحفني، عبدالمنعم، موسوعة علم النفس والتحليل النفسي، ج ١، ٢، مكتبة مدبولي، دار العودة، بيروت ١٩٧٨.
٢- حسين طه، مع أحمد أمين وعبدالوهاب عزام ومحمد عوض، التوجيه الادبي، ط١، المطبعة الاميرية بولاق، القاهرة.
٣- شريف، عبدالستار طاهر (دكتور)، قاموس علم النفس، ط١، بغداد، ١٩٨٥.
٤- عبدالفتاح، عفيفي (دكتور)، مدخل الى علم الاجتماع، ط١ ، دار الطباعة المحمدية، درب الاتراك، الازهر، القاهرة.
٥- موكریانی، گیو، نۆبەرە، چ ١ ، زانکۆی صلاح الدين، ١٩٨٦.
٦- ميشيل دنكن، (بروفيسور) ، معجم علم الاجتماع، ترجمة الدكتور احسان محمد الحسن، من منشورات وزارة الثقافة والاعلام، العراق، ١٩٨٠.
٧- معلوف، لويس، المنجد، في اللغة والادب والعلوم، ط ١٩، المطبعة الكاتوليكية، بيروت ١٩٦٦.
٨- نظام الدين فاضل، ئەستێرەگەشە، فەرهەنگێکی کوردی-عەرەبییە، وەزارەتی راگەیاندنی عێراق ساڵی ١٩٧٧ بڵاویکردۆتەوە.
٩- گۆڤاری پەروەردەو زانستی، ژمارە ٧-١٩٧٤/٨، بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی کوردیی بڵاویکردۆتەوە.
١٠- کۆمەڵە سەرچاوەیەکی دیکە.